**پێشکەشە بە خوێندکارانی فەلسەفەی وڵاتەکەم**



## ناوەڕۆک

# بەشی یەکەم

## بنەڕەتەکانی بیری ئەفلاتون

ئەفلاتون یەکێکە لەو بیریارانەی پاش خۆی نەریتێکی فەلسەفی درێژخایەنی جێهێشتوە. ئەم نەریتە یار و نایاری بۆ خۆی دروستکردوە و ڕاڤەی جۆراوجۆریشی بۆ کراوە. بۆچوونە فەلسەفییەکانی نێو ئەم نەریتە، کە لە سەدەی چوارەمی پێش زاینییەوە سەریهەڵداوە تاکو ئەمڕۆ مشتومڕیان لەسەر دەکرێت. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە کاریگەرێتی ئەو بۆچوونانە بەسەر مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفییەوە هەیە، کە نکۆڵی لێناکرێت و نابێت ئاوەڕی لێنەدرێتەوە. پاش جەختکردن لەسەر درێژخایەنی و کاریگەرێتی ئەم نەریتە فەلسەفییە، دەمەوێت ئاوەڕێکی جیدی لە ئەفلاتون بدەمەوە و بۆچوونە فەلسەفییەکانی شیبکەمەوە و هەڵیان سەنگێنم. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش لە سەرەتای ئەم پرۆژەیەوە هەوڵدەدەم باسی ژیانی ئەفلاتون بکەم و ئاماژە بەو ڕووداوانە بدەم، کە دەبن بە زەمینە بۆ تێگەیشتنمان لە بنەڕەت و سەرچاوەی بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەم بیریارە.

لە ڕاستیدا، کەم سەبارەت ژیانی ئەفلاتون زانراوە. بە درێژایی هەشتا ساڵی تەمەنیشی چوار جار لە شاری ئەسینا چۆتە دەرەوە. زۆربەی ژیانی بە وانەگوتنەوە و نوسین لە (ئەکادیمیا) بەسەر بردووە. تەنانەت

ژن و منداڵیشی نەبووە. لە ڕووی بارودۆخی ڕامیارییەوە لە سەردەمێکی ئاڵۆز و پڕ لە ئاشوب ژیاوە. سێ ساڵ پێش لە دایکبوونی لە ساڵی (431 پ ز) دا شاری ئەسینا و سپارتا کەوتوونە نێو جەنگێکی خوێناوی و درێژخایەن و ئەم جەنگە 27 ساڵی خایاندوە و بە جەنگی (پیلۆپۆنیسیا) ناسراوە. شاری ئەسینا، کە مەزنترین شاری یۆنان و بنکەی شارستانییەت بووە، هەموو تەوانا و سامان و وزەیەکی لەم جەنگەدا بەکارهێناوە و بە ڕوخانی ئەسینا و داگیرکردنی ئەم شارە لەلایەن لەشکری سپارتاوە لە ساڵی (404 پ ز) دا کۆتایی هاتووە. لەم ساڵەدا ئەفلاتون تەمەنی 23 ساڵان بووە و تێکشکانی دەستەڵاتی ڕامیاری ئەسینا و هەژاری و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (تاعون) و ڕوخساری ناشرینی جەنگ و سەرشۆڕیی شارەکەی خۆی بینیوە. جەنگی پیلۆپۆنیسیا و تێکشکانی دەستەڵاتی مەزنی ئەسینا و چەند ڕووداوێکی ڕامیاری دیکە کاریان کردۆتە سەر بیرکردنەوەی ئەفلاتون و دەتوانین بڵێین، ئەمانە بوون بە هەوێنی بۆچوونە ڕامیارییەکانی دایەلۆگی کۆمار و هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی ئەفلاتون بەرانبەر ڕژێمەکانی ئەو سەردەمە. ئەفلاتون لە ساڵی (427 پ ز) لە خێزانێکی خاوەن دەستەڵات و پارەدار لە (ئەگینا)، یەکێک لە دوورگەکانی یۆنان لەدایک بووە. پاش لەدایک بوونی ئەفلاتون ئەم خێزانە بۆ شاری ئەسینا گەڕاوەتەوە و لەو شارە جێنشین بووە. باوکی ئەفلاتون (ئەریستۆن) بە بنەچە بۆ خێزانی



یەکێک لە پاشاکانی ئەسینا و دایکیشی، کە ناوی (پێرستیۆن) بووە، بۆ خێزانی سۆلۆن یاسادانەری گەورەی یۆنان دەگەڕێتەوە. ئەم خیزانە چوار منداڵیان هەبووە و ئەفلاتون منداڵی سێیەم بووە. دوو برا گەورەکەی ئەفلاتون، کە ناویان ئەدیمەنتۆس و گلاوکۆن بووە، پاڵەوانی دایەلۆگی (کۆمار)ی ئەفلاتونن و لەگەڵ سوکراتدا لەسەر کێشەی دادوەری دەکەونە گفتوگۆ. ئەفلاتون خوشکێکیشی بە ناوی (پۆتۆن)هەبووە. ئێمە زۆر لە بارەی خوشکەکەیەوە نازانین ئەوەندە نەبێت، کە کوڕەکەی پۆتۆن (سپیۆسیپۆس) زۆر لە ئەفلاتونی خاڵییەوە نزیک بووە، یەکێکیش بووە لەو خوێنکارانەی لە ئەکادیمیادا خوێندویەتی و پاش مردنی ئەفلاتونیش ئەکادیمیای بەڕێوەبردوە. ناوی ئەم بیریارە (ئەرستۆکلیس)ە و (ئەفلاتون) نازناوێتی، کە واتای کەسێکی چوارشانە و کەتە دەبەخشێت. ئەمەش پەیوەندی بە کەڵەگەتی و شان پانی ئەفلاتونەوە هەبووە. گوایە فێرکەری زۆرانبازییەکەی ئەم ناوەی لێناوە. تەنانەت کەڵەگەتی و هێزی لەش ئەفلاتونی هانداوە بۆماوەیەک زۆرانبازیش بکات.(1) بەڵام کەسایەتییکەی بەپێچەوانەی قەوارەی لەشییەوە بووە.

(1) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers,* with an English translation by R. D. Hicks, vol.1, London: William Heinemann, 1959. 3:2-4, p. 279

کەسێکی نەرم و لەسەرخۆ و دەنگ نزم بووە. ئەفلاتون تەمەنی دوو ساڵان دەبێت باوکی دەمرێت. دایکی شوو بە خاڵی خۆی، کە ناوی (پیریلەمپس)ە دەکات و لەم مێردەی کوڕێکی دەبێت.(2) خێزانی ئەفلاتون دەوڵەمەند و دەستەڵاتدار بووە. ئەمەش بە دوو جۆر کاریگەرێتی بەسەر ژیانی ئەفلاتونەوە هەبووە.

**یەکەم،** ئەفلاتون، وەکو منداڵی خێزانێکی دەوڵەمەند خراوەتە بەر بەرنامەی فێربوون و خوێندن. لە سەرەتاوە شیعر و ماتماتیکی خوێندووە و دواجاریش وەرزش و مەشقی سەربازی تەواو کردوە. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بە زۆر براوە بۆ سەربازی، بەڵام دڵنیانین لەوەی لە جەنگدا، بەتایبەتی جەنگی پیلۆپۆنیسیا بەشداری کردبێت.

**دووەم،** بە حوکمی دەستەڵاتی خێزانەکەی لە بارودۆخ و گەندەڵی ڕامیاری بەئاگا بووە و لە نزیکەوە بینیویەتی. لە دواییدا باسی ئەوەش دەکەین چۆن خێزانی ئەفلاتون بەشێک بووە لەو گەندەڵییە ڕامیارییە و ئەم بیریارەش هەڵوێستی خۆی بەرانبەری دیاریکردوە.

(2) بەگوێرەی نەریتی ئەو سەردەمە لە یۆنان خاڵ و خوشکەزا توانیویانە زەماوەند بکەن. شوکردنەوەی دایکی ئەفلاتون، کە لە کاتی مردنی باوکی ئەفلاتوندا تەمەنی سی و حەوت ساڵ دەبێت، زۆرتر لەبەر بەرژەوەندی ئابووری بوە. لەو کاتەدا ژن بەبێ پشتیوانیکردنی لەلایەن پیاوێکەوە (وەکو مێرد، کوڕ، باوک یان برا) نەیتوانیوە خاوەنی موڵک بێت و کارەکانی بەڕێوە بەرێت. برا گەورەکەی ئەفلاتونیش تەمەنی لە هەژدە ساڵ کەمتر بووە و نەیتوانیوە بە پێی یاسا پشتیوانی دایکی بکات.



ئەفلاتون لە منداڵییەوە شیعری خوێندووە و بەرهەمی شاعیرە گەورەکانی یۆنانی لەبەر دەستدا بووە. لە تەمەنی لاوێتیدا تراجیدیای بە شیعر نوسیوە و خۆشی ئامادە کردووە لە پێشبرکێدا بۆ خەڵات وەرگرتن بەشداری بکات. بێجگە لە شیعر نوسین هونەرمەندێکی شێوەکاریش بووە.(3) بەڵام لە تەمەنی بیست ساڵیدا گۆڕانێکی گەورە لە ژیانیدا ڕوویداوە. پاش ئاشنابوونی بە سوکرات واز لە شیعر نوسین و هونەری شێوەکاری دەهێنێت و ڕوودەکاتە جیهانی بەرینی بیرکردنەوەی فەلسەفی. گوایە سوکرات لە بەردەم هۆڵی شانۆی دیۆنسیس لەسەر کێشەیەکی فەلسەفی دەدوێت، ئەفلاتون گوێی لە سوکرات دەبێت و بە سەرسوڕمانەوە دێڕێک شیعری بەسەردا هەڵدەدات و دەڵێت؛ (ئەی خوداوەندی ئاگر وەرە، ئەفلاتون تینووی تۆیە).(4)

لەو ڕۆژەوە ئەفلاتون دەبێت بە شاگردی سوکرات و لە نزیکەوە گوێ لە باسە فەلسەفییەکانی دەگرێت. دیۆجنیس دەیگێڕێتەوە شەوێک سوکرات پێش بینینی ئەفلاتون خەو دەبینێ، مراوییەک لەسەر کۆشی دەنیشێتەوە و پەڕێکی خۆی بە سوکرات دەدات. پاش ئەوە مراوییەکە دەقیژێنێ و هەڵدەفڕێت. ڕۆژی دوایی ئەفلاتون بە سوکرات دەناسێنن و سوکرات تەماشای ئەفلاتون دەکات

Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers* 3: 6-5, p. 281. (3)

(4) هەمان سەرچاوە. ل.281

.

و دەڵێت، ئێستا دەزانم مراوی خەونەکەم کێیە.(5) حەزدەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵەش بکەم، کە دوای خوێندنی فەلسەفە ئەفلاتون عەشقی بۆ شیعر کەم نەبۆتەوە. وێنە و ئەندێشەی شیعری لە زۆر شوێنی دایەلۆگەکانیدا داناوە و شیعری شاعیرەکانی یۆنانی، وەکو هۆمەر و هزیۆد و پیندار و سۆفۆکلیس و ئەریستۆفانس بەکارهێناوە. پاش مردنیشی خوێندکارەکانی دیوانی (سۆفرۆن)ی شاعیری (سیسلی)یان لەژێر سەرینەکەیدا دۆزیوەتەوە.(6) بەڵام لەوە ناچێت پەیوەندی بە هونەری شێوەکارییەوە بەردەوام بووبێت.

سوکرات یەکەم فەیلەسوفە کاریگەرێتی بەسەر بۆچوونی ئەفلاتونەوە جێ هێشتبێت. هەرچەندە هاوڕێتییەکەیان نۆ ساڵی خایاندوە، ئەفلاتون نیوەی تەمەنی لەژێر ئەم کاریگەرێتییەدا بەسەر بردووە. لە زۆربەی دایەلۆگەکانیدا سوکرات بووە بە پاڵەوان و ناوەندی دەربڕینی بۆچوونە فەلسەفییەکانی. لە هەندێک دایەلۆگدا بە تایبەتی لە دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتاییدا، بیرکردنەوەی فەلسەفیی سوکرات بەسەریاندا زاڵە. لەنێو دایەلۆگەکانی قۆناخی دووەم و سێیەمدا ئەفلاتون بۆچوونەکانی خۆی لەسەر زاری سوکرات بە خوێنەر دەگەیەنێت. لە هەر سێ قۆناخەکەدا، بێجگە لە یەک دایەلۆگ، سوکرات پاڵەوان و پێشەنگی مشتومڕە فەلسەفییەکانە.

(5) هەمان سەرچاوە.

(6) هەمان سەرچاوە.



لە ساڵی (404 پ ز) جەنگی پێلۆپۆنیسیا بە ڕووخانی دەستەڵاتی ڕامیاری ئەسینا کۆتایی دێت. سپارتییەکان دەوڵەتێکی ئۆلیگارکی (دەستەو تاقمێکی دەوڵەمەند)ی سەر بە ڕژێمی خۆیان، کە لە 400 ئەندام پێکدێت دادەمەزرێنن. پاش ماوەیەکی کەم ژمارەی ئەندامانی ئەم سەرکردایەتییە، کەم دەکەنەوە و ئەنجومەنێکی (سی) کەسی بۆ فەرمانڕەوایی دروستدەکەن. سەرۆکی ئەم ئەنجومەنە (کریتیاس) ئامۆزای دایکی ئەفلاتون دەبێت و خاڵی ئەفلاتونیش (چارمەدیس) ئەندامی ئەنجومەنەکە دەبێت.

ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە، لەسەرو هەموویانەوە کریتیاس، بە دەستی پۆلایینەوە دەنگی دیموکراسییەکان سەرکوت دەکات و دەکەوێتە کوشتن و قەلاچۆکردنی لایەنە نایارەکان. دیموکراسییەکانیش لە هەندەران دەکەونە خۆئامادەکردن و لەشکر کۆکردنەوە بۆ جەنگێکی خوێناوی. پاش نۆ مانگ هێرش دەکەنە سەر ئەسینا و دەسەڵاتی ئەنجومەنی ئۆلیگارکی دەڕوخێنن و لەو جەنگەدا خاڵی ئەفلاتون و ئامۆزاکەی دایکی دەکوژرێن و دەوڵەتێکی دیموکراسی لە ئەسینا دادەمەزرێتەوە.(7) ئەفلاتون پێشوازی ئەم گۆڕانە ڕامیارییە دەکات و بەو هیوایەوە پشتگیری دیموکراسییەکان دەکات، کە بتوانن دەستورێک بۆ ئەسینا دابنێن و ئاسایش لە یۆناندا سەقامگیر بکەن.

(7) R.S. Bluck, *Plato's Life and Thought*, with a translation of the Seventh Letter, London: Routledge and Kegan Paul, 1949. P. 22.

جارێکی دیکە شاری ئەسینا بکەن بە لانکەی سەربەستی و گەشەکردنی فەلسەفە و زانست و مافی هاووڵاتیان بپارێزن. بەڵام ئەم خەونەی ئەفلاتون نایەتە دی. دیموکراسییەکان ڕیگەی تۆڵەسەندنەوە و کوشتن و قەلاچۆکردنی نایارەکانیان دەگرنەبەر. بارودۆخێکی هێندە نالەبار دەهێننە کایەوە، کە زوڵم و زۆری ئۆلیگارکییەکان لەچاویدا بە سەردەمی زێڕین دادەنرێت. لەسەرو ئەمانەشەوە، دیموکراسییەکان سەربەستی بیروڕاو دەربڕین پێشل دەکەن و تاوانێکی گەورەش بەرانبەر فەلسەفە دەکەن.

لە ساڵی 399 پ.ز ئەو کاتەی ئەفلاتون تەمەنی 28 ساڵان دەبێت، سوکرات بە تاوانی بێبڕوایی و گەندەڵکردنی بیرکردنەوەی لاوان دەگیرێ و دەدرێ بە دادگا و فەرمانی کوشتنی دەردەچێت.

ئەم ڕووداوانە ئەفلاتونی لە ئاستی سیستەمە ڕامیارییەکانی سەردەمەکەیدا لە ئۆلیگارکییەوە بۆ دیمۆکراسی ڕەشبینتر کرد.

هەروەها ئەفلاتون دەیتوانی لەو تەمەنەوە بەشداری پرۆسە ڕامیارییەکان بکات، تەنانەت خزمەکانی داوایان لێکرد لە کۆبوونەوە و چالاکییەکانی ئەنجومەنە (سی) ئەندامییەکەدا ئامادەبێت، تاکو بتوانن جێگەی بکەنەوە و بۆ وەرگرتنی پۆستێکی ڕامیاری پەروەدەی بکەن. ئەفلاتون، بەو شێوەیەی لە نامەی حەوتەمییدا باسیدەکات، لە سەرەتاوە پێشنیارەکەی لا باش بوە، بەڵام نەیتوانیوە بڕیاری لەسەر



بدات.(8) لەم نامەیەدا، کە بۆ دیۆن و هاوڕێکانی نوسیوە بە ئاشکرا ڕەخنە لەڕژێمە ڕامیارییەکانی سەردەمەکەی دەگرێت.(9) لە دایەلۆگی کۆماریشدا جەخت لەسەر دامەزراندنی ڕژێمێکی ڕامیاری دادوەرانە دەکات. لەو باوەڕەدایە نەخۆشییە ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکان ئەو کاتە لەناودەچن، کە فەیلەسوفە ڕاستەقینەکان، ئەوانەی عاشقی ڕاستی و خاوەنی زانینی فەلسەفین، دەستەڵاتی ڕامیاری بگرنە دەست و بەشداری لە پرۆسەی فەرمانڕەواییدا بکەن و دەڵێت؛

> کەوابوو، لەگەڵما هاوڕایت لەسەر ئەوەی باسەکەمان خۆزگەیەکی ڕووت نیە. هەرچەندە دامەزراندنیان دژوارە بەڵام مەحاڵ نیە. لەو باوەڕەدایت، کە تەنیا لەو ڕێگەیەوەی باسمانکرد، ئەو کاتەی فەیلەسوفێک یان چەند فەیلەسوفێک فەرمانڕەوایی دەکەن، دادەمەزرێت؟

---

(8) Plato, “Letter VII”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D.S. Hutchinson, Indianapolis\ Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997. P.1947.

ئەفلاتون سیانزە نامەی لە پاش خۆی جێهێشتوە. مێژوونوسان گومان لە ڕەسەنیەتی زۆربەیان دەکەن. نامەی حەوتەمی درێژترین نامەیە و باسی هەندێک ڕووداوی گرنگ لە ژیانی ئەفلاتوندا دەکات. ئەگەر ئەم نامەیە ئەفلاتونیش نەینوسیبێت یەکێک لە خوێندکارەکانی، کە لە مامۆستاکەیەوە نزیک بووە نوسیویەتی چونکە ڕووداوەکان بە دروستی باسدەکات.

(9) Plato, “Letter VII”, in *Plato: Complete Works*, p.1648.

فەیلەسوف ئارەزوومەندی ڕیزلینان نیە و دادوەری بە بنەڕەتی
و گرنگ دەبینێت و هەوڵی سەقامگیرکردنی دەدات.(10)

ئێمە لەڕێگەی دایەلۆگەکانی ئەفلاتونەوە زۆرتر لە بارەی ژیانی سوکرات فێردەبین و زانیاریمان دەست دەکەوێت. لە دایەلۆگی کریتۆدا، باسی ئەوەمان بۆ دەکات کریتۆ، خوێندکارێکی سوکرات، بەرتیل بە پاسەوانەکانی زیندان دەدات تاکو سوکرات دەرباز بێت و نەکوژرێت. کریتۆ دەچێتە زیندان و سوکرات ئاگاداری پلانەکە دەکات، بەڵام پاش مشتومڕێکی زۆر سوکرات ڕاکردن بە ناکۆک لەگەڵ بیرکردنەوەی فەلسەفی و بۆچوونەکانی خۆیدا دادەنێت و بە پلانەکە ڕازی نابێت. لەبەردەم خوێندکارەکانی بێ پەشیمانی پیاڵەی زەهرەکە دەخواتەوە و دەمرێت. وەکو دەزانین، ئەفلاتون لەو ڕۆژەدا، واتە دوا ڕۆژی سوکرات و کاتی زەهر خواردنەوەکەی لەبەر نەخۆشی لەوێ نەبووە و نەیتوانیوە ماڵ ئاوایی لە مامۆستاکەی بکات. بەڵام دیۆجنیس پلانی دەربازبوونی سوکرات لەنێو زینداندا بە جۆرێکی دیکە دەگێڕێتەوە. گوایە پلانەکە خوێندکارێکی دیکەی سوکرات بە ناوی(ئەشینس) دایناوە. لەبەر ئەوەی ئەم خوێندکارە و ئەفلاتون لەگەڵ یەکدا ناسازبوون، ئەفلاتون کریتۆی کردوە بە خاوەنی پلانەکە. دیۆجنیس ئەم ڕووداوە لەسەر زاری ئیدۆمینۆس دەگێڕێتەوە و هەوڵی

(10) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال ، دەسگای سەردەم، سلێمانی، 2008، ل 256



سەلماندنی دروستی یان نادروستییەکەی نادات.(11) بە بۆچوونی من پلاندانان بۆ دەربازکردنی زیندانییەکی، وەکو سوکرات، کە مرۆڤێکی ناسراوە، بە تاکە کەسێک دادەنرێت، بەڵام ئەنجام نادرێت. هەڵبەتە چەند خوێندکارێک بەشدارییان لە جێبەجێ کردنی کردوە. دەگونجێت کریتۆ پلانەکەی لای سوکرات ئاشکرا کردبێت، بۆیە ئەفلاتون لە دایەلۆگەکەیدا گفتوگۆکە نەک پلانەکەی لەنێوان سوکرات و کریتۆدا باسکردوە و کەسی دیکە بەشداری تێدانەکردوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت یان ئەوە ناسەلمێنێت کەسێکی دیکە یان ئەشینس ئاگای لە پلانەکە نەبووبێت یان بەشداری تێدا نەکردبێت.

بیرکردنەوەی فەلسەفی سوکرات و مەرگی سوکرات کاریگەرێتیان بەسەر بیرکردنەوەی ئەفلاتونەوە ئاشکرایە. ئەفلاتون، سوکرات بە مەزنترین بیریاری سەردەمەکەی دادەنێت.(12) کوشتنی سوکراتیش لەلایەن ڕژێمەوە تەنیا لە خاچدانی بیری سەربەست نیە، بەڵکو کوشتنی هۆشێکی مەزن و فەیلەسوفێکی گەورەی سەردەمەکەیە و لەناوبردنی دەرەتانێکی داهێنان و ڕەخنەگرانەیە. لەبەر ئەم هۆیەشە دەستەڵاتمەدارانی ئەسینا ئەم بیریارە بە مەترسییەکی گەورە بەرانبەر دەستەڵاتی گەندەڵییان دادەنێن. ئەوان دەیانزانی فەیلەسوف یان ڕووناکبیر ویژدانێکی بەئاگا و ڕێگری گەندەڵییە، بۆیە لەناوبردنی

(11) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3: 36-39, p. 310-11.

(12) Plato, "Letter VII", in *Plato: Complete Works*, p. 1647.

ئەم جۆرە مرۆڤانە لەلایەن ڕژێمە گەندەڵەکەوە کارێکی حەتمییە. سوکراتیش دەیزانی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لەگەڵ مەرگی فەیلەسوفدا کۆتایی نایەت. ئەو کاتە بیرکردنەوەی فەلسەفییانە دەمرێت، کە ڕژێم فەیلەسوف دەستەمۆکات و ئەویش ستایش بۆ ڕژێم بکات. فەیلەسوفی ڕەسەن جەنگاوەرە و لە مردن ناترسێت؛ لە دژوەستان بەرانبەر نادادوەری و گەندەڵی پاشگەز نابێتەوە.

سوکرات یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی چ بە شیعر یان پەخشان لەسەر فەلسەفەی نەنوسیوە و هیچ نوسراوێک بە ناوی ئەوەوە بە دەستی ئێمە نەگەیشتوە. لەو باوەڕەشدابووە توانیویەتی شیعر بهۆنێتەوە.(13) هەروەها هونەرمەندی پەیکەرسازیش بووە. فەلسەفاندن پیشەی ڕۆژانەی بووە و بەردەوام لەگەڵ خوێندکارەکانیدا لەسەر کێشە فەلسەفییەکان مشتومڕی کردوە. بەپێچەوانەی بیریارەکانی پێش سەردەمەکەی ئەوەندە لە سروشت و بنەچەی بوونی نەکۆڵیوەتەوە و بە دوایدا نەگەڕاوە. کێشە فەلسەفییەکان بۆ ئەو ناوەڕۆکێکی ئاکارییان هەبووە و بە دوای واتایەکی هەمەکی و نەگۆڕ بۆ چاکە و بەختەوەری و دادوەرییدا گەڕاوە. ئەمەش بووە بە هاندەرێک بۆ دۆزینەوەی پێناسە بۆ ئەم چەمکانە و بەکارهێنانی میتۆدێکی لۆجیکمەندانە، کە ئەمڕۆ بە میتۆدی ئیندەکشن ناوزەدی دەکەین.

Plato, “Phaedo”, in *Plato: Complete Works*, 60 d, p. 52. (13)



لەم میتۆدەدا، فاکتۆرە هەندەکییەکان بە ئاکام و ڕاستییەکی هەمەکیمان دەگەیەنن. ئەمەش بەپێچەوانەی میتۆدی دیدەکشنە، کە لە پێشەکییەکی هەمەکی نەک هەندەکییەوە بە ئاکامەکە دەگات.(14) ئۆڵەمپادۆرۆس دەیگێڕێتەوە، ئەفلاتون پاش مردنی سوکرات لای کراتیلۆس فەلسەفەی خوێندووە.(15)

کراتیلۆس یەکێک بووە لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەی هیراکلیتس و باوەڕی بە گۆڕانی بەردەوام لە بووندا هەبووە. ئەمەش بنچینەی بۆچوونە فەلسەفییەکانی هیراکلیتسە. گوایە بێجگە لە خودی گۆڕان چی دیکە لە بووندا نەگۆڕ و وەستاو نیە. ئێمە ناتوانین دووجار لە ئاوی ڕووبارێکدا مەلە بکەین چونکە ئاوی ڕووبارەکە دەگۆڕێت و نوێ دەبێتەوە. ئەم بۆچوونە فەلسەفییانەش لەگەڵ بۆچوونەکانی پارمەنیدسدا، فەیلەسوفێکی دیکەی پێش سەردەمی سوکرات، ناکۆک و جیاوازن.

پارمەنیدس گۆڕان ڕەتدەداتەوە و بوون بە نەگۆڕ و وەستا و دادەنێت. ئەفلاتون لەگەڵ بۆچوونەکانی پارمەنیدسدا ئاشنایەتی هەبووە و

(14) لە (ئیندەکشن) دا هەموو پێشەکییەکان هەندەکین و تەنیا ئاکامەکەی هەمەکییە. لە (دیدەکشن)دا ئاکامێکی هەمەکی لە دوو پێشەکی هەندەکییەوە دەرناهێنرێت، لەبەر ئەوە پێویستە یەکێک لە پێشەکییەکانی، بەتایبەتی پێشەکی یەکەم هەمەکی بێت. بۆ نموونە: هەموو مرۆڤێک هۆشمەندە، سوکرات مرۆڤە، کەوابوو سوکرات هۆشمەندە.

R. S. Bluck, *Plato’s Life and Thought*, p. 23. (15)

ئەریستۆش لە پەرتووکی مێتافیزیکدا ڕاستی ئەم ڕووداوەی سەلماندوە. (16)

بە دیدی دیۆجنیس، ئەفلاتون لە نزیکەوە هەوڵی تێگەیشتنیانی داوە و لای هێرمۆجنیس، فەیلەسوفێکی سەر بە فێرگەی پارمەنیدس خوێندویەتی.(17) ئیمەش لە دواییدا باسی کاریگەرێتی هیراکلیتس و پارمەنیدس بەسەر سیستەمە مێتافیزیکییەکەی ئەفلاتونەوە دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە چۆن ئەفلاتون ئەم دوو بۆچوونە ناکۆکانەی لە یەک سیستەمدا تێهەڵکێش کردووە.

پاش کوشتنی سوکرات کەژێکی ڕامیاری نالەبار بۆ خوێندکارەکانی سوکرات دروست بووە و ژیانی زۆریان لە مەترسیدابووە. ئەفلاتون لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا ئەسینا جێدەهێڵن و ڕوودەکەنە ماڵی ئەکلیدسی هاوڕێیان لە میگارا. ئەم ڕووداوە، بێجگە لە دیۆجنیس، هێرمۆدۆرسیش دەیگێڕێتەوە.(18) ئەکلیدس یەکێک بووە لە خوێندکارەکانی سوکرات و لە سەرەمەرگی سوکراتیشدا لە زیندان ئامادە بووە. هەروەها یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی بۆچوونەکانی

(16) ئەریستۆ، مێتافیزیک، بەشی ئەلفا، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2008. ل 31.

(17) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:5-6, p. 281 .

(18) هەمان سەرچاوە، هەروەها: A. E.Taylor, *Plato: The Man and His Work* , London: Methuen, 1960. P. 4



سوکراتی مامۆستای و پارمەنیدسی تێهەڵکێش کردووە و بەدامەزرێنەری فێرگەی فەلسەفی میگارا دادەنرێت. ئەفلاتون ماوەیەک لای ئەکلیدس دەمێنێتەوە و بۆ بینینی تیۆدۆرس، زانایەکی ماتماتیکی ئەو سەردەمە بۆ شاری سێرینا دەڕوات. لەوێوە گەشتەکەی بەرەو ئیتالیا بۆ لای پیتاگۆراسییەکان، بەتایبەتی فیلۆلاس و یۆرتیۆس دەخاتە گەر. لە ئیتالیاشەوە بۆ میسر دەڕوات.(19) لە ساڵی 388 پ ز، لە تەمەنی چل ساڵیدا و لەو گەشتەییدا بەرەو ئیتالیا، ئەفلاتون ڕوودەکاتە شاری سیراکیۆس و دەبێت بە میوانی دیۆنسیسی یەکەم پاشای ئەو شارە و لە نزیکەوە دیۆنسیس دەناسێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بە هاوڕێیەکی نزیکی دیۆن، ژنبرا و وەزیری دیۆنسیس. دیۆن دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئەفلاتون و ئارەزووی بۆ خوێندنی فەلسەفە سەرهەڵدەدات. ئەفلاتونیش بە نیازی کارتێکردن لەسەر ئەو ڕژێمە ڕامیارییە و نزیکردنەوەی فەلسەفەکەی لە ڕامیارییەوە ساڵێک لەو شارەدا دەمێنێتەوە. هۆی کورتی مانەوەکەشی بۆ سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان دیۆنسیس و ئەفلاتون دەگەڕێتەوە. گوایە لە یەکێک لە گفتوگۆکانیدا دیۆنسیس لە ئەفلاتون توڕە دەبێت و ئەفلاتونیش وەڵامی دەداتەوە و بە دیۆنسیس دەڵێت، "دیکتاتۆر". مێژوونوسەکانی وەکو کۆرلینۆس، دیۆدۆرۆس سیسیلۆس و دیۆجنیسیش دەگێڕنەوە، کە پاش ئەم مشتومڕە دیۆنسیس فەرمانی

(19) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:5-6, p. 281.

گرتن و بەکۆیلەکردنی ئەفلاتون و فرۆشتنی لە بازاڕدا دەدات. کەسێک لە بازاڕ ئەفلاتون دەناسێتەوە. دەیکڕێ و ڕەوانەی ئەسینای دەکاتەوە. پلوتارچ، مێژوونوسێکی دیکە، ڕووداوەکە بە شێوەیەکی جیاوازتر باسدەکات و بۆ مێژوو نوسێکی سیسلی بە ناوی تیمۆسی دەگەڕێنێتەوە.(20) بە دیدی پلوتارچ، هاوڕێکانی دیۆن ئەفلاتونیان بەو کەشتییە، کە باڵوێزی سپارتای بۆ ئەسینا بردوە ڕەوانەکردوە. دیۆنسیس بەم کارە دەزانێ و بە باڵوێزی سپارتا دەڵێت ئەفلاتون لە ڕێگا بکوژێت یان بە کۆیلەیی بیفرۆشێت. باڵوێزی سپارتاش نایکوژێ و لە شاری ئەگینا، وەکو کۆیلە دەیفرۆشێت. دیۆجنیس باسی ئەوەش دەکات، کە ئەفلاتون لە شاری ئەگینا فرۆشراوە و کەسێک بە ناوی (ئەنیسیریس) کڕیوێتی و ڕزگاری کردوە.(21) لێرەدا جیاوازی نێوان گێڕانەوەکان بۆ ئێمە گرنگ نیە چونکە هەموویان لەسەر ئەو خاڵە ڕێکدەکەون، کە ئەفلاتون پاش ئەو مشتومڕە لە بازاڕدا فرۆشراوە و کەسێک کڕیویەتی و ڕزگاری کردوە. لە نامەی حەوتەمدا ئەفلاتونیش باسی گەشتەکەی بۆ شاری سیراکیۆس دەکات و ئاشنابوونی لەگەڵ دیۆندا، نەک پاشا،

(20) R. S. Bluck, *Plato's Life and Thought*, p. 28.

(21) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:17-18, p. 293.
دیۆجنیس دەیگێڕێتەوە، کە دیۆنسیس توڕە بوەو بە ئەفلاتونی گوتوە (تۆ، وەکو پیرێکی خڵەفاو دەدوێیت.) ئەفلاتونیش وەڵامی داوەتەوە گوتوێتی، (تۆش، وەکو دیکتاتۆرێک).



بە ڕووداوێکی گرنگ دادەنێت. بەڵام ڕووداوی مشتومڕەکەی و بە کۆیلەبوونەکەی ناگێڕێتەوە. پاش ئەوەی دیۆنسیس هەواڵی ڕزگاربوونی ئەفلاتون دەبیستێت، نامەیەکی بۆ دەنوسێت و هەڕەشەی لێدەکات، کە بە خراپە ناوی نەهێنێت. ئەفلاتونیش وەڵامی دەداتەوە و دەنوسێت، کە ئەوەندە کاری بە دەستەوەیە، بیری دیۆنسیسی ناکەوێتەوە تاکو باسی بکات.(22) پاش ئەم ڕووداوە و نزیکەی دوانزە ساڵ تاراوگەنشینی لە ئیتالیا و میسر ئەفلاتون بۆ شاری ئەسینا دەگەڕێتەوە. توندوتیژی دیموکراسییەکان و هەڵوێستیان بەرانبەر فەلسەفە و شوێنکەوتوانی سوکرات هێمن دەبێتەوە. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە دامرکاندنەوەی مەترسییەکانەوە هەیە نەک گۆڕانی هەڵوێستی دیموکراسییەکان. دەردەکەوێت ڕۆڵی بیرکردنەوەی فەلسەفی دوای کوشتنی سوکرات نەیتوانیبێت دژی دەستەڵات یان وەکو چاودێرێک بەسەر دەستەڵاتەوە دەوری مێژوویی خۆی ببینێت. ئەو فێرگە و بۆچوونانەی دوای مردنی سوکراتیش سەریانهەڵدا ئەوەندە کاریگەر نەبوون. گەڕانەوەی ئەفلاتون بۆ نێو ئەو بۆشاییە ڕوودانێکی مێژووییە و لە کاتێکی پێویستدایە. بێگومان ئیسوکرات، کە یەکێک بووە لە خوێندکارەکانی سوکرات و نایاری ئەفلاتون، فێرگەیەکی بۆ خوێندنی ڕەوانبیژی کردبۆوە و منداڵی خێزانە دەوڵەمەندەکانی فێری ئەو هونەرە دەکرد. ڕەوانبێژی لەو سەردەمەدا

(22) R. S. Bluck, *Plato's Life and Thonght*, p. 29.

پێویستییەکی ڕامیاری بووە،تاکە میدیایەک بووە سیاسیەتمەدارەکان لە گفتوگۆکانی نێو پەرلەمان و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ جەماوەردا بەکاریان هێناوە. بەڵام ئەم هونەرە پەیوەندییەکی بەهێزی بە فەلسەفەوە نەبووە.(23)

ئەو کەسەی ئەفلاتونی بە(30 مینا)، کە سێ هەزار دراخمای ئەو کاتەی کردوە، کڕیوە ناوی(ئەنیسیریس) بووە. پاش ڕزگارکردنی ئەفلاتون دیۆن و چەند هاوڕێیەکی ئەم پارەیە بۆ ئەنیسیریس دەگەڕێننەوە. بەڵام ئەنیسیریس پارەکە بۆ خۆی هەڵناگرێ و باخچەیەکی بۆ ئەفلاتون نزیک پەیکەری (ئەکادیمۆس) یان(هیکادیمۆس) پێدەکرێت. ئەفلاتونیش لەو باخچەیەدا یەکەم فێرگەی فەلسەفی لە مێژووی ڕۆژئاوادا بە ناوی ئەکادیمیا، کە دوای ئەوە بە ئەکادیمیای ئەفلاتون ناسراوە لە ساڵی 387 یان 388 ی پێش زایین دادەمەزرێنێت.(24) لەو کاتەوە تاکو ساڵی 529 ی زایینی، کە زیاتر لە نۆسەد ساڵ دەکات ئەکادیمیا دەبێت بە لانکە بۆ پێشخستنی بیرکردنەوەی فەلسەفی.

---

(23) ئیسۆکرات (436 – 338 پ ز) ڕەوانبێژی یۆنان ، هاوسەردەم و نایاری ئەفلاتون بووە. لە لای سوکرات و جۆرجیاسی زانای سەفسەتەکان خوێندویەتی. لە ساڵی 392 پ ز فێرگەیەکی بۆ ڕەوانبێژی لە شاری ئەسینا دامەزراندوە. ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران ڕوویانتێکردوە.

(24) ڕوودانی گەڕانەوەی پارەکە لە لایەن دیۆن و چەند هاوڕێیەکی ئەفلاتونەوە هەموو مێژوونوسەکان باسیان کردوە، بەڵام لە ڕاستیدا نازانین دیۆن یان هاوڕێیەکی دیکەی ئەفلاتون پارەکەی بۆ ئەنیسیریس گەڕاندۆتەوە.



ئەو کاتەی ئەکادیمیا دامەزراوە ئەفلاتون تەمەنی چل ساڵان بووە. لەو ڕۆژەوە ئەم بیریارە ژیانی خۆی بۆ وانە گوتنەوە و نوسین تەرخان کردوە. بێجگە لە دوو گەشتی دیکەی بۆ شاری سیراکیۆس ئەکادیمیای جێنەهێشتوە. ئەم بیریارە هەوڵیداوە و توانیوییەتی ژیانێکی فەلسەفییانە بۆ خۆی هەڵبژێرێت و پەیڕەوی بۆچوونە فەلسەفییەکانی خۆی بکات. لەلایەکەوە وەکو سوکرات، بەردەوام لەگەڵ خوێندکارەکانیدا لە مشتومڕدا بووەو ڕێنمایی کردوون. لەلایەکی دیکەشەوە، وەکو پیتاگۆراس بەرنامەیەکی فێربوون و ژیانی بۆ داناون و هەوڵی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی فەلسەفی داوە. دامەزراندنی ئەکادیمیا و ناوداریتی ئەفلاتون لەنێو لاواندا دۆست و دوژمنی بۆ پەیداکردوە. دیۆجنیس و مامۆستا زیلەر دەیگێڕنەوە، کە کەسانێک هەبوون بەرانبەر ئەفلاتون دژانە ڕاوەستاون و دوژمنایەتییان لەگەڵدا کردوە. پەیوەندییەکەشیان بە کەسانی، وەکو دیۆنسیس و دیۆنەوە بە تانە و خۆویست و بەرژەوەند پەرست داناوە. بەڵام ئەفلاتون ئەوەندە بەرانبەریان توندو تیژ نەبووە. مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ بووە و حەزی لە تەنیایی کردوە. ئەفلاتون لەگەڵ(ئەشینس)، کە پێشتر باسمان کرد و ئەنتیستینس و زینەفۆن، کە هەرسێکیان خوێندکاری سوکرات بوون، هاوڕێیەتییەکەی گەرم نەبووە. بە دیدی دیۆجنیس، تێکچوونی پەیوەندی نێوان ئەفلاتون و وئەنتیستینیس بۆ هێرشەکانی ئەم بیریارە و هەڵوێستی توندوتیژی بەرانبەر ئەفلاتون دەگەڕێتەوە و

لەم ناکۆکییەدا ئەفلاتون تاوانبار نیە.(25) بۆ تێگەیشتن لە گەشتی دووەمی ئەفلاتون بەرەو سیسلی(لە ئیتالیا) دەگەڕێمەوە بۆ شاری سیراکیۆس و گۆڕانی دەستەڵاتی سیاسی لەو شارەدا. لە ساڵی (367 پ ز) دیۆنسیسی دیکتاتۆر نەخۆش دەکەوێت و دەمرێت. یەکێک لە کوڕەکانی بە ناوی دیۆنسیسی دووەم و خوشکەزای (دیۆن)ی هاوڕێیی ئەفلاتون دەبێت بە جێگری باوکی و لەسەر تەختی دەستەڵات دادەنیشێت. دیۆن بە نامە داوا لە ئەفلاتون دەکات بۆ سیراکیۆس بڕوات و دیۆنسیسی دووەم پەروەردە بکات. ئەفلاتون، پاش بیست ساڵ بەسەر ناکۆکییەکەی لەگەڵ دیۆنسیسی یەکەمدا، لە تەمەنی شەست ساڵێدا ئەکادیمیا جێدەهێڵێت و بەرەو سیراکیۆس دەکەوێتە ڕێ. لێرەدا چەند پرسیارێک خۆیان دەسەپێنن: بۆچی ئەفلاتون ئەکادیمیا جێدەهێڵێت و بۆ سیراکلۆس دەڕوات؟ ئایا ئەفلاتون چ مەبەستێکی لەم گەشتەدا هەبووە؟ با ئەوەشمان لەیاد نەچێت، کە ئەم گەشتانە بەرەو ئیتالیا و نزیک بوونەوەی لە دەستەڵاتمەدارەکانی ئەو ناوچەیە بۆتە مایەی ڕەخنە و تاوانبارکردنی ئەفلاتون لە لایەن نەیارەکانیەوە. لە ڕاستیدا، گەشتی دووەمی بۆ ئیتالیا،کە لە نامەی حەوتەمیشدا باسکراوە، پەیوەندی بە بۆچوونی

(25)بڕوانە:

Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:33- 34, p. 307.

هەروەها بڕوانە:

Eduard Zeller, *Plato and the Old Academy*, translated by Sarah F. Alleyne and Alfred Goodwin, Londan: Longmans, Grees and Co., 1876. P.36-37.



فەلسەفی ئەفلاتونەوە هەیە.(26) بە گەیشتنی نامەکەی دیۆن ئەفلاتون دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە پەروەردەکردنی سەرکردە و دەستەڵاتمەدارێک و گۆشکردنی بە بیرکردنەوەی فەلسەفی دەبێت بە بناخەی دامەزراندنی دادوەری و یەکسانی کۆمەڵایەتی و بەختەوەری تاکەکانی نێو کۆمەڵ. مسۆگەرکردنی دادوەری دەکەوێتە سەرشانی فەیلەسوفێکی فەرمانڕەوا یان فەرمانڕەوایەکی پەروەردەکراو بە فەلسەفە. لەبەر ئەمە، پەروەردە کردنی ئەم فەرمانڕەوا لاوە بۆ ئەفلاتون ئەرکێکی مێژووییە و ژیانێکی بەختەوەرانە بۆ ئەو کۆمەڵە پێکدەهێنێت، کە ئەو فەرمانڕەوایە سەرپەرشتی دەکات. گەشتی دووەمی بەرەو ئیتالیا یان شاری سیراکیۆس، لەم ڕووەوە گرێدانی بیردۆزەیە بە کارکردنەوە. ئەم فەیلەسوفە دەیەوێت بیرکردنەوە فەلسەفییەکەی لە ڕێگەی پەروەردەکردنی دیۆنسیسی دووەمەوە بە کردەوە بسەلمێنێت. کۆمەڵگایەک دروست بکات فەیلەسوف تیایدا دەستەڵاتمەداربێت. ئەم بیرۆکەیە ناوەرۆکی فەلسەفە ڕامیارییەکەی ئەفلاتونە، کە لە دایەلۆگی کۆماردا بە درێژی. ئەوەی گرنگە ئاماژەی بۆ بکرێت جۆرە پەلە کردنێکە لە هەڵوێستی ئەفلاتون و ناکۆکی ئەم هەڵوێستەشی لەگەڵ بیرۆکەی(فەیلەسوفی فەرمانڕەوا) لەنێو کۆمارەکەیدا. دەزانین،لەم قۆناخەی تەمەنی ئەفلاتوندا، ئەگەر

(26) Plato, "Letter VII", in *Plato: Complete Works*, p.164.

دیۆجنیس و مامۆستا ئیدوارد زیلەریش لە هەمان سەرچاوەدا، کە بۆ ئەم نوسراوە سودم لێوەرگرتون هەمان بۆچوونیان بۆ مەبەستی ئەم گەشتەی ئەفلاتون هەیە.

دایەلۆگی (کۆمار)تەواویش نەکرابیت، بیرۆکەکانی لای ئەفلاتون گەشەیان کردووە و تەنانەت چەند بەشێکیشی نوسیوە. فەیلەسوفی فەرمانڕەواش لە منداڵییەوە، نەک لەو ڕۆژەوە دەکرێت بە فەرمانڕەوا و خاوەنی دەستەڵاتی ڕامیاری پێویستە بەگوێرەی بەرنامەی پەروەردە و فێربوونی کۆمارەکە گۆش بکرێت و بۆ ئەو ئەرکە ئامادەبکرێت. ئێمە لە دواییدا و لەم نوسراوەدا باسی پرۆسەکان و ئاڵۆزی ئەم بەرنامەی پەروەردە و فێربوونە دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە چۆن بۆ پەروەردەکردنی فەیلەسوفی فەرمانڕەوا پێش لە دایکبوونی دەبێت بەرنامەڕێژی بۆ بکرێت و زەمینەی بۆ خۆش بکرێت. پەلەکردنی ئەفلاتون لەم گەشتەدا، وەکو دەبینین، هۆیەکی فەلسەفییانەی بە خۆوە گرتوە بەڵام ئەو پرسیارەش دەکەین، ئایا ئەم فەیلەسوفە مەزنە لەگەڵ فەلسەفە ڕامیارییەکەیدا توشی ناکۆکی نەبوە؟ بێگومان، بەگوێرەی نامەکەی دیۆن بۆ ئەفلاتون، دیۆنسیسی دووەم ویستی فێربوون و خوێندنی فەلسەفەی هەیە. ئەمەش دەرەتانێکی چاکە تاکو ئەم فەرمانڕەوا لاوە پەروەردە بکرێت. هەمان کات، هەستان بەم کارە دژوارە و لەگەڵ بۆچوونە فەلسەفییەکانی نیو کۆماردا ناکۆکە. ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە پەروەردە تەنیا مەرجێک نیە بۆ دروستکردنی فەیلەسوف. میراتیش هۆکارێکی گرنگ و سەرەکییە و فەیلەسوف لە دایک و باوکێکی فەیلەسوف و نافەیلەسوفیش لە دایک و باوکی نافەیلەسوفەوە پەیدا دەبێت. بەهەمان شێوە دەتوانین بڵێین، کە



منداڵی دکتاتۆر دکتاتۆر دەردەچێت. ئەگەر باوکی دیۆنسیسی دووەم، ئەو فەرمانڕەوا دیکتاتۆرە بێت بێ ڕێزلێنان لە فەلسەفە و زانست ئەفلاتونی لە بازاڕدا لەسەر کێشەیەک بەکۆیلە کردبێت و فرۆشتبێتی، چۆن منداڵەکەی دەبێت بەو فەیلەسوفە فەرمانڕەوایەی ئەفلاتون دەیەوێت دروستی بکات؟ بەبڕوای من، ئەم ناکۆکییەیە بۆتە سەرچاوەی ڕەخنەگرتن و پەلاماردانی ئەفلاتون لە لایەن نەیارەکانییەوە. هەندێکیان لەو باوەڕەدابوون، کە ئەفلاتون بۆ بەرژەوەندی خۆی بەم کارە هەستاوە و لە دەستەڵات نزیکبۆتەوە. دەشێ ئەفلاتون حەزیکردبێت لە دەستەڵاتەوە نزیک بێت. ئەمەش لە ژیانی ئەودا نوێ نەبووە چونکە لە خێزانێکی ڕامیاری و ناودارەوە پەیدابووە. بەڵام لە کۆمارەکەشیدا جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە فەیلەسوف چاوەڕوانی خەڵات وەرگرتن و ڕێزلینان ناکات. دوور لە بەرژەوەندی خۆی بۆ کۆمەڵەکەی کاردەکات و بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت. (27)

(27) ئەفلاتون لە نامەی سیانزەهەمییدا، کە بۆ دیۆنسیسی دووەمی نوسیوە، باری ئابووری خۆی باسدەکات و سوپاسی دیۆنسیسیش دەکات، کە یەکێک لە هاوڕێکانی ڕاسپاردوە پارە بە ئەفلاتون بدات. ئەفلاتون لە نامەکەدا دەنوسێت، کە دەستی کورتە و چوار کچی خوشکەزاکەشی پاش مردنی دایک و باوکیان کەوتون بەسەر ئەفلاتوندا. گەورەکەیان کاتی شوکردنێتی و بچوکەکەشیان یەک ساڵانە. بەگوێرەی نەریتی یۆنان، دەبوایە باوکی کچ جیازی بە مێرد بدات. ئەمەش بۆتە خەمێکی گەورە بۆ ئەفلاتون، نازانێت چۆن جیازی چوار کچ پەیدا بکات. هەروەها،لە هەمان نامەدا دەڵێت، کە دایکی لە سەرەمەرگدایە و بۆ گۆڕ هەڵبەستنی دایکیشی پێویستی بەهەندێک پارەیە. بڕوانە:
Plato, “Letter XIII”, in *Plato: Complete Works*, p. 1674-5.

پەلەکردن و ناکۆکی ئەم گەشتە لە ئاکامەکەیدا دەردەکەوێت. لە ساڵی (367پ ز) ئەفلاتون دەگاتە سیراکیۆس و دیۆنسیسی دووەم و دیۆن پێشوازی دەکەن. هاوڕێیەتی نیوان ئەفلاتون و دیۆن پاش ماوەیەکی کورت دەبێتە کێشەیەکی گەورە بۆ دیۆنسیس. دیۆنسیس توشی (غیرە) دەبێت و حەزناکات ئەفلاتون زۆرتر لە دیۆن نزیک ببێتەوە. بێگومان هاوڕییەتی نێوان ئەفلاتون و دیۆن لە گەشتی یەکەمی ئەفلاتونەوە بۆ ئەو شارە بیست ساڵ لەوەو پێش دەستیپێکردوە. دیۆنیش بۆ ئەم فەرمانڕەوا لاوە بێگانە نیە چونکە خاڵی دیۆنسیسە و وەزیری باوکیشی بووە. چەند لایەنێکیش دژی دیۆن کاریان کردووە و دیۆنسیسان ئاگادارکردوە لەوەی دەستەڵات و ناودارێتی دیۆن هەڕەشەیەکی گەورەیە، هەروەها دیۆن نیازی گۆڕانی دەستەڵاتی هەیە و دەیەوێت دیۆنسیس لابەرێت.(28) ئەم ڕووداوانە بوونەتە هۆی تێکدانی پەیوەندی نێوان ئەفلاتون و دیۆنسیس. تەنانەت ئەفلاتون تاوانباردەکرێت بەوەی لەگەڵ دیۆن پلان بۆ گۆڕانی دەستەڵات دابنێت. دیۆنسیس فەرمانی دەست بەسەراگرتنی ئەفلاتون دەردەکات و ڕێگەی دەرچوونی لەو شارە پێنادات. ئەمجارەش ژیانی ئەفلاتون دەکەوێتە مەترسییەوە. پڕۆژە فەلسەفییەکەشی بۆ پەروەردەکردنی فەرمانڕەوا و دامەزراندنی کۆمەڵگایەک فەیلەسوف

(28)
R. S. Bluck, *Plato's Life and Thought*, p. 39, A. E. Taylor, *Plato the Man and His Work*, p.7, and Plato, "Letter VII", in *Plato: Complete Works,* p. 1651.



فەرمانڕەوایی بکات هەڵدەوەشێتەوە. یەکێک لە بیریارەکانی فێرگەی پیتاگۆراس هەواڵەکە دەبیستێت و نامەیەک بۆ دیۆنسیس دەنوسێت تاکو ئازاری ئەفلاتون نەدات. ئەم بیریارە، کە ناوی (ئەخیتاس)ە و ئەفلاتونیش لە نامەی حەوتەمییدا باسیکردوە، داوا لە دیۆنسیس دەکات بە ڕێزەوە ئەم فەیلەسوفە گەورەیە ڕەوانەی ئەسینا بکات.(29) دیۆنسیس داواکارییەکەی ئەرخیتاس جیبەجێ دەکات و لە ساڵی (365 پ ز) دا ئەفلاتون بۆ ئەسینا دەگەڕێتەوە و جارێکی دیکە لە ئەکادیمیا خۆی بە وانە گوتنەوە و نوسینەوە ماندودەکات. دیۆن پاش ساڵێک لە ئیتالیا ڕادەکات و دەچێتە لای ئەفلاتون. چوار ساڵ لە ئەکادیمیا دەمێنێتەوە. پاش ڕاکردنی دیۆن، دیۆنسیس ماڵ و سامانی دیۆن داگیردەکات و (ئەریتا)ی ژنیشی بە زۆر دەدات بە پیاوێک، کە ناوی تیمۆکرتیس دەبێت.

لە هاوینی ساڵی (362 پ ز)دا، دیۆنسیس بۆ ڕازیکردنی گروپە فەلسەفییەکان و دەرخستنی حەز و ویستی بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفییانە، نامەیەک بۆ ئەفلاتون دەنوسێت و داوای لێدەکات سەردانی شاری سیراکێوس بکات. ئەفلاتون لە وەڵامدا دەنوسێت، کە پێویستە چارەسەری ناکۆکییەکانی لەگەڵ (دیۆن)ی خاڵی بکات و ئاشتی بکاتەوە. لەسەرو ئەمەشەوە، ئەفلاتون پیر بووە و تەمەنی

(29) دیۆجنیسی ئەم نامەیەی ئەرخیتاسی بۆ دیۆنیسیسی دووەم لەپەرتووکەکەیدا بڵاوکردۆتەوە، بڕوانە:
Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:21-22, p. 297.

شەست و پێنج ساڵە و تەوانای گەشتی نەماوە. وەڵامدانەوەکەی ئەفلاتون دڵی دیۆنسیس خۆشناکات، بۆیە پاش ساڵێک (ئەرخیدیمۆس)، کە بیریارێکی فێرگەی پیتاگۆراسە و هاوڕێی ئەرخیتاسە دەنێرێت بە شوێن ئەفلاتوندا.(30) بەگوێرەی نامەی حەوتەمی ئەفلاتون، زۆر لە هاوڕێکانی داوایان لە ئەفلاتون کردوە بەرەو ئیتالیا بڕوات. ئەفلاتون خۆشی لەو باوەڕەدابووە، کە دیۆنسیس بە هۆش خۆیدا هاتۆتەوە و ئەمجارە بە تەواوی دەیەوێت لە فەلسەفە نزیک بێتەوە و فێربێت. هەروەها، ئەفلاتونیش دەتوانێت بۆ ئاشتکردنەوەی دیۆن و دیۆنسیس هەوڵێک بدات و ڕاستەوخۆ لەگەڵ دیۆنیسیسدا لەم بارەوە بدوێت. لە بەهاری ساڵی (361 پ ز) ئەفلاتون لەگەڵ (سپیۆسیپۆس)ی خوشکەزای بەرەو شاری سیراکیۆس دەکەوێتە ڕێ و بۆ جاری سێیەم ڕوو دەکاتە ئیتالیا. دیۆنسیس بە گەیشتنی ئەفلاتون دڵخۆش دەبێت و داوا لە پاسەوانەکانی دەکات ئەفلاتون نەپشکنن و گوایە پارە و دیارییەکی زۆریشی داوەتێ، بەڵام ئەفلاتون وەرینەگرتون.(31) ئەفلاتون دیۆنسیس تاقی دەکاتەوە تاکو بزانێت بە چ ڕادەیەک تەوانای بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و فێربوونی هەیە. ئێمە نازانین ئەفلاتون چی لە دیۆنسیس دەپرسێت و چ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی بۆ داناوە، بەڵام پاش تەواوبوونی تاقیکردنەوەکە ئەفلاتون تێگەیشتوە هاتنەکەی ئەم جارەشی بێهودەیە و بێجگە لە

Plato, "Letter VII", in *Plato: Complete Works*, p.1657. (30)

R. S. Bluck, *Plato's Life and Thought*, p. 44. (31)



خۆماندووکردن و کات بە فیرۆدان ئاکامێکی دیکەی لە دوا نیە. ئەفلاتون بە پەلە بڕیاری گەڕانەوە بۆ ئەسینا دادات، بەڵام دیۆنسیس، لەبەر ناوزڕاندنی خۆی لەنێو فەیلەسوف و ڕووناکبیرەکاندا، هەوڵی دواخستنی گەڕانەوەکەی دەدات. بەڵێنیش دەدات ئەگەر ئەفلاتون گەڕانەوەکەی ساڵێک دوابخات لەگەڵ دیۆن ڕێدەکەوێت و هەوڵدەدات ئاشتی بکاتەوە. لە سەر ئەم بەڵێنە ئەفلاتون بڕیاری مانەوە دەدات. بەڵام دیۆنسیس بەڵێنەکەی ناباتە سەرو بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، ماڵ و سامانی دیۆن دەفرۆشێت. دیۆنیش لەگەڵ چەند هاوڕێیەکییدا لەشکر کۆدەکاتەوە و بە نیازی ڕوخانی ڕژێمەکە ڕوو لە سیراکیۆس دەکات. ژیانی ئەفلاتون جارێکی دیکە دەکەوێتە مەترسییەوە و پەیوەندی بە (ئەرخیتاس)ەوە دەکات. ئەرخیتاسیش داوا لە دیۆنسیس دەکات ڕێگە بە ئەفلاتون بدات بۆ ئەسینا بگەڕێتەوە. دیۆنسیس ڕێگەی گەڕانەوە بە ئەفلاتون دەدات و لە ساڵی (360 پ ز) بۆ ئەکادیمیا دەگەڕێتەوە. لە ساڵی (354 پ ز)یشدا دیۆن دەکوژرێت. ئەفلاتون لە نامەی حەوتەمدا بە ئاشکرا پشتگیری لە دیۆن دەکات و خەم و پەژارەی خۆی سەبارەت کوشتنەکەی دەردەبڕێت. باسی نائومیدی خۆشی لە ئاستی سەرنەکەوتنی دامەزراندنی ڕژێمێکی ڕامیاری دادوەر لە سیسلی دەکات.

پاش گەڕانەوەی بۆ ئەسینا، تاکو ئەو ڕۆژەی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە ساڵی (347 پ ز) دەمرێت، ئەکادیمیا چۆڵ ناکات.

دیۆجنیس دەیگێڕێتەوە، کە ئەفلاتون سیانزە ساڵ پاش هاتنی فلیب (باوکی ئەسکەندەری مەکەدۆنی) مردوە. لاشەکەشی لەنێو باخچەی ئەکادیمیا نێژراوە. هەموو خوێندکارەکانی لە کاتی ناشتنەکەیدا ئامادەبوون. ئەم چەند دێڕەش لەسەر کێلی گۆڕەکەی نوسراوە:

**لێرەدا لاشەی ئەریستۆکلیس ئەو مرۆڤەی لە خوا دەچێت نێژراوە؛ لەنێو کۆمەڵدا بە دادوەر و خاوەن ژیانێکی مامناوەند ناسراوە. کەسێکە ستایشی بۆ زانین کردوە و گەورەیشی لەژوور حەسودییەوە بووە.**

**زەمین لاشەی ئەفلاتونی لە باوەش گرتوە و گیانی نەمریشی گەیشتۆتە شوێنێکی دیکە. هەموو کەسێکی چاک بە ڕێزەوە ناوی کوڕی ئەریستۆن دەهێنیت چونکە ژیانێکی پیرۆزی هەبوو.**(32)

لەم ڕوونکردنەوەیەماندا سەبارەت ژیانی ئەفلاتون دوو کەسایەتی جیاواز دەبینین. لەلایەکەوە ئەو مرۆڤە هێمن و مەزنە خۆی نیشاندەدات، کە بە درێژایی تەمەنی هەوڵی ناسینی ڕاستی و گەیاندنی ئەو ڕاستییە لە ڕێگەی وانەگوتنەوە و نوسینەوە بە کۆمەڵ داوە. هیچ فەیلەسوفێکی ئەو سەردەمە، ئەوەندەی ئەفلاتون، نەیتوانیوە نوسراومان بۆ جێبهێڵێت و کاریش بکاتە سەر لاوانی

Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers,* 3:41, pp. 316-17. (32)



سەردەمەکەی و بیرکردنەوەی فەلسەفی پاش خۆی. لەلاکەی دیکەشەوە، لەودیو ئەو ژیانە هێمن و پڕ تێڕامانەوە کەسێکی ئۆقرەنەگر بۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی ڕامیاری دادوەرانە دەبینین، کە ئەم بیریارەی توشی هەڵە کردوە. تاکو ڕادەیەکیش کاتی بیرکردنەوە و نوسینی لێگرتوە.

## ئەکادیمیای ئەفلاتون

دامەزراندنی ئەکادیمیا لە مێژووی فەلسەفەدا ڕووداوێکی گرنگە. بێگومان دەزانین پێش ئەفلاتون پیتاگۆراس گروپێکی دروست کردوە، کە بە گروپی پیتاگۆراسییەکان ناسراوە و ئەم بیریارە بە نهێنی بۆچوونەکانی خۆی بە کەسە نزیکەکانی گەیاندوە. سوکراتیش دەستەوتاقمێک لە لاوانی کۆکردۆتەوە و ئەفلاتون یەکێک بوو لە ئەوان و ڕۆژانە لەسەر کێشە فەلسەفییەکان مشتومڕیان کردوە. ئەکادیمیای ئەفلاتون لەسەر و ئەمانەوە، بەرنامەگەرانە نزیکەی نۆسەد ساڵ، تاکو ئەو ڕۆژەی ڕژێمی سیاسی ئایینی قفڵی لە دەرگاکەی داوە، بنکەیەکی مەزنی فێرکردن و گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفی بووە. ئەم بنکەیە لەگەڵ خۆیدا نەریتێکی فەلسەفی بە ناوی (ئەفلاتونیی)ەوە هێناوەتەکایەوە و گەلێک لە بیریارانی جیهانی مەسیحگەری ڕۆژئاوا و ئیسلامی کەوتونەتە ژێر کاریگەرێتییەوە.

لەپێشتر باسمانکرد، کە ئەفلاتون پاش ڕزگاربوونی لە کۆیلایەتی و گەشتی یەکەمی بۆ ئیتالیا بۆ ئەسینا گەڕایەوە و (ئەنیسیریس)؛ ئەو کەسەی ئەفلاتونی بە (سی) مینا لە بازاڕدا کڕی و ئازادی کرد، بەو پارەیەی (دیۆن) بۆی ناردەوە باخچەیەک بۆ ئەفلاتون دەکڕێت. ئەفلاتونیش لەو ساڵەدا (387 یان 388 پ ز) باخچەکە دەکات بە خوێندنگایەک بۆ فەلسەفە و ناوی (ئەکادیمیا)ی لێدەنێت. ناوەکەشی پەیوەندی بە شوێن و پەیکەری ئەکادیمۆس یان (هیکادیمۆس)ەوە هەیە، کە پاڵەوانێکی نێو ئەفسانەی یۆنان بووە و نزیک باخچەکەی ئەفلاتون بۆ ڕێزلێنان لەو پاڵەوانە پەیکەرەکە دانراوە. ئەم خوێندنگایە یەکەم زانکۆی ڕۆژئاوایە و سترەکچەر و بەرنامەی ژیان و خوێندنی بۆ دانراوە و ئەفلاتون و خوێندکارەکانی لەوێ ژیاون. ئەم بەرنامەیە تەنانەت شێوە و جۆری خواردنیشی گرتۆتەوە. ئەفلاتون پارەی لە خوێندکارەکان نەسەندوە، بەڵام هەر کەسێک بە پارە یان خواردن کۆمەکی کردبێت، وەریگرتوە و ئەکادیمیای پێ بەڕێوەبردوە. ئەکادیمیا لە باخچەیەکدا نزیک پەرستگای ئەکادیمۆس بووە، کەوتۆتە بەشی باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری ئەسینا و لەنێو شارەوە و لە دەروازەی پێلۆنداوە هەزاروسەد مەتر دووربووە و باخی ئەپیکۆرۆسیش بەتەنیشت ئەکادیمیاوە بووە. لە ڕووباری (سیفیسیۆس) یشەوە نزیک بووە. دیوارێکیش بە چواردەوری ئەکادیمیادا دروستکراوە. لە ناوەوە پەیکەری خواکان و ناودارەکانی



ئەسینا دانراون. ژمارەیەکی زۆر درەختی زەیتونی تێدا نێژراوە، کە خوێندکارەکان سودیان لە ڕۆنی زەیتونەکەی وەرگرتوە و بەکاریان هێناوە. ئەکادیمیا نۆسەد ساڵ بەردەوام لە فێرکردنی فەلسەفەدا ڕۆڵی بینیوە و لە ساڵی (529 زاینی)دا ئیمپراتۆر جوستینیان (پاش ئەوەی بووە بە مەسیحی) ئەکادیمیای بە بنکەی گومڕایی تاوانبارکردوە و فەرمانی داخستنی داوە.

ژمارەیەکی زۆر لە لاوان چوونەتە ئەکادیمیا و لای ئەفلاتون فەلسەفەیان خوێندوە. دیۆجنیس ناوی چەند خوێندکارێکی لە پەرتووکەکەیدا داوە و منیش لێرەدا بەم شێوەیە ڕیزیان دەکەم:

**سپیۆسیپۆس،** خوشکەزای ئەفلاتون بووە، لەگەڵ ئەفلاتوندا لە گەشتی سێیەمدا بۆ ئیتالیا ڕۆیشتوە و پاش مردنی ئەفلاتونیش بوە بە یەکەم سەرۆکی ئەکادیمییا. ئەمەش دەبێتە یەکێک لە هۆکان بۆ نائومێدبوونی ئەریستۆ و چۆڵکردنی ئەکادیمیا و دامەزراندنی فێرگەیەکی فەلسەفی جیاواز بە ناوی (لیکیۆم). سپیۆسیپۆس، هەروەها دوو خوێندکاری دیکەش، **هیپۆتالیس** و **کالیپوس**، هاووڵاتی شاری ئەسینا بوون.

**ئەریستۆی** ستاگیرا و **فلیپۆسی** ئۆپس و **هێستیاسی** پێرنتۆس و **دیۆنی** سیراکیۆس (ئەم دیۆنە خاڵی دیۆنسیسی دووەمە، ئیمپراتۆری سیراکیۆس، کە بۆ جاری دووەم و سێیەم ئەفلاتونی بۆ ئیتالیا بانگ کرد، من لە پێشتر ئاماژەم بۆ کردوە). **ئەمیکلۆسی** هیراکلیسە و

**ئیراستۆس** و **کۆریسکۆسی** سیپسۆس و **تیمۆلیپسی** سیزیکۆس و **ئیۆنی** لەمپاسکۆس و **پیتۆن** و **هیراکلیدسی** ئایونس و **دیمتریۆسی** ئەمفیپۆلس و **هیراکلیدسی** پۆنتیۆس و گەلێکی دیکە. هەروەها دوو خوێندکاری کچیش؛ **لاسینیای** مانتینیا و **ئەکسیۆتیای** فیلیۆس، لە ئەکادیمیا فەلسەفەیان خوێندوەو گوایە دووەمیان جل و بەرگی پیاوانەی لەبەرکردوە.(33) ئەکادیمیا یەکێکە لەو فێرگە فەلسەفییانەی ماوەیەکی درێژخایەن بۆ پێشخستنی بیرکردنەوەی فەلسەفی دەوری بینیوە. ئەم فێرگەیە بە سێ قۆناخی گەشەکردندا تێپەڕیوە و گۆڕانی بە سەردا هاتووە. بەگشتی، ئەکادیمیا لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە تاکو داخستنی لە لایەن ڕژێمەوە، بە سێ قۆناخدا تێپەڕیوە. بەگوێرەی قۆناخەکانیش ئەکادیمییای کۆن و ناوەڕاست و نوێ هەن، کە لێرەدا بە کورتی باسیان دەکەین.

**یەکەم**، ئەکادیمیای کۆن لە گەڵ دامەزراندنیدا لە لایەن ئەفلاتونەوە لە ساڵی (388 پ ز) دەستپێدەکات. لەم قۆناخەدا بەرنامەی فێرکردن و خوێندنی فەلسەفە جەختی لەسەر پێڕەوکردنی بۆچوونەکانی ئەفلاتون کردووە. بەڵام جەختکردنەکە زۆرتر لەسەر لایەنە ماتماتیکی و میتافیزیکییەکان بووە نەک ئاکار و فەلسەفەی ڕامیاری. هەروەها، پاش مردنی ئەفلاتون خویندکارەکانی ئەفلاتون بۆچوونەکانی مامۆستاکەیان خستۆتە نێو قەوارەیەکی تەسکی دۆگماوە و

(33) هەمان سەرچاوە. ل. 317 – 318



بەپێچەوانەی ئەفلاتونەوە شوێن دایەلۆگ و بیرکردنەوەی بەرفراوان نەکەوتوون. ئەفلاتون نکۆڵی لە جیاوازی بۆچوون نەکردوە و دژی ڕانەوەستاوە. لەم قۆناخەدا ئیۆدۆکسیس، خوێندکاری ئەفلاتون، لە ماتماتیک و ئەستێرەناسیدا لیزان بووە، بەڵام باوەڕی بە مێتافیزیکی ئەفلاتون نەبووە. هیراکلایدسی پۆنتیۆس، خوێندکاریکی دیکەی ئەفلاتون، خۆی بە زانستی فیزیا و ئەستێرەناسی و ژیانی پاش مردن و شامەنیزمەوە ماندووکردووە. ئەفلاتون، وەکو مامۆستا و سەرۆکی ئەکادیمیا، بیرکردنەوەی خۆی بەسەر ئەم خوێندکارانەدا نەسەپاندووە و باوەڕی بە دۆگما لە پرۆسەی فێربووندا نەبووە. پاش مردنی ئەفلاتون سپیۆسیپۆس (خوشکەزای ئەفلاتون) دەبێت بە یەکەم سەرۆکی ئەکادیمیا. نوسینەکانی ئەم بیریارە بە ڕادەیەک لەسەر کێشەی مێتافیزیکی و ماتماتیکییە. بێجگە لە ئەفلاتون، پیتاگۆراسیش کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی فەلسەفی و نوسینەکانی. بەپێچەوانەی ئەفلاتونەوە وەکو پیتاگۆراسییەکانیش ژمارەی بە فۆرم و بنەڕەتی بوون داناوە. پاش سپیۆسیپۆس، لە ساڵی (339 پ ز) زینۆکراتسی چاڵیسیدۆن بە سەرۆکی ئەکادیمیا هەڵبژێردرا و نزیکەی بیست و پێنج ساڵ ئەکادیمیای بەڕێوەبردوە. بە دوا خوێندکاری ئەفلاتونیش دادەنرێت، کە ڕاستەوخۆ لای ئەفلاتون خوێندبێتی. پاش ئەم بە تایبەتی لە قۆناخی ناوەڕاستدا، سەرۆک و ئەندامانی ئەکادیمیا سەر بە نەوەی دووەمن لە پاش ئەفلاتونەوە و

ئەفلاتونیان نەدیوە. ئەم بیریارەش، وەکو سپێوسیپۆس، بە قووڵی ماتماتیک و میتافیزیکی خوێندوە و لە بۆچوونەکانی پیتاگۆراسەوە نزیک بووە. بۆماوەیەکیش وانەی لەسەر فەلسەفەی ئەپیکۆر و زینۆ (دامەزرێنەری فێرگەی ڕواقییەکان) پێشکەش کردوە.

**دووەم**، ئەکادیمیای ناوەڕاست لەگەڵ هاتنی ئەرکسیلاوس (316– 242 پ ز) وەکو سەرۆکی ئەکادیمیا دەستپێدەکات. لەم قۆناخەدا شوێنکەوتوانی ئەکادیمیا و فەلسەفەی ئەفلاتون توشی گومانکاری بوون. خویندکاران فێردەکران دڵنیایی لەسەر کێشە فەلسەفییەکان دەرنەبڕن و بڕیاردانەکانیان دوابخەن. بێگومان ئەم هەڵوێستە گومانکارییەش ڕەنگدانەوەی بارودۆخی ڕۆشنبیری و رامیاری سەردەمەکەیە. یۆنانییەکان پاش ئاشنابوونیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەی یۆنان بە تایبەتی فەلسەفە و زەخیرەی ڕۆشنبیری وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بەو ڕاستییە گەیشتن، کە یۆنانییەکان تەنیا نەتەوە نین بەدوای واتای ڕاستی و بنەڕەتی بووندا گەڕابن. ڕاستی و بنەڕەتی بوون ڕاڤەی جیاوازی بۆ کراوە. کەس ناتوانێت لە بۆچوونەکەی خۆی دڵنیابێت و بە بۆچوونێکی نەگۆڕ و ڕەهای دابنێت.

**سێیەم**، ئەکادیمیای نوێ لەگەڵ ئەرسێسیلایوس (315-230 پ ز) و کارنیادیس (214-129 پ ز) دەستپێدەکات. گومانکاری لەم قۆناخەدا



هەڵوێستێکی فەلسەفییانەی ئەکادیمیا بووە. بەڵام بەو شێوە توندڕەوییە نەبووە، کە لە قۆناخی ناوەڕاستدا پەیڕەوی کراوە. ئەم قۆناخە بە داخستنی ئەکادیمیا کۆتایی دێت.

شایەنی باسە داخستنی ئەکادیمیا لە لایەن ڕژێمی سیاسی ئایینی سەردەمەکەیەوە کۆتایی بە نەریتی فەلسەفی ئەفلاتون نەهێناوە. ئەفلاتون کاریگەرێتی خۆی بەردەوام بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی پاش خۆی تۆمارکردوە. هەندێک لە بیریارە ئایینییە مەسیحییەکانیش، کە سەر بە ڕژێمە ڕامیارییە ئایینییەکە بوون کەوتونەتە ژێر کاریگەرێتی ئەفلاتونەوە. ئەفلوتین، بۆ نموونە، یەکێکە لە بیریارە مەسیحییەکان نەریتێکی فەلسەفی بە ناوی ئەفلاتونیەتی نوێ دامەزراندوە. لە جیهانی ئیسلامیشدا لای بیریارانی، وەکو فارابی، ئیبن سینا، ئەبو باکر رازی، توسی و سوهرەوەردی کاریگەرێتییەکە ئاشکرا دەردەکەوێت.

# بەشی دووەم

## دایەلۆگەکانی ئەفلاتون

نوسراوەکانی ئەفلاتون، کە ژمارەیان سی و پێنج دایەلۆگ و سیانزە نامەیە، بە ئێمە گەیشتون. بێگومان لە کۆنەوە بۆ ساخکردنەوەی ئەم نوسراوانە، وەکو بەرهەمی ئەفلاتون و زادەی بیرکردنەوی ئەم فەیلەسوفە مشتومڕی لەسەر کراوە. بەگشتی ئەم سی و پێنج دایەلۆگانە و هەندێک لەو نامەنە (نەک هەموویان) بە بەرهەمی ئەفلاتون دادەنرێن. ئەفلاتون یەکەم فەیلەسوفە هەوڵیداوە بۆچوونە فەلسەفییەکانی لە شێوازی پەخشاندا بنوسێتەوە و بڵاویان بکاتەوە. لەپێش ئەودا بیریاران بۆچوونە فەلسەفییەکانیان زۆرتر لەژێر کاریگەرێتی نەریتی ئەدەبی هۆمیرۆس و هیزیۆدا بە شیعر نوسیوە. شیعرەکەی پارمەنیدس لەسەر سروشت یان شیعرەکانی ئیمپادۆکلیس نموونەی ئەو شێوازی نوسینەن. هەروەها چەند گوتەیەکی پیتاگۆراس و هیراکلیتس و هەندێک بیریارانی دیکەش جێماون بەڵام پەرتووکی فەلسەفییان بەدەست ئێمە نەگەیشتوە.

نوسینەکانی ئەفلاتون شێوازێکی دیاریکراو و تایبەتمەندی هەیە. ئەو شێوازی نوسینەش بە (دایەلۆگ) ناسراوە. دایەلۆگ چەمکێکی لێکدراوی یۆنانییە، کە واتای گفتوگۆ لەنێوان دوو کەسدا دەبەخشێت. زۆرینەی نوسراوەکانی ئەفلاتون گفتوگۆیە لەنێوان سوکرات و کەسێکی دیکەدا. هەندێک جار چەند کەسێکی دیکەش بەشداری گفتوگۆکەی دەکەن و پرسیار لە سوکرات دەکەن یان بۆچوونی خۆیان لەسەر کێشە فەلسەفییەکان دەردەخەن. لە چەند دایەلۆگێکدا، وەکو دایەلۆگی (پارمەنیدس) و (فیلیبوس)دا، کە ڕۆڵی سوکرات سەرەکی نیە، سوکرات پاڵەوانی دایەلۆگگێڕی نوسراوەکانی ئەفلاتونە. لە دوا نوسراوی ئەم فەیلەسوفەشدا بە ناوی (یاساکان) ڕۆڵی سوکرات بە تەواوی ون دەبێت و لەم دایەلۆگەدا ئامادە نیە. پێش ئەوەی باسی دایەلۆگەکان بکەین دوو پرسیاری گرنگ خۆیان دەسەپێنن؛ بۆچی سوکرات بووە بە پاڵەوانی دەیەلۆگەکان؟ بۆچی ئەفلاتون شێوازی دایەلۆگی بۆ نوسینەکانی بەکارهێناوە؟ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە پەیوەندی بە کاریگەرێتی سوکرات بەسەر بیرکردنەوەی ئەفلاتونەوە و بۆچوونی ئەفلاتون بۆ سوکرات هەیە. لەپێشتر ئەو خاڵەم ڕوونکردەوە، کە سوکرات یەکەم بیریارە کاریگەرێتییەکی قوڵی کردبێتە سەر ئەفلاتون و هاوڕێیەتی لە نێوانیاندا دروست بووە. دانانی سوکرات بە پاڵەوانی دایەلۆگەکان ڕەنگدانەوەی ئەم کاریگەرێتی و بەڵگەیەیە بۆ سەلماندنی. بێجگە لەمە، ئەفلاتون، بەو شێوەیەی لە نامەی حەوتەمییدا باسیدەکات، سوکرات مەزنترین و ڕەسەنترین بیریاری سەردەمەکەی بووە و لەو چاکتر کەسێکی دیکە نەبووە هۆشمەندانە مامەڵە لەگەڵ کێشە فەلسەفییەکاندا بکات.(34) ئایا مەبەستی ئەفلاتون لەم سازشکردنە بۆ سوکرات چییە؟

Plato, “Letter VII”, in *Plato: Complete Works*, p. 1647. (34)

وەکو دەزانین سەردەمی سوکرات پڕ ئاشوب و نەهامەتی و جەنگ و ڕووخانی بەها ڕەوشتییەکان و دەستەڵاتی ڕامیاری ئەسینا بووە. لەنێو ئەم بوحرانە هزری و ڕەوشتی و ئابووری و ڕامیارییانەوە سوکرات، وەکو بیریارێک ڕادەوەستێت و بوێرانە پرسیار سەبارەت ڕاستی بەها ڕەوشتی و ڕامیارییەکان و باوەڕە ئاینییەکان دەکات. ئەو دەیەوێت دەستەڵاتی پرسیارکردن بۆ لەناوبردنی ئەو بوحرانە و ڕووخاندنی بەها باوەکان بەکاربهێنێت و بیرکردنەوە لە مەکۆی ناڕەسەنی ڕزگار بکات. سەرەتایەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفییانە بخاتە گەڕ، کە تیایدا مرۆڤ بتوانێت پێناسێکی دروست و هەمەکی بۆ چەمکەکانی دابتاشێت. لەبەر ئەمەش، دەبینین لە ژیانی ڕۆژانەی سوکرات و گفتوگۆکردنی لەگەڵ لاوانی شارەکەیدا (پرسیاکردن) گالیسکەی مشتومڕەکانە و لە وێوە سوکرات هەوڵیداوە بیرکردنەوە بهەژێنێت و وەڵامەکان بدۆزێتەوە. لێرەدا، پرسیارکردن فەلسەفییانەیە، کە خەسڵەت و دەستەڵاتی خۆی هەیە و بیرکردنەوە ناتوانێت لەژێر ئەو دەستەڵاتەدا بەبێ هەژان خۆی ڕزگار بکات. ئەگەر من بپرسم؛ ئایا سبەینێ باران دەبارێت؟ مامەڵە لەگەڵ کێشەیەکی فەلسەفییدا ناکەم. پرسیاکردنەکەم کەسەکەی بەرانبەرم لە ئاستی وەڵامدانەوەکەدا بۆ ساتێک ڕادەوەستێنێت بەڵام نایهەژێنێت. وەڵامدانەوەکەشی بە ئەرێ یان نەرێ ئاڵۆز نیە و پرسیاری دیکە دروست ناکات. ئەگەر وەڵامەکە (ئەرێ) بێت من ناپرسم بۆچی



باراندەبارێت؟ چونکە ئەم پرسیارە پەیوەندی بە پرسیاری یەکەمەوە نیە و پێویستی بە وەڵامدانەوەیەکی زانستانە هەیە، کە من لە پرسیارکردنەکەمدا (ئایا سبەینێ باران دەبارێت؟) پێویستیم پیی نیە. من دەمەوێت بزانم باران دەبارێت یان نا، تاکو چەتر لەگەڵ خۆم هەڵگرم یان چوونەدەرەوە دوا بخەم و لە ماڵەوە دانیشم. پرسیارکردنی فەلسەفییانە سەبارەت کێشە گەورەکانە. ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە چوونە دەرەوەی من و چەتر هەڵگرتنەوە نیە، بەڵکو وابەستن بە واتای بوونەوە. وەڵامدانەوەشیان پرسیاری زۆرتر لە دوای خۆی دەهێنێتەکایەوە. یەکێک لەو پرسیارە فەلسەفییانەی سوکرات خۆی لەگەڵدا ماندووکردوە و بووە بە هەوێنی بەشی یەکەمی دایەلۆگی (کۆمار)ی ئەفلاتون سەبارەت دادوەرییە. ئایا دادوەری چییە؟ بڕوا ناکەم کەسێک هەبێت خاوەنی بیرکردنەوە بێت لە ئاستی ئەم پرسیارەدا سەرسام ڕانەوەستێت و بیرکردنەوەی نەهەژێت. پاش ئەوەی وەڵامەکەشمان بۆ مسۆگەر دەکات، ئێمە دەتوانین لەگەڵیا هاوڕا نەبین و بۆچوونەکەی بە ڕێگەی پرسیاکردنی زۆرترەوە هەڵوەشێنێنەوە. ئەم پرۆسەیە سوکرات بەکاریهێناوە و سەرەتای سەرهەڵدانی ڕێچکەی (ئێندەکشن) و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەیە لە فەلسەفەدا.

دەبینین، سوکرات ئەو بیریارە بووە پرسیاری سەبارەت واتای ڕاستی، دادوەری، چاکە، بەختەوەری و گەلێک چەمکی دیکە کردوە. هەمان

کات هەوڵی داتاشینی پێناسێکی نەگۆڕی بۆ داون، ویستویەتی سیستەمێکی بیرکردنەوەی فەلسەفی، بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندەکی و ڕێژەگەرایەتی سەفسەتییەکانەوە دابمەزرێنێت و بیکات بە بناخەیەکی هەمەکی بۆ بیرکردنەوە. سوکرات، بۆ ئەفلاتونی لاو، بیریارێکی بلیمەت و هیوایەک بووە بۆ خۆشکردنی زەمینەی هزری شارسیانیەتی سەردەمەکەی. بە کوشتنی سوکرات ئەو هیوایەش لەناوچووە. یۆنانییەکان تەنیا سوکراتیان نەکوشتوە، بەڵکو چرایەکی ڕووناکی بیرکردنەوەی فەلسەفییان کوژاندۆتەوە، کە ڕێگای بۆ چەندەها لاوی، وەکو ئەفلاتون ڕۆشن کردۆتەوە. مەرگی سوکرات تراجیدیایەکی هێندە گەورەبووە و ئەفلاتون بە درێژایی تەمەنی نەیتوانی لە بیر خۆی بباتەوە.

شێوازی نوسینی (دایەلۆگی) ئەفلاتونیش ڕەنگدانەوەی ژیانی فەلسەفییانەی سوکراتە. سوکرات ڕۆژانە لەگەڵ شاگردەکان و ئەوانەی هاتون بۆلای لەسەر کێشە فەلسەفییەکان لە مشتومڕدا بووە و کاتی بۆ نوسین نەبووە. ژیانی سوکرات و فەلسەفاندن لە یەکدی جیا ناکرێنەوە. ئەم بیریارە بەردەوام هەوڵیداوە بیرکردنەوەی فەلسەفی بهەژێنێت و بەرەو پێشەوەی بەرێت. ئەو ڕێچکەیەی، کە لە پرسیارکردنەوە دەستپێدەکات و بۆچوونی بەرانبەرەکەی دەخاتە بەر ڕۆشنایی ڕەخنەگرتن و هەڵوەشاندنەوە، تاکو بە وەڵامێکی گونجاو دەگات بە ڕێچکەی سوکرات ناسراوە.



یەکێک لەو لاوانەی لە سوکراتەوە نزیک بووە و هاوڕێیەتییەکەی لەگەڵدا گەرم بووە ئەفلاتون بووە. خۆشەویستی و هاوڕێیەتی ئەفلاتون بۆ سوکرات هێندە کاریگەرانە بووە، کە کوشتنی سوکرات لەلایەن ڕژێمەوە بۆتە هۆی نائومێدبوونێکی قوڵ و هاوکات دژوەستانی ئەفلاتون بەرانبەر دەستەڵات. هەروەها، بڕیاریش دەدات بۆچوونە فەلسەفییەکانی مامۆستاکەی بنوسێتەوە و نەمری بەو بیریارە مەزنە ببەخشێت. نوسین یەکێکە لەو ڕێگایانەی مرۆڤ تیایدا هەوڵی بەردەوامی و نەمری بە بوونی دەدات. لەم ڕووەوە هیچ خوێندکارێکی سوکرات ئەوەندەی ئەفلاتون خزمەتی مامۆستاکەی نەکردووە. لەم ڕوونکردنەوەیەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە ئەگەر ئەفلاتون بە دروستی لەسەر سوکرات بنوسێت، دەبێت باسی مشتومڕەکانی یان گفتوگۆکانیمان بۆ بکات، کە ئەم بیریارە لەشێوەی دایەلۆگدا ڕۆژانە بەکاریهێناوە. بەڵام بە دیدی من، ئەم ڕوونکردنەوەیە نیوەی وەڵامی پرسیارەکەمانی داوەتەوە، کە بۆچی ئەفلاتون شێوازی دایەلۆگی بۆ نوسینەکانی (بێجگە لە نامەکانی) بەکارهێناوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە تەوانای هونەری و نزیکی ئەفلاتون لە شیعرەوە ڕەچاو بکرێت. ئەو پێش ناسینی سوکرات و ئاشنابوونی بە بیرکردنەوەی فەلسەفی شاعیر و هەنەرمەندی شێوەکاریش بووە. شارەزایی لە نوسینی شانۆگەری تراجیدیی هەبووە. دەربڕینی شاعیرانەشی لە زۆرینەی دایەلۆگە سەرەتاییەکانیدا بەکارهێناوە.

ئەفلاتون یەکەم فەیلەسوفی سەردەمی کۆنی یۆنانییە سەرجەمی بەرهەمەکانی بە دەستی ئیمە گەیشتبن. بەڵام مشتومڕی زۆریش لەسەر ڕەسەنیەتی دایەلۆگاکان کراوە. تەنانەت هەندێک دایەلۆگ لە کۆندا بە نوسراوی ئەفلاتون دانراون کەچی ئەمڕۆ ناخرێنە نێو لیستی بەرهەمەکانی ئەم فەیلەسوفەوە. دیۆجنیس ناوی (دە) دایەلۆگی داوە، کە لە کۆندا گومانیان لێکراوە نوسراوی ئەفلاتون بووبێتن.(35) لەنێو ئەم لیستەی دیۆجنیسدا دایەلۆگەکانی (دیمۆدۆکیۆس، سیسیفیۆس، ئێریکسیاس و ئەلسیۆن) ئەمڕۆ بە دایەلۆگی ئەفلاتون دادەنرێن. هەروەها دوو دایەلۆگی دیکەش، کە لە لیستەکەی دیۆجنیسدا نین بە ناوی (لەسەر دادوەری و لەسەر چاکە) ئەمڕۆ گومان لەڕەسەنییەتیان دەکرێت.(36) پرۆکلیس نەک تەنیا گومان لە دایەلۆگی (ئەپینۆمیس) و نامەکان دەکات، تەنانەت (کۆمار) و (یاساکان) یش بە نوسراوی ئەفلاتون دانانێت. مامۆستا تایلەر لەو باوەڕەدایە، دایەلۆگی (ئەلسیبیسدیسی یەکەم) خوێندکارێکی نزیکی ئەفلاتون نوسیبێتی.(37) بەکورتییەکەی، تاکو ئەمڕۆ گومان لەوە دەکرێت ئەم شەش بەرهەمانە (ئەلسیبیسدیسی یەکەم، ئیۆن، مێنیکسینۆس، هیپیاسی بچوک، ئێۆینۆمیس و نامەکان) نوسراوەی ئەفلاتون بن. بیروڕای جیاوازیش لەسەر ڕەسەنیەتی نامەکان هەن.نامەی شەشەم و

(35) Diogenes, Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3: 56-60, p. 329.
(36) W.K.C. Guthrie, *A History of Greek Philosophy*, vol. IV, Cambridge: Cambridge University Press, 2005. P. 39.
(37) A.E.Taylor, *Plato: The Man and his Work*, p. 13.



حەوتەم و هەشتەم بە بەرهەمی ئەفلاتون دادەنرێن و مێژوونوسان گومان لە نامەکانی دیکە دەکەن. بە دیدی مامۆستا تایلەریش، مادام گومان لە ڕەسەنیەتی ئەو سێ نامەیە ناکرێت، ئەوا نامەکانی دیکەش دەبێت بە ڕەسەن دابنرێن.(38)

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ناکۆکی لەنێوان ناوەڕۆکی نامەکاندا. ئەگەر ئەفلاتونیش ئەو نامانەی نەنوسیبێت کەسێکی دیکە، کە زۆر لە ئەفلاتونەوە نزیک بووە یان ئاگای لە ژیانی بووە نامەکانی نوسیوە چونکە زانیارییەکی زۆر و گرنگ لە بارەی ژیانی ئەفلاتونەوە بە ئێمە دەگەیەنن. تێگەیشتن لە دایەلۆگەکانی ئەفلاتون دژوار نیە و ئاسانە. ئەمەش پەیوەندی بەدوو هۆکارەوە هەیە:

**یەکەم**، ئەفلاتون شێوازێکی هونەری بۆ نوسینەکانی بەکارهێناوە و کێشە فەلسەفییەکانی لە ڕێگەی دایەلۆگی نێوان چەند کەسێکەوە دەربڕیوە. خوێنەر ماندوو ناکات، بەڵکو هانی دەدات چێژی لێوەرگرێت و بە ئاکامی گفتوگۆکەی نێو دایەلۆگەکە بگات و وەڵامی پرسیارەکانی دەست بکەوێت.

**دووەم**، ئەفلاتون دایەلۆگەکانی بۆ جەماوەر بە زمانێکی سادەتر لە زمانی وانەگوتنەوەکانی نوسیوە. زمانی وانەکانی لە زمانی دایەلۆگەکانی جیاوازتر بووە و تەنیا بۆ خوێندکارەکانی بووە، کە شارەزاییان لە فەلسەفە و زمانی فەلسەفیدا هەبووە.

(38) هەمان سەرچاوە.

ئەفلاتون وانەکانی نەنوسیوەتەوە و ئێمەش دەقی وانەکانمان لەبەردەستدا نیە .نازانین تاکو چ ڕادەیەک ناوەڕۆکی وانەکانی لەگەڵ دایەلۆگەکاندا جیاواز یان کۆکن. بەڵام بەگوێرەی ئەوەی خوێندکارەکانی، بەتایبەتی ئەریستۆ، ئاماژەی بۆ جیاوازی ناوەڕۆکی وانەکان و دایەلۆگەکان نەکردوە، ئێمەش بەو ئاکامە دەگەین، کە وانەکان و دایەلۆگەکانی ئەفلاتون خاوەنی یەکێتییەکی هزرین و ناکۆکی ناخەنە نێو بیرکردنەوەی ئەم فەیلەسوفەوە. هۆی مانەوە و نەفەوتانی نوسراوەکانیشی بۆ ڕۆڵی ئەکادیمیا و خوێندکارەکانی دەگەڕێتەوە. لە سەرەتاوە پەرتووکخانەیەک لەنێو ئەکادیمیا دروستکراوە و نوسراو و بڵاوکراوەکانی ئەفلاتونیش لەوێ دانراون. دوای مردنی ئەفلاتونیش نوسراوەکانی پارێزراون و خوێندکاران سودیان لێوەرگرتوە. هەروەها، کۆپی ئەم نوسراوانەش بۆ پەرتووکخانەی شاری ئەسکەندەرییە لە میسر گوێزراونەتەوە.(39)

ئەمەش دەردەخات، ئەفلاتون لە ئەسینا، بەپێچەوانەی ئەریستۆوە، دوژمنی بۆ خۆی دروست نەکردوە. دەستەڵاتی ڕامیاری سەردەمەکەی هەوڵی داخستنی ئەکادیمیای نەداوە یان پاش مردنی ئەفلاتون خوێندکارەکانی لەگەڵ دەستەڵاتدا توشی کێشە نەبوون.

بەڵام بارودۆخی ڕامیاری بۆ ئەریستۆ و بەردەوام بوونی لە فێرگە فەلسەفییەکەیدا پاش مردنی ئەسکەندەری مەکەدۆنی گۆڕا. نەیارەکانی ئەسکەندەر ئەریستۆشیان بە دوژمنی خۆیان و ڕژێمەکەیان

(39) W.K.C.Guthrie, *A History of Greek Philosophy*, vol. II, p. 39.



دانا. ئەمەش ئەریستۆی ناچارکرد ڕابکات و نوسراوەکانیشی بشارنەوە.(40)

پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە، دێینە سەر گرفتی ڕیزکردنی دایەلۆگەکان بەگوێرەی کات. پێویستە بزانین دایەلۆگەکانی چۆن ڕیز دەکرێن. بێگومان، ئەگەر ئەفلاتون کاتی نوسینی دایەلۆگەکانی دیارییکردایە ئێمە توشی ئەم کێشەیە نەدەبووین. بەڵام ئەم کارەی نەکردووە و گرفتی بۆ مێژوونوسانی فەلسەفە و ئەفلاتون ناسان دروست کردوە. دەشێ ئەو پرسیارەش لە خۆمان بکەین، کە بۆچی ئامادەکردنی لیستی دایەلۆگەکان بەگوێرەی کات گرنگە؟ ئامادەکردنی ئەم لیستە بەگوێرەی کات بۆ تێگەیشتنمان لە گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتون پێویستە. ئەگەر دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتا و دوایی ئەفلاتون بدۆزینەوە بە ئاسانی لە ڕەوتی پێشکەوتنی بیروباوەڕی ئەم فەیلەسوفەش دەگەین. لە کۆنەوە، واتە لە سەردەمی پێش زایینییەوە و پاش مردنی ئەفلاتونەوە، دوو لیستی نوسراوەکانی ئەفلاتون دانراون، بەڵام ئاماژەیان بۆ ڕیزکردنی دایەلۆگەکان بەگوێرەی کاتی نوسینیان نەکراوە. لە لیستی یەکەمدا تەنیا ناوی چواردە دایەلۆگ و نامەکانی ئەفلاتون (سیانزە نامە) هێنراوە. ئەم لیستە بیریار و زمانناس و ڕەخنەگرێک بە ناوی

(40) من لەپێشەکی پەرتووکە وەرگێڕاوەکەی ئەریستۆ (میتافیزیک)باسی ئەم ڕووداوەم کردوە. بڕوانە: ئەریستۆ، میتافیزیک، دەستگای چاپی سەردەم، سلێمانی لاپەڕە 10.

ئەریستۆفانی بیزەنتی (257–180پ ز) لە شاری ئەسکەندەرییە ئامادەی کردوە. ئەریستۆفان نوسراوەکانی ئەفلاتونی بەسەر پێنج گروپدا دابەش کردووە و لە هەر گروپێکدا سێ دایەلۆگی داناوە. لەبەر ئەم هۆیە لیستەکەی ئەریستۆفان بە (تریلۆجی) ناوزەد دەکرێت. تریلۆجی چەمکێکی لێکدراوی یۆنانییە، بەو نوسراوە یان گوتارە دەوترێت، کە سێ بەشی هەیە. ئەم لیستەی ئەریستۆفان بەم شێوەیە دانراوە:

**تریلۆجی یەکەم:** دایەلۆگەکانی کۆمار، تیمایۆس و کرایتیاسی تێدایە.

**تریلۆجی دووەم:** سۆفست، سیاسەتمەدار و کراتیلۆس .

**تریلۆجی سێیە:** یاساکان، مینۆس و ئێپینۆمیس.

**تریلۆجی چوارەم:** تیاتیۆتۆس، ئیۆسیفرۆ و ئەپۆلۆجی.

**تریلۆجی پێنجەم:** کریتۆ، فیدۆ و لەنامەکانی ئەفلاتون پێکهاتووە.(41) وادەردەکەوێت ڕیزکردنی دایەلۆگەکان لەنێو ئەم سیستەمە تریلۆجییەدا پەیوەندی بە ناوەڕۆکی دایەلۆگەکانەوە، نەک کاتی نوسینیانەوە هەتە چونکە دایەلۆگی کۆمار، کە یەکەم نوسراوە لەم لیستەدا، یەکەم بەرهەمی ئەفلاتون نیە. بەڵام لەگەڵ ڕیزکردنیان بەگوێرەی ناوەڕۆکیشیان لە کێشە بەدەر نیە. دایەلۆگەکانی تریلۆجی یەکەم و چوارەم خاوەنی ناوەڕۆکی جیاوازن. بۆ نموونە دایەلۆگی کۆمار، ڕامیاری و تیمایۆس لەسەر سروشت و کریتیاسیش مامەڵە لەگەڵ ڕەوشتدا دەکات.

Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:61-62, p. 33. (41)



ڕێکەوتن لەسەر ناوەڕۆک تەنیا لە تریلۆجی دووەم و سێیەمدا دەدۆزرێتەوە لیستی دووەمی نوسراوەکانی ئەفلاتون تراسیلۆس دوو سەدە پاش ئەریسیۆفان لە ئەسکەندەرییە ئامادەی کردووە. تراسیلۆس ئەستێرەناسی کۆشکی ئیمپراتۆر تیبەریۆس بووە، کە لە ساڵی 14 تاکو 37 ی زایینی فەرمانڕەوایی کردووە. ئەم بیریارە یەکێک لە شوێنکەوتوانی ئەفلاتونییەتی نوێ بووە. لیستی تراسیلۆس لە لیستی تریلۆجی ئەریستۆفانەوە جیاوازە. ئەم بیریارە (سی وپێنج) دایەلۆگی لەنێو (نۆ) گروپدا داناوە. هەر یەکێک لەو گروپانە چوار دایەلۆگی تێدایە. بەم دابەشکردنەش دەگوترێت (تیترالۆجی)، کە چەمکێکی یۆنانییە و بەو نوسراوە یان گوتارە دادەنرێت لە چوار بەش پێکهاتبێت. لیستەکەی تراسیلۆس بەم جۆرەیە:

**تیترالۆجی یەکەم:** ئیۆتیفرۆ (لەسەر پیرۆزی)، ئەپۆلۆجی (لەسەر ڕەوشت)، کریتۆ (لەسەر ڕەوشت)و فیدۆ (لەسەر بوونی دەروون).

**تیترالۆجی دووەم:** کراتیلۆس (لەسەر چەمک و ناوەکان)، تیاتیتۆس (لەسەر زانین)، سۆفست (لەسەر بوون) و سیاسەتمەدار (لەسەر دەوڵەت).

**تیترالۆجی سێیەم:** پارمەنیدس (لەسەر بیرەکان)، فیلەبوس (لەسەر چێژ)، سەمپۆزییەم (لەسەر چاکە) و فیدرۆس (لەسەر خۆشەویستی).

**تیترالۆجی چوارەم:** ئەلسیبیادیس (لەسەر سروشتی مرۆڤ)، ئەلسیبیادیس (لەسەر نوێژکردن)، هیپارکۆس (لەسەر حەز لەدەستکەوت) و ئیراستای (لەسەر فەلسەفە).

**تیترالۆجی پێنجەم:** تیەگس (لەسەر فەلسەفە)، چارمەدیس (لەسەر مامناوەندێتی)، لاکیس (لەسەر ئازایەتی) ولیسس (لەسەر هاوڕێیەتی).

**تیترالۆجی شەشەم:** ئیۆتیدیمۆس (لەسەر گفتوگۆکردن)،پرۆتاگۆراس (لەسەر سۆفستەکان)، جۆرجیاس (لەسەر ڕەوانبێژی) و مینۆ (لەسەر چاکەکردن).

**تیترالۆجی حەوتەم:** هیپیاسی گەورە (لەسەر جوانی)، هیپیاسی بچوک (لەسەر ساختە یان نادروستی)، ئیۆن (لەسەر چیرۆکی ئیلیاد)و مینەکسینۆس (لەسەر گوتاری ناوپرسە).

**تیترالۆجی هەشتەم:** کلیتۆپلۆن (لەسەر ڕەوشت)، کۆمار (لەسەر دادوەری)، تیمایۆس (لەسەر سروشت) و کریتیاس (لەسەر ڕەوشت).

**تیترالۆجی نۆیەم:** مینۆس (لەسەر یاسا)، یاساکان (لەسەر یاساسازی)، ئێپینۆمیس (لەسەرفەیلەسوف)و دواجاریش نامەکانی



ئەفلاتون.(42) جیاوازییەکی گەورە لە ژمارەی جیاوازییەکی گەورە لە ژمارەی دایەلۆگەکان لەنێو ئەم دوو لیستەدا هەیە. بەڵام وەکو لەپێشتر ئاماژەم بۆکرد، ئەم لیستانە دایەلۆگەکانیان بەگوێرەی کات ڕیزنەکردووە. ئایا ئێمە چۆن بتوانین لیستێک بەگوێرەی کاتی نوسینی دایەلۆگەکان دروستبکەین؟ پسپۆڕانی فەلسەفەی ئەفلاتون هەوڵیان داوە چەند پێوەرێک بۆ ئەم مەبەستە بەکاربهێنن، کەلێرەدا دەمەوێت باسیان بکەم. یەکێک لە پێوەرەکان پەیوەندی بەشێوازی زمان و نوسینەوە هەیە، کە هەموو نوسەرێک بەردەوام هەوڵی گۆڕان و پێشخستنی دەدات. ئەگەر دوو دیوانی شێرکۆ بێکەس، بۆ نموونە (تریفەی هەڵبەست) و (دەربەندی پەپوولە) بەراورد بکەین بە مەرجێک نەزانین ئەو شاعیرە، کام کۆمەڵە شیعری پێشتر نوسیوە، بە ڕێگەی زمان و شێوازی دەربڕینەکەیەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە شاعیر دەربەندی پەپوولەی پاش تریفەی هەڵبەست نوسیوە. ئەمەش بۆ زمان و شێوازی نوسینی شیعرەکانی دەربەندی پەپوولە دەگەڕێتەوە؛ پەیوەندی بە چەمکەکان و بەکارهێنانیان و تەوانای دەربڕینی شاعیرەوە لە تابلۆ هونەرییەکانیدا هەیە. هەمان شێوە، دەتوانین شێوازی زمان و نوسینی ئەفلاتون لە دایەلۆگەکاندا هەڵسەنگێنین تاکو بزانین کام دایەلۆگ پێش یان پاش بخەین. بە دیدی مامۆستا تایلەر، ناکرێت دایەلۆگی (پرۆتاگۆراس) لەبەر شێوازی زمان و جوانی دەربڕینی کێشە

(42) هەمان سەرچاوەی پێشو. 310 – 328، 60 – 57 : 3.

فەلسەفییەکان بە یەکێک لە نوسراوەکانی قۆناخی سەرەتایی ئەفلاتون دابنرێت.(43) هەندێک لە بیریارانی سەدەی نۆزدەهەم لەگەڵ بۆچوونەکەی مامۆستا تایلەردا هاوڕا نین. ئەوان لەو باوەڕەدان ئەفلاتون لە تەمەنی لاوێتیدا، دوو ساڵ پاش ئاشنابوونی بە سوکرات ئەم دایەلۆگەی نوسیوە. بەڵام مەحاڵە دایەلۆگێکی نایابی وەکو (پرۆتاگۆراس)بەرهەمی تەمەنی لاوێتی ئەفلاتون بێت. لە لایەکی دیکەوە، هەندێک لەو باوەڕەدان، کەمادامەکی دایەلۆگی (فیدرۆس) مامەڵە لەگەڵ کێشەی لاوێتی و خۆشەویستیدا دەکات، ئەوا ئەفلاتون لەسەردەمی لاوێتیدا نوسیویەتی. شلایەرماخەر دایەلۆگی (پارمەنیدس) یش بەیەکێک لە نوسراوە سەرەتاییەکانی ئەفلاتون دادەنێت.(44) دەربڕینی هونەری یان شیعری پێوەرێکی دیکەی هەڵسەنگاندنی نوسراوەکانی ئەفلاتونە. ئەم بیریارە لە تەمەنی لاوێتیدا شاعیر بووە. ئەمەش کاریگەرێتی بەسەر دایەلۆگەکانییەوە جێهێشتوە، بەتایبەتی دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی، کە لە زۆر شوێندا دەربڕینی بۆچوونە فەلسەفییەکانی شاعیرانەیە. ئەم شێوازی دەربڕینە لەگەڵ تەمەنی ئەفلاتوندا کاڵ دەبێتەوە و لە دایەلۆگەکانی دوا تەمەنیدا بەکارنەهێنراوە. لەبەر ئەمەشە، دیۆجنیس دایەلۆگی (فیدرۆس) بە نوسراوێکی سەردەمی لاوێتی ئەفلاتون دادەنێت.(45)

لە دایەلۆگەکانی، وەکو (کۆمار) و (یاساکان) دا ئەفلاتون زمانێکی

(43) A.E.Taylor, *Plato: The Man and His Work*, p. 2.

(44) W.K.C. Guthrie, *A History of Greek Philosophy*, vol. IV, p. 4.

(45) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 3:38, p. 311.



فەلسەفی ڕەوان، نەک شاعیرانەی بۆ دەربڕینی بۆچوونەکانی بەکارهێناوە. ئەمەش بەوخاڵەمان دەگەیەنێت، کە ئەم دوو دایەلۆگە ناخرێنە نێو نوسراوەکانی تەمەنی لاوێتی ئەم فەیلەسوفەوە. پێوەرێکی دیکە وابەستە بە کەسایەتی و ڕووداوەکانی نێو دایەلۆگەکانەوە. لە دایەلۆگی (فیدۆ)دا، ئاماژە بۆ مردنی سوکرات کراوە، کەوابوو ئەم دایەلۆگە پاش مردنی سوکرات نوسراوە. بەڵام هێشتا نازانین چەند ساڵ پاش مردنی سوکرات کەوتۆتە بەر ڕۆشنایی بوونەوە. کەم و کورتی ئەم پێوەرە لەوەدایە بەسەر هەموو دایەلۆگەکاندا ناسەپینرێت چونکە هەموو دایەلۆگێک ئاماژە بۆ کەسایەتی یان ڕووداوەکان ناکات. پێوەرێکی دیکەشمان هەیە،کەپەیوەندی بە ئاماژە کردنی دایەلۆگەکان لەنێو خۆیاندا هەیە. هەندێک دایەلۆگ ئاماژە بۆ دایەلۆگێکی دیکە دەکات. بۆ نموونە، ئەگەر دایەلۆگی (ئەلف) ئاماژە بۆ دایەلۆگی (با) بکات، بەو ئاکامە دەگەین، کە دایەلۆگی (با) پێش دایەلۆگی (ئەلف) نوسراوە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (تیمایۆس) دا ئاماژە بۆ دایەلۆگی (کۆمار) دەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە دایەلۆگی (کۆمار)پێش دایەلۆگی (تیمایۆس) نوسراوە.

پێوەرێکی دیکە پەیوەندی بە شێوازی دەربڕینی بۆچوونە فەلسەفییەکان یان بیردۆزەکانەوە هەیە. ئەگەر بیریارێک لە نوسراوەێکیدا بە درێژی باسی بۆچوونێکی فەلسەفی خۆی بکات و

بەڵگەی بۆ دابمەزرێنێت، دەشێ لە نوسراوێکی دیکەدا بە درێژی باسی نەکاتەوە یان تەنیا ئاماژەی بۆ بکات. ئەمەش بەو خاڵەمان دەگەیەنێت، کە باسکردنە کورتەکە یان ئاماژە بۆ کردنی لەم نوسراوەدا پاش نوسراوی یەکەمی دەکەوێت. بێگومان ئەم پێوەرەش لە کەموکورتی بێبەش نیە.

ئەگەر بەم پێوەرە پشت ئەستور بین ئەوا دەبێت دایەلۆگەکانی، وەکو (تیاتیتۆس، سۆفست، پۆلتیکۆس و پارمەنیدس) پێش (فیدۆ و کۆمار) دابنرێن کەچی ئەم دایەلۆگانە بەم جۆرە ڕیزنەکراون. هەروەها دەگونجێت بیریارێک لە نوسراوی یەکەمیدا بە کورتی لەسەر بۆچوونێکی خۆی بدوێت و لە نوسراوێکی دیکەدا بە درێژی باسی بکات. پاش دانان و بەکارهێنانی ئەم پێوەرانە، پسپۆران و مێژوونوسانی فەلسەفە دایەلۆگەکانی ئەفلاتونیان لەنێو سێ گروپدا داناوە، کە پەیوەندییان بە گەشەکردن و تەمەنی ئەفلاتونەوە هەیە و بە ڕیزکردنی دایەلۆگەکان بەگوێرەی کات ناوزەدی دەکەین.

دابەشکردنەکەش بەسەر سێ گروپدا بەم جۆرەیە:

**یەکەم**، دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی.

**دووەم**، دایەلۆگەکانی قۆناخی گواستنەوە.

**سێیەم**، دایەلۆگەکانی قۆناخی دوایی.

کۆڕن فۆرد بیست و حەوت دایەلۆگی بەسەر ئەم سێ قۆناخەدا دابەشکردووە. یانزە دایەلۆگی لە قۆناخی سەرەتایی و هەشت



دایەلۆگی لە قۆناخی گواستنەوە و هەشت دایەلۆگیش لە قۆناخی دوایی داناوە.(46) گریگۆری ڤلاستۆس لە لیستەکەیدا بیست و هەشت دایەلۆگی ڕیزکردووە؛ پانزە دایەلۆگی لە قۆناخی سەرەتایی و حەوت دایەلۆگی لە قۆناغی گواستنەوە و شەش دایەلۆگی خستۆتە قۆناخی دواییەوە. ڕیچارد کراوت بەهەمان شێوە،وەکو ڤلاستۆس بیست و هەشت دایەلۆگی لە لیستەکەیدا داناوە. بەڵام گیرارد لیگەر(سی) دایەلۆگ و سیانزە نامەی ئەفلاتونی بەسەر ئەم قۆناخانەدا بەم جۆرەی خوارەوە دابەش کردووە. ئەمڕۆ کۆی بەرهەمەکانی ئەفلاتونیش لە بەرگێکی گەورەدا، کە مامۆستا جۆن کوپەر پۆڵێنی کردووە، سی و پێنج دایەلۆگ و سیانزە نامەی ئەفلاتونی تێدایە.

لیستی گیرارد لیگەر:

**قۆناخی سەرەتایی:** لیسس، ئیۆسیفرۆ، ئیۆن، هیپیاسی بچوک، هیپاسی گەورە ئەلسیبیسدیس، تیاگیس، کریتۆ، جۆرجیاس، مینێکسینۆس مینۆ، چارمەدیس، ئەپۆلۆجی، لاچیس و پرۆتاگۆراس.

**قۆناخی گواستنەوە:** ئیۆسیدیمۆس، سەمپۆزیەم، کراتیلۆس، کۆمار، پارمەنیدس، تیاتیتۆس، فیدرۆس و نامەی سیانزەهەمی ئەفلاتون.

**قۆناخی دوایی:** فیلەبوس، کلیتۆفان، سۆفست، پۆلەتیکۆس، یاساکان، ئیپینپۆمیس، تیماوس، کریتیاس و

W.K.C. Guthrie, *A History of Greek Philosophy*, vol. IV, p. 50. (46)

نامەی سێیەم و حەوتەم و هەشتەمی ئەفلاتون.(47)

پاش باسکردنی پێوەرەکان بۆ ڕیزکردنی دایەلۆگەکان بەگوێرەی کاتی نوسینیان بەو ئاکامەش دەگەین، کە دایەلۆگەکانی نێو ئەم سێ قۆناخە جیاوازانە لە چەند لایەنێکەوە لە یەکدی جیادەکرێنەوە. بێجگە لەوەی شێوازی نوسین و زمان و دەربڕینیان جیاوازی تێدایە لە ڕووی ناوەڕۆکی فەلسەفی و ڕۆڵی سوکراتەوە، کە پاڵەوانی دایەلۆگەکانە جیاوازییەکان ئاشکرا دەبینرێن. دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی جەخت لەسەر کێشە ڕەوشتییەکان دەکەن. سوکرات تیایاندا ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکی دەبینێت. ئەفلاتون باسی بۆچوونەکانی سوکرات دەکات، کە ڕۆژانە لەگەڵ خوێندکار و نایارەکانیدا لە بازاڕدا مشتومڕی لەسەرکردوون. ئێمە بەخوێندنەوەی ئەم دایەلۆگانە لەگەڵ بیرکردنەوەی فەلسەفی سوکرات نەک ئەفلاتون ئاشنا دەبین. لە قۆناخی گواستنەوەدا گۆڕانکاری سەرهەڵدەدات. هەرچەندە پاڵەوانی ئەم دایەلۆگانە سوکراتە، بەڵام بۆچوون و بیرکردنەوە فەلسەفییەکانی ئەفلاتون لە ڕێگەی ئەم پاڵەوانەوە بەرجەستە بوون. زۆرینەی دایەلۆگەکانی ئەم قۆناخەش ناوەڕۆکێکی میتافیزیکیان هەیە. ئەم بۆچوونانە بەتەواوی لە دایەلۆگەکانی قۆناخی سێیەمدا ئاشکرا دیارن. ئەفلاتون لەم قۆناخەدا سیستەمێکی فەلسەفی و ئۆنتۆلۆجی و ئەپستمۆلۆجییەکی نوێمان بۆ دادەمەزرێنێت، کە تیایدا بۆچوونە

See: Debera Nails, "The Early Middle Late Consensus: (47) How Deep? How Broad?" in *Plato's Critical Assessment*, vol.1, (ed.) Nicolas D. Smith, London: Routledge, 1998. Pp. 168-9.



ڕامیارییەکانی و بیروڕای لەسەر کێشەی دادوەری و یاساسازیش دەردەبڕێت و ڕۆڵی سوکراتیش کەمتر دەبێتەوە. بێجگە لە دایەلۆگی (فیلەبوس)، سوکرات لەنێو ئەم دایەلۆگانەدا ڕۆڵی سەرەکی نیە. هەروەها، لە دوا دایەلۆگی ئەفلاتوندا بە ناوی (یاساکان) ناوی سوکرات نەهێنراوە و هیچ ڕۆڵێکی بۆ دانەنراوە.

## گەشتێک بە نێو دایەلۆگەکانی ئەفلاتوندا

بەگوێرەی دابەشکردن و ڕیزکردنی نوسراوەکانی ئەفلاتون لەنێو سێ قۆناخی جیاوازدا ئێمەش لەم بەشەدا لەو دایەلۆگانەوە دەست بە گەشتەکەمان دەکەین، کە لە قۆناخی سەرەتاییدا دادەنرێن. هەموو ئەم دایەلۆگانەی لەم قۆناخەدا نوسراون لە بۆچوونە فەلسەفییەکانی سوکرات نەک ئەفلاتون دەدوێن و زۆرینەی پاڵەوان و ڕووداوەکانیشی ڕاستەقینەن.

### (ئیوتیفرۆ)

لەم دایەلۆگەدا سوکرات لە (ئەگۆرا) یان ناوبازاڕی شاری ئەسینایە و بەرەو دادگا دەڕوات. چەند کەسێک تاوانباریان کردووە بەوەی باوەڕی بە خواکانی کۆنی یۆنان نیە و بیری لاوانیش گەندەڵ دەکات. لە بەردەم دادگادا ئیوتیفرۆ دەبینێت، کە ئەویش دژی باوکی، لەسەر ئەوەی کۆیلەیەکی خۆی کوشتوە دەچێتە دادگا. سوکرات و ئیوتیفرۆ

لەسەر واتا و پێناسەکردنی چەمکی (بەزەیی) دەکەونە گفتوگۆ. لەم گفتوگۆیەدا سوکرات بەردەوام پرسیار سەبارەت واتای بەزەیی لە ئیوتیفرۆ دەکات و ئەویش وەڵامیان دەداتەوە. بەڵام سوکرات وەڵامەکە بە بەڵگە و سەلماندنەوە ڕەتدەداتەوە و داوای وەڵامێکی چاکتری لێدەکات. مەبەستی سوکرات لەم مشتومڕە، کە لە هەموو دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی ئەفلاتوندا دەبینرێت، گەیشتنە بە پێناسەیەکی هەمەکی ئەو چەمکانەی مشتومڕیان لەسەر دەکات. لە کۆتاییشدا بەبێ ئامادەکردنی ئەو پێناسەیە دایەلۆگەکە تەواو دەبێت و خوێنەر ناگاتە ئاکام و لەنێو بیرکردنەوە و گەڕان بە دوای پێناسەی چەمکەکەدا جێدەمێنێت. لە ڕووی ڕیزکردنی کاتییەوە بۆ دایەلۆگەکان، ئەم دایەلۆگە دەبێ لە پێش دادگایی کردن و مردنی سوکرات دابنرێت.

**(ئەپۆلۆجی)**

ئەپۆلۆجی ناوی یەکێکە لە دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی و لە وشەی یۆنانی (ئەپۆلۆجیا)وە هاتووە، کە واتای بەخشین یان لێبوردن دەگەیەنێت. ئەم دایەلۆگە باسی دادگاییکردنی سوکرات لەسەر ئەو تاوانانەی پێشتر باسمانکردن، دەکات. سوکرات بەرگری لە بیروباوەڕەکانی دەکات و داوای بەخشین و لێبوردن ناکات. ئەمەش لە کۆتایی دادگاکردنەکەدا دەردەکەوێت، کە سوکرات مردن نەک بەخشین هەڵدەبژێرێت.



بەشێکی گەورەی ئەم دایەلۆگە گوتە و بەرگریکردنەکەی سوکراتی تێدایە و لە بەشێکی کەمیدا نوسراوەکە شێوازی دایەلۆگی وەرگرتوە. لەم دایەلۆگەدا سوکرات بەرانبەر 501 ئەندامی دادگای گشتی ڕاوەستاوە و بەرگری لە خۆی دەکات. هەوڵدەدات بیسەلمێنێت، کە ئەو فەلسەفەیەی سوکرات لاوەکانی پێ پەروەردە دەکات ڕێگەی تێگەیشتنە لە واتای چاکە و دروستکردنی کەسانی چاک لەنێو کۆمەڵدا. خواکانیش ئەوەندەیان لە مرۆڤ دەوێت. بەڵام ئەندامانی دادگاکە سوردەبن لەسەر دەمکوتکردنی ئەم فەیلەسەفە و لە کۆتاییدا فەرمانی کوشتنی دەردەکەن. بێگومان، ئەم دایەلۆگە دەقاودەقی بەرگریکردنەکەی سوکرات نیە چونکە سوکرات بەرگریکردنەکەی بە نوسراو بۆ دادگادا ئامادەنەکردووە. ئەوەی لەم دایەلۆگەدا نوسراوە بەستراوە بە بیرەوەری ئەفلاتون و ئامادەبوونی لە دادگایکردنی مامۆستاکەی. مێژوونوسانیش گومان لە ڕاستگۆیی ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا ناکەن.

**(فیدۆ)**

ئەم دایەلۆگە باسی دوا کاتی سوکرات لە زینداندا پێش خواردنەوەی زەهرەکە بە فەرمانی دەستەڵات دەکات. لە کۆنەوە بە دایەلۆگی ئەفلاتون لەسەر بوونی دەروون ناسراوە. فیدۆش یەکێکە لە خوێندکارەکانی سوکرات و پاش مردنی مامۆستاکەی بۆ شاری (ئیلس)

دەڕوات. لەو شارەدا چەند بیریارێکی سەر بە فێرگەی پیتاگۆراس دەبینێت و باسی گفتوگۆی سوکرات لە ساتەکانی پێش مردنی لەسەر پاکردنەوەی دەروون و نەمری ئەم بەشەی بوونی مرۆڤیان بۆ دەکات. ئەم باسەش بۆ پیتاگۆراسییەکان نوێ نیە. ئەوانیش، وەکو سوکرات مرۆڤیان بە لەش و دەروون داناوە. لەو باوەڕەدابوون دەروون لەناوناچێت و پاش مردن یان دەرچوونی لەنێو لەشدا ڕوو لە جیهانێکی دیکە دەکات یان لەبەر گوناهەکانی و خۆپاکنەکردنەوەی بۆ سەر ئەم ئەستێرەیە لە فۆرمی زیندەوەرێکی دیکەدا دەگەڕێتەوە. بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی لەم سوڕانەوەیە ڕزگار بکات پێویستە بە دەروونێکی پاکەوە بمرێت و خۆی بە خۆشی و ئارەزووەکانی لەشییەوە نەبەستێتەوە. ئەفلاتون لە دوا ساتەکانی ژیانی سوکراتدا لە زیندان ئامادەنەبووە. فیدۆ باسیدەکات، کە ئەفلاتون لەبەر نەخۆشی نەیتوانیوە ماڵ ئاوایی لە مامۆستاکەی بکات. کۆتایی ئەم دایەلۆگەش، وەکو لە دایەلۆگی جۆرجیاس و کۆماریشدا دەیبینین، بە چیرۆکێکی نێو ئەفسانەکانی یۆنان دێت.

**(کریتۆ)**

فەرمانی کوشتنی سوکرات پاش مانگێک جێبەجێ کراوە. ئەو مانگە سوکرات لە زینداندا ماوەتەوە و خوێندکارەکانی بەردەوام سەردانیان کردووە. ئەم دایەلۆگە باس لەو پلانە دەکات، کە گوایە کریتۆ، یەکێک



لە خوێندکارەکانی سوکرات، ڕێگەی خۆشکردووە تاکو مامۆستاکەی لە مەرگ ڕزگار بکات. من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا ئاماژەم بۆ ئەم خاڵە کردوە، کە بەدیدی دیۆجنیس، پلانی ڕزگارکردنی سوکرات (ئەشینس) نەک کریتۆ دایناوە بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان ئەفلاتون و ئەشینس باش نەبووە، ئەوا ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا تەنیا ناوی کریتۆ دەهێنێت. بەهەر حاڵ، دایەلۆگەکە لەوێوە دەستپێدەکات، کە کریتۆ بۆ زیندان دەڕوات و سوکرات ئاگاداری پلانەکە دەکات و هەوڵدەدات مامۆستاکەی ڕازی بکات تاکو لە زیندان دەرچێت. بەڵگەکانی کریتۆ بۆ ڕزگارکردنی مامۆستاکەی لەسەر ئەو بۆچوونە ڕادەوەستێت، کە ئەگەر کریتۆ و هاوڕێکانی سوکرات ڕزگار نەکەن و بۆ سەرکەوتنی ئەم پلانە پارە خەرج نەکەن، ئەوا دەکەونە بەر توانج و ڕەخنەوە. پاش مشتومڕێکی زۆر سوکرات ئامادە نەبوونی خۆی بۆ هەڵهاتن لە زیندان دەردەبڕێت. لێرەدا بۆچوونەکەی سوکرات دژی پلانەکە دەکەوێتە سەر پەیوەندی نێوان هاووڵاتیان و یاسا. بە دیدی سوکرات، ئەو لەگەڵ دەوڵەتدا هاوپەیمانییەکی بەستوە و لەو بەستێنەوە، وەکو هاووڵاتییەکی دڵسۆزی ئەسینا سەرپێچی لە یاسا ناکات. مادام ئەم نەیتوانی نوێنەرانی هاووڵاتیانی شارەکەی لە دادگا ڕازی بکات، ئەوانیش بڕیاری سزادانی سوکراتیاندا پێویستە ئەو بڕیارە سەرپێچی لێنەکرێت.

## (مێنەکسینۆس)

ئەم دایەلۆگە لەنێوان سوکرات و (مێنەکسینۆس)دایە و لەسەر گوتاری پرسەیە. لەبەر ئەم هۆیەشە لە کۆندا ئەم دایەلۆگەی ئەفلاتون بە گوتاری پرسە ناوزەدکراوە. ئەریستۆش لە پەرتووکەکەیدا (گوتاربێژی) ئاماژەی بۆ کردووە. سوکرات باسی ئەوە دەکات لە کاتی پرسە و یادکردنەوەی قارەمانان و جەنگاوەرانی شاری ئەسینا چی بگوترێت. هەروەها ئاماژە بۆ (ئەسپاسیا) کچە هاوڕێی پێرەکلیس، وەکو مامۆستایەکی ئەم هونەرە دەکات. مینەکسینۆس خوێندکاری سوکرات بووە لە ساتەکانی دوا تەمەنی مامۆستاکەیدا لە زیندان لە لای بووە.

ئەفلاتون لە دایەلۆگی (لیسیس)دا جارێکی دیکە ناوی دەهێنێت و سوکرات پرسیاری لە بارەی واتای هاوڕێیەتییەوە لێدەکات.

## (ئێۆن)

ئێۆن یەکێک بووە لەو شیعرخوانانەی شیعرەکانی هۆمیرۆسی بە جوانی خوێندۆتەوە و لەم هونەرەشدا خەڵاتی لە ئەسینا پێدراوە. ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا باسی چاوپێکەوتنێکی ئێۆن لەگەڵ سوکراتدا دەکات. ئێۆن بەسوکرات دەڵێت؛ کە ئەو تەنیا لە خوێندنەوەی شیعرەکانی هۆمیرۆسدا باڵادەست نیە، بەڵکو دەتوانێت تەفسیری شیعرەکانیش بە جوانی بکات. سوکرات بەشی یەکەمی ئەم گوتەیەی بە لاوە گرنگ نیە چونکە دەزانێت ئێۆن لەو هونەرەدا سەرکەوتوە



بەڵام ئەو پرسیارەی لادروست دەبێت، کە چۆن ئێۆن دەتوانێت لە تەفسیرکردنی بەرهەم و زانینی کەسێکی دیکەدا خۆی بە پسپۆڕ دابنێت.

یەکێک لەو خاڵە گرنگانەی ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا باسیدەکات، تێگەیشتنە لە سروشتی شاعیر و شیعر نوسین. سوکرات لەو باوەڕەدایە، کە شاعیر لەلایەن هێزیکی پیرۆزەوە هاندەدرێت بنوسێت و ئیلهامی شیعرەکانی بۆ دادەبەزێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵەش، نموونەی موگناتیزی هێناوەتەوە، کە تەنە ئاسنەکان بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت. هێزە پیرۆزەکە موگناتیزە و شاعیر بەرەو خۆی دەبات. شاعیریش شیعرخوانەکان بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێت. لەبەر ئەمە لەنێو هەموو تەنە ڕاکێشراوەکاندا هێزی موگناتیزی یان پیرۆز هەیە. شاعیر و شیعر خوانەکانیش ناتوانن پسپۆڕ و خاوەنی ئەو زانینەبن چونکە سەرچاوەکەی لە بوونی ئەوانەوە جیاوازە و پیرۆزە.

## (هیپپیاسی بچووک)

هیپپیاس بیریارێکی سەفسەتییە و سەردانی شاری ئەسینا دەکات. سوکرات دەیبینێت و لەسەر شیعرەکانی هۆمیرۆس دەکەونە مشتومڕەوە. سوکرات سەبارەت دوو پاڵەوانی نێو شیعرەکانی هۆمیرۆس (ئەخیلس و ئۆدیسیۆس) پرسیار لە هیپپیاس دەکات. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەخیلس لە شاری (ترۆی)دا چاکترین و

ئازاترین قارەمانی یۆنانییە. کەسێکە ڕاستگۆ، بەڵام ئۆدیسیۆس فیڵباز و درۆزنە و ڕاستی ناڵێت. ڕاستگۆیی و درۆزنیش دوو شتی جیاواز و ناکۆکن. مرۆڤ لە یەک کاتدا هەردووکیان نیە. سوکرات گومانی لەم بۆچوونە هەیە و داوا لە هیپپیاس دەکات زۆرتر ڕوونیبکاتەوە و دەپرسێت، ئایا دروستە بڵێین ئەو کەسەی ڕاستی دەزانێت دەتوانێت لەبارەی ئەو ڕاستییەوە درۆ بکات؟ مەبەستی سوکرات ئەوەیە، کە ئەگەر کەسێک ڕاستییەک بزانێت یان تەنیا ئەو ڕاستییەکە بناسێت دەتوانێ درۆشی لە بارەیەوە بکات. کەوابوو، دەگونجێت ئەخیلسی ڕاستگۆ و درۆزنیش بێت. بەم جۆرە دایەلۆگەکە مامەڵە لەگەڵ کێشەیەکی ڕەوشتی دەکات. لە ئاکامدا، بەو خاڵە دەگەین، کە سوکرات لەو باوەڕەدایە کەسێکی شارەزا، کەسێک بزانێت دادوەری چیە بەڵام بە کارێکی نادادوەرانە هەستێک چاکترە لەو کەسەی نەزانە و دادوەری ناناسێت و کاری نادادوەرانە دەکات. ئەم دایەلۆگە بە هیپپیاسی بچووک دادەنرێت، تاکو لە دایەلۆگێکی دیکەی بەهەمان ناو، کە لەم گەورەترە یان درێژترە جیابکرێتەوە.

**(هیپپیاسی گەورە)**

لەم دایەلۆگەدا هیپپیاس پاش ئەوەی سوکرات دەبینێت و لەسەر کێشەی ڕاستگۆیی و درۆکردن لە کەسێکدا و لە یەک کاتدا دەدوێن، هیپپیاس داوا لە سوکرات دەکات ڕۆژی دوایی ئامادەی کۆڕەکەی



لەسەر شیعرەکانی هۆمیرۆس بێت. سوکرات بۆ کۆڕەکە دەڕوات و پاش تەواوبوونی کۆڕەکە گوێگران سەرنجی خۆیان دەدەن و سوپاسی هیپپیاس دەکەن بەڵام سوکرات بێدەنگ دادەنیشێت و هیچ ناڵێت. کاتێک سوکرات دەدوێت باس لەوە دەکات، کە لە هەندێک لایەنەوە توێژینەوەکەی هیپپیاس چاک و لە هەندێکی دیکەوە لە کەموکورتی بەدەر نیە و دەتوانرێت ڕەخنەی لێبگیرێت. لەم خاڵەوە مشتومڕەکەی نێوان سوکرات و هیپپیاس دەچێتە سەر چەمکی (چاک) و تێگەیشتن لە واتاکەی. چەمکی (چاک) لە زمانی یۆنانییدا بەرانبەر (کالون) دادەنرێت، کە لە بەکارهێناندا بەربڵاوە و بۆ گەلێک شت دادەنرێت. لێرەدا پرسیارەکەی سوکراتیش جەخت لەسەر ئەو خاڵەدەکات، کە ئێمە چۆن بزانین کەسێک، بەرهەمێک یان کردەوەیەک چاکە؟ ئایا خەسڵەتی (چاکە) چییە؟ بێگومان هیپپیاس ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. لەبەر ئەمەش سوکرات دوای کۆڕەکە بێدەنگ ڕادەوەستێت و نازانێ چی بڵێت.

**(مینۆ)**

مینۆ یەکێکە لە ئەندامی خێزانە ئەریستۆکراتەکانی شاری (تیسالی) و لە ئەسینا میوانی (ئەنیتۆس) یەکێک لە دەستەڵاتمەدارەکانی ئەسینا و سیاسەتمەدارێکی پارتی دیموکراتی بووە، کە دوژمنی سوکراتە و دەستی لە کوشتنەکەیدا هەبوو. هەروەها مینۆ سوکرات لە ئەسینا

دەبینێت و چەند پرسیارێکی سەبارەت چاکە لێدەکات: ئایا دەتوانین چاکە فێری کەسانی دیکە بکەین یان هەر تاکە دەبێت بە کردەوە چاکەکەر بێت؟ ئایا چاکەکردن لە خۆرسکی مرۆڤدایە یان نا؟ سوکرات و مینۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەیان لا نیە، بەڵام سوکرات داوا لە مینۆ دەکات هەردووکیان پێکەوە بە دوای وەڵامەکەدا بگەڕێن. مینۆ ئەم پێشنیارە پەسەند ناکات و لەو باوەڕەدایە کەسێک نەزان بێت گەڕانەکەی بە دوای زانیندا بەرهەمدار نابێت. لێرەدا سوکرات ڕوودەکاتە کۆیلەیەکی نەزان و پرسیارێکی گرانی ئەندازیاری لێدەکات. مەبەست لەم پرسیارکردنەش ئەوەیە، کە سوکرات لەو باوەڕەدایە (دەروونی) مرۆڤ نەمر و هەمیشەییە و زەخیرەیەک زانینی لەنێو خۆیدا بەدرێژایی مانەوە و نەمرییەکەی هەڵگرتوە. ئەوەی پێویستە هەوڵدانە بۆ یادهێنانەوەی دەروون چونکە زانین بیرکەوتنەوەیە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (فیدۆ)شدا ئاماژەی بۆ زانین، وەکو یادکردنەوە کردووە و پەیوەندیشی بە بیردۆزەی ئایدیاکان یان فۆرمە بەرزەکانەوە هەیە، کە لە کۆمارەکەیدا بە درێژی باسیکردوە.

**(جۆرجیاس)**

وەکو دەزانین جۆرجیاس بە یەکێک لە بیریارە سەفسەتەییەکان دادەنرێت. بۆ ماوەیەکیش بەتایبەتی لە ساڵی (427 پ ز) نوێنەرایەتی دەوڵەتەکەی (لیۆنتینی لە سیسلی—ئیتالیا) لە شاری ئەسینا کردووە.



لەم دایەلۆگەدا سوکرات و جۆرجیاس یەکدی دەبینن و لەسەر هونەری ڕەوانبیژی، کە جۆرجیاس زۆر تیایدا شارەزا بووە، گفتوگۆ دەکەن. لەگفتوگۆکردنەکەدا جۆرجیاس توشی ناکۆکییەک دەبێت و لەو باوەڕەدایە، کە ڕەوانبێژی بلیمەت ئەو کەسەیە لە بەستێنی بابەتەکەیەوە چاکە و خراپە، دادوەری و نادادوەری بناسێت. لەم گفتوگۆیەدا بۆ کۆمەککردنی جۆرجیاس لاوێک بە ناوی (پۆلۆس)ەوە دێتە ناوەوە و لەگەڵ سوکراتدا دەکەوێتە مشتومڕەوە. پۆلۆس لەو باوەڕەدایە ڕەوانبێژی دەستەڵات بە مرۆڤ یان ڕەوانبێژەکە دەدات بە ویست و حەزی خۆی بکات، تەنانەت دەتوانێت کارێکی نادادوەرانەش بکات ئەگەر حەزی لەو کارەبێت. لێرەدا سوکرات دژی ئەم بۆچوونە ڕادەوەستێت و ڕێگە نادات مرۆڤێکی زانا خراپە و نادادوەری هەڵبژێرێت. ئەم لەو باوەڕەدایە چاکترە مرۆڤ بەدەست نادادوەرییەوە بناڵێ و ئازاربچێژێت، نەک خۆی نادادوەر بێت یان بەو کارە هەستێت. لەدوای ئەم مشتومڕە سوکرات دەتوانێت پۆلۆس بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. لەم دایەلۆگەدا کەسێکی دیکەش بە ناوی (کالیکلس) بەشداری دەکات، کە وەکو پۆلۆس کەسێکی نەناسراوە و هیچ لە بارەیەوە نازانین. سوکرات لەگەڵ (کالیکلس)دا لەسەر پێناسکردنی ژیانی چاک دەکەوێتە مشتومڕێکی توندەوە. لەسەر ئەوە دەدوێن، کە مرۆڤ چ ڕێگەیەک هەڵبژێرێت: ژیانێکی پڕ لە خۆشی و ڕابواردن وخۆ-ویست یان فەلسەفییانە و سەقامگیرکردنی دادوەری.

## (پرۆتاگۆراس)

ئەمە یەکێکە لە دایەلۆگە نایابەکانی ئەفلاتون، کە لە قۆناخی سەرەتاییدا نوسیویەتی. لەم دایەلۆگەدا سوکرات لەگەڵ پرۆتاگۆراس و هیپیاس و پرۆدیکسدا دەکەوێتە گفتوگۆ. ئەم سێ بیریارە سەفسەتین، بەتایبەتی پرۆتاگۆراس بە ڕابەرێکی بزوتنەوەی فەلسەفی سەفسەتییانە دادەنرێت. هەروەها پرۆتاگۆراس بە فێرکەر و پسپۆڕی پەروەردە ناسراوە. بەتایبەتی هەوڵیداوە لاوان فێربکات یان پەروەردەبکات تاکو هاووڵاتییەکی چاکیان لێدەرچێت. دایەلۆگەکە جەخت لەسەر کێشەی پەروەردەکردن دەکات. لەو پرسیارانەوە دەستپێدەکات، کە ئایا دەتوانین مرۆڤ فێری چاکە بکەین و بە هاووڵاتیەکی چاکی لێدەرچێت؟ ئایا بوون بە هاووڵاتیی چاک لە خۆرسکی مرۆڤدا نیە؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا دوو بۆچوونی جیاواز سەرهەڵدەدەن:

یەکەم، پرۆتاگۆراس باوەڕی بە پەروەردەکردن هەیە. بە دیدی ئەو پێویستە یان دەتوانرێت لاوان فێربکرێن و ببن بە هاووڵاتی چاک.

دووەم، بە دیدی سوکراتیش ئەمە ناکرێت. لەم گفتوگۆیەدا پرۆتاگۆراس باسی چەند جۆرێک لە چاکە دەکات. لەو باوەڕەشدایە هەموویان لە ڕێگەی پەروەردە و فێربوونەوە پەیداناکرێن. بۆ نموونە، گرنگ نیە کەسێک چەند لێزان بێت ئەگەر ئازایەتی لە سروشتیدا نەبێت، ئێمە ناتوانین فێری ئازایەتی بکەین.



## (لاچێس)

ئەم دایەلۆگە لەسەر گفتوگۆیەکی سوکراتە لەگەڵ دوو جەنراڵی یۆنانییدایە (لاچیس و نیکیاس)، کە لە جەنگی پیلۆنیسیا بەشداریان کردووە. من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا لەسەر ژیان و بیری ئەفلاتون باسی ئەم جەنگەم کردووە. دایەلۆگەکە جەخت لەسەر کێشەی واتای پیاوەتی (ئەندریا: بە یۆنانی) دەکات. ئایا پیاوەتی چیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەرەو یەکێک لە چاکەکان (ئازایەتی) پەلکێشیان دەکات و پرسیارێکی دیکەیان لەلایەن سوکراتەوە لەسەر سروشتی ئازایەتی؛ ئایا ئازایەتی چییە؟ لێدەکرێت. هەردووکیان لەگەڵ سوکراتدا لەسەر ئەو خاڵە هاوڕادەبن، کە ئازایەتی لەسەر زانین ڕادەوەستێت. لەبەر ئەمە ناتوانین ئاژەڵ، منداڵان یان کەسە نەزان و گەمژەکان بە ئازا دابنێین. لەم دایەلۆگەشدا، وەکو لە دایەلۆگەکانی دیکەی قۆناخی سەرەتایی ئەفلاتوندا، سوکرات بیروباوەڕی بەرانبەرەکەی ڕەتدەداتەوە و کەم و کورتییەکانی دەردەخات بەبێ ئەوەی خۆی وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە. لە ئاکامی گفتوگۆکەی سوکرات لەگەڵ ئەم دوو جەنراڵەدا، پیاوەتی بە ئازایەتی دادەنرێت و ئازایەتیش بە زانینەوە دەبەسترێتەوە. لێرەدا چەندین پرسیاری دیکە لای خوێنەر دروستدەبێت، بەبێ ئەوەی سوکرات یان ئەفلاتون وەڵامەکانی ئامادە کردبێت.

**(چارمەدیس)**

لەم دایەلۆگەدا سوکرات پاش گەڕانەوەی لە بەشداری کردن لە سەرەتای جەنگی پیلۆپۆنیسیا (کە بیست و حەوت ساڵی خایاندووە)، من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا باسمکردووە، لە ئەسینا لەگەڵ دوو خزمی ئەفلاتون (چارمەدیس و کریتیاس)، لەسەر واتای (مامناوەندێتی) دەکەونە مشتومر. چارمەدیس خاڵی ئەفلاتونە و کرتیتیاسیس، کە یەکێک بوو لە دەستەڵاتمەدارە ئەریستۆکراتییەکان، ئامۆزای دایکی ئەفلاتونە. بەگوێرەی گەڕانەوەی سوکرات لە خزمەتی سەربازی و سەرەتای جەنگەکە دەردەکەوێت ئەم گفتوگۆیە لە ساڵی (432 پ. ز) ڕوویدابێت، کە ئەو کاتە چارمەنیدس لاوبووە و سوکراتیش تەمەنی سی و حەوت ساڵان بووە.

مامناوەندێتی (سۆفرۆسۆن: بە یۆنانی)بە یەکێک لە چاکەکان دادەنرێت و ئەریستۆش، پاش مردنی ئەفلاتون، لەفەلسەفە ڕەوشتییەکەیدا بایەخی پێداوە. لە ڕاستیدا، ژیانی ئەم دوو خزمەی ئەفلاتون بەپێچەوانەی واتای مامناوەندێتییەوە بووە. هەردووکییان، بە یاریدەی سپارتا لە ئەسینا بوون بە دەستەڵاتمەدار و چەوسێنەر تاکو لە جەنگێکدا دژی بزوتنەوەی دیموکراسی دەکوژرێن. بەڵام لەم دایەلۆگەدا چارمەدیس لاوێکی ئەریستۆکراتی و هێمنە، توانیوییەتی لغاوی حەز و ئارەزووەکانی بگرێت و بەرەوتوندڕەوی نەبەن. کریتیاس پێشنیاری ئەوەدەکات، کە چارمەدیس، ئەم لاوە جوان و ئەریستۆکرا



-تییە، بۆ ئەوەی چاکتر خۆی بەژیانێکی مامناوەندییەوە ببەستێتەوە و گومڕا نەبێت، زۆرتر لەسوکرات نزیکببێتەوە و فێری ئەو چاکەیە ببێت. بەڵام سوکرات لە ئاستی پێشنیارەکەدا بێدەنگ دەبێت.

**(تیاجیس)**

تیاجیس لاوێکی شاری ئەسینایە و دەیەوێت ببێت بە سیاسەتمەدار. بۆ ئەم مەبەستەش، وەکو لەم دایەلۆگەدا باسکراوە، دەبێت بە خوێندکاری سوکرات تاکو فێری سیاسەتی بکات. ئەفلاتون لە دوو دایەلۆگی دیکەشدا ناوی تیاجیسی هێناوە. لە دایەلۆگی (کۆمار) دا باسی نەخۆشییە سەختەکەیی و لە (ئەپۆلۆجی) ئاماژە بۆ مردنی پێش دادگاکردنی سوکرات دەکات. ئەوەی لەم دایەلۆگەدا گرنگە و ئەفلاتون باسیدەکات دەستەڵات و پەیوەندی گیانەکی (ڕۆحانی) سوکراتە. گوایە، سوکرات لە غەیبەوە ئیلهامی بۆ هاتووە و وەڵامی هەندێک پرسیاری دەست کەوتووە. هەروەها، هونەر و شارەزایی سوکراتیش لە گفتوگۆکردندا دەردەبڕێت.

**(نەیارە دڵدارەکان)**

لەم دایەلۆگەدا سوکرات توشی لاوێکی وەرزش زان دەبێت، کە ئامادەیی خۆی بۆ فێربوون بۆ سوکرات دەردەخات. بەڵام ئەو دەیەوێت لە هەموو شتێک بزانێت یان زانیاری گشتی لەسەر هەموو

شتێک هەبێت و لەم ڕێگەیەوە ببێت بە فەیلەسوف. سوکراتیش دژی ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە(فەلسەفە) ڕادەوەستێت و لەو باوەڕەدایە پسپۆڕی زانین لە بوارێکدا لەو زانیارییە گشتییانە سەبارەت هەموو شتێک چاکترە. زانیاری گشتی مرۆڤ بە ڕاستی ناگەیەنێت و نایکات بە پسپۆڕی هیچ بوارێکی زانین و دەستەڵاتی پێنابەخشێت.

**(هیپارچیۆس)**

سوکرات لەگەڵ هاوڕێیەکیدا، کە ئەفلاتون ناوی نەهێناوە، لەسەر واتای چەمکی (چڵێسی—تەماع) دەکەوێتە گفتوگۆ. هاوڕێکەی بە جۆریک خۆی دەردەخات، کە واتای ئەم چەمکە بە تەواوی دەزانێت و لەو باوەڕەدایە چڵێسی ئەو ڕەفتارەیە کەسێک بیەوێت یان هەوڵبدات سود و قازانج لەو شتانە وەرگرێت، کە بێ بەهان و کەسێکی چاک شوێنیان ناکەوێت. سوکراتیش دژی ئەم بۆچوونە ڕادەوەستێت. بە دیدی ئەو، تاکو ئەو ڕادەیەی چڵێس سود لە شتە بێ بەهاکان وەردەگرێت بۆچوونێکی دروستە بەڵام ئەمە ئەمەش کارێکی گەمژانە و خراپە و مرۆڤی چاک چڵێسی ناکات. لەبەر ئەوەی چڵێسی هەوڵدانە بۆ وەدەست هێنانی سود و قازانج، کە ئەمەش هەموو مرۆڤێک دەیخوازێت، کەوابوو هەموو مرۆڤێک چڵێس تەماعکارە. بە درێژایی ئەم دایەلۆگە هاوڕێکەی سوکرات هەوڵی ڕووخاندنی ئاکامی بەڵگەکەی سوکرات بێهودە دەداتەوە و دەیەوێت بیسەلمێنێت، کە ناتوانین هەموو



کەسێک بە چڵێس دابنێین. بێگومان مەبەستی سوکراتیش سەلماندنی چڵێسی لە هەموو کەسێکدا نیە. ئەو دەیەوێ بەرانبەرەکەی بهەژێنێت و بۆچوونەکانی پوچەڵ بکاتەوە.

**(ئەلسیبیادیس)**

ئەلسیبیادیس لاوێکی زۆر جوانی شاری ئەسینا بووە، هەوڵیداوە لە لای سوکرات فێری چاکە و سیاسەت ببێت. لە دواییدا ئەم لاوە زۆرتر لە سوکراتی مامۆستای نزیک دەبێتەوە و پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروست دەبێت. زۆر لە مێژوونوسان لەو باوەڕەدان ئەم خۆشەویستییەی نێوانیان(سێکسی) نەبووە و گیانەکی بووە، کە ئەمڕۆ بە پەیوەندی یان خۆشەویستی ئەفلاتونی ناوزەد دەکرێت. ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا گفتوگۆی نێوان سوکرات و ئەلسیبیاس لەسەر فەرمانڕەوایی و دەستەڵات دەگێڕێتەوە. بە دیدی سوکرات، کەسێک خۆی نەناسێت و دەستەڵاتی بەسەر (خودی) خۆیدا نەبێت، ناتوانێت فەرمانڕەوایی بکات و دەستەڵاتمەدار بێت. بۆ ئەم مەبەستە، تاک پێویستە دەستەڵاتی دەروونی بەسەر حەز و ئارەزووەکانی لەشیدا هەبێت. لە دواییدا ئەلسیبیادیس دەبێت بە سیاسەتمەدار و جەنراڵێکی لەشکری یۆنان لە جەنگی پیلۆپۆنیسیا و دژی فارسەکان بەشداری دەکات. بەڵام لە هەردوو جەنگەکەدا لەگەڵ دوژمنی وڵاتەکەی ڕێدەکەوێت و سیخوڕی دەکات.

**(ئەلسیبیادیسی دووەم)**

مەبەست لە ئەلسیبیادیسی دووەم دایەلۆگێکی دیکەیە لەسەر گفتوگۆیەکی دیکە، لەنێوان سوکرات و ئەلسیبیادیسدا نوسراوە. لەم دایەلۆگەدا ئەلسیبیادیس نەزانی خۆی و عاشقبوونی بۆ سوکرات دەردەبڕێت. داوای لێدەکات بە خوێندکار و دڵدار وەریبگرێت. لە زۆر شوێنی ئەم دایەلۆگەدا چەند بەشێک و ڕووداوەکانی دایەلۆگی پێشوتری بە ناوی (ئەلسیبیادیس) تێهەڵکێش کراوە، کە ئێمە بە لای ئەو بیرەدا دەبات ئەم دوو دایەلۆگە یەک نوسراو بن. ئەوەی لەم دایەلۆگەدا گرنگە و ئەفلاتون دەیگێڕێتەوە بۆچوونێکی سوکراتە، گوایە هەندێک جار نەزانین لە زانین چاکترە. تەنیا زانینێک گرنگ و سودبەخش بێت سەبارەت چاکەیە. ئەم جۆرە زانینە ڕێنومایی مرۆڤ دەکات و چاکەکانی دیکەی پێدەناسێنێت. هەروەها، سوکرات بانگەشەی ئەو خاڵەش دەکات، کە خواکان چاکەی دەروونی لە مرۆڤ داوادەکەن. چاکترین شێوەی چاکەی دەروونی نوێژکردن و پاڕانەوە لە خواکانە بۆ چاکە بەگشتی و دوورکەوتنەوە لە خراپەیە، نەک پاڕانەوە بۆشتێکی دیاریکراو.

قۆناخی دووەمی ئەزموونی نوسین لە ژیانی ئەفلاتوندا بە قۆناخی گواستنەوە ناوزەدمان کرد. هەرچەندە هەندێک لە مێژوونوسان بە قۆناخی ناوەڕاستی دادەنێن، بەڵام، بەبۆچوونی من، (گواستنەوە) چاکتر واتای ئەم قۆناخە دەردەخات و هاوکات (گۆڕان)یش لە نوسین



و بیرکردنەوەی ئەفلاتوندا نیشاندەدات. گواستنەوە گۆڕان یان جوڵانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە یان لە قۆناخێکی بیرکردنەوەوە بۆ قۆناخێکی دیکە، کە دەتوانین جیاوازیش لەنێوان ئەو دوو شوێنە یان قۆناخەکان پاش پرۆسەی گواستنەوەکە بدۆزینەوە. دۆزینەوەی ئەم جیاوازییەی نێوانیانە واتای گواستنەوە، وەکو گۆران ئاشکرا دەکات.

بەبێ سەرهەڵنەدان و ناسینی جیاوازییەکە مەحاڵە باسی گواستنەوە بکرێت. ئایا ئەفلاتون لەم قۆناخەدا گۆڕانی خستۆتەگەڕ؟ ئایا دەتوانین باس لە جیاوازی نێوان قۆناخی پێشوتر و ئەم قۆناخەدا بکەین؟ بێگومان، لە ئێستاوە بیر لە وەڵامی ئەم پرسیارانە بە ئەرێ دەدەینەوە چونکە قۆناخە نوێکەمان بە (گواستنەوە) داناوە. ئەم گواستنەوەیەش لەو خاڵە سەرەکییەدا دەبینرێت، کە نەک تەنیا پەیوەندی بەشێوازی نوسینی ئەفلاتونەوە هەیە، بەڵکو لەسەر گۆڕانکارییە فەلسەفییەکانیشی ڕادەوەستێت. لەم دایەلۆگانەشدا سوکرات پاڵەوانی نێو گفتوگۆکانە بەڵام لێرەوە سوکرات دەبێت بە پاڵەوانێکی نێو ئەندێشەی ئەفلاتون. ڕووداوەکانیش لەهەمان سەرچاوەوە بۆ دەربڕین و سەلماندنی کێشە فەلسەفییەکان داهێنراون.

لێرەوە، بەپێچەوانەی قۆناخی یەکەمەوە، سوکرات پاڵەوانێکی ڕاستەقینەی نێو ڕووداوەکان نیە. بۆ نموونە لە دایەلۆگی ئەپۆلۆجیدا، خودی سوکرات لەبەردەم ئەندامانی دادگا ڕادەوەستێت و بەرگری لە خۆی دەکات. هەرچەندە ئەفلاتون نوسەری ئەو دایەلۆگەیە، بەڵام

داهێنەری پاڵەوان و گفتوگۆ و ڕووداوەکە نیە. دەشێ لەم قۆناخەدا هەندێک ڕووداوی نێو دایەلۆگەکان ڕاستەقینەبن، کەچی بەکارهێنانیان بۆ مەبەستی دەربڕینی بۆچوونێکی فەلسەفییانەیە لەسەر زاری سوکراتەوە، کە لە ڕاستیدا سوکرات ئەو بۆچوونەی دەرنەبڕیوە و خاوەنەکەشی خودی ئەفلاتونە. مەبەستمان لە (گواستنەوە) ئەم گۆڕانکارییەیە لەنێو بیرکردنەوەی ئەفلاتوندا. ئەم بیریارە لەم قۆناخەوە دەیەوێت بۆچوون و ڕێگەی فەلسەفی خۆی بدۆزێتەوە و لەژێر کاریگەرێتی سوکراتی مامۆستایدا ڕزگاربێت. لەم قۆناخەدا ئەم دایەلۆگانە ریز دەکەین:

### (ئیوسیدیمۆس)

ئیۆسیدیمۆس و برا گەورەکەی (دیۆنیسۆدۆرۆس) دوو مامۆستای یاساو ڕەوانبێژی و زانستی جەنگسازی بوون و سەردانی شاری ئەسینایان کردوە. سوکرات داوا لە کریتۆی خوێندکاری دەکات پێکەوە سەردانی ئەم دوو مامۆستایە بکەن. سوکرات و ئەم دوو مامۆستایە شارەزایی خۆیان لە هونەری گفتوگۆکردندا بۆ بەزانی یەکدی بەکاردەهێنن و سوکرات، وەکو جاران بەردەوام پرسیاریان لێدەکات و وەڵامەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە. داوایان لێدەکات کارێک بکەن (کلینیاس)، کە لاوێکی کەم تەمەنە لەگەڵیان خولیای خوێندنی فەلسەفەی بکەوێتە سەر. لەم دایەلۆگەدا ئەفلاتون دەیەوێت ڕوونیبکاتەوە چۆن لاوان



بەرەو خوێندنی فەلسەفە و چاکەکردن پەلکێش بکەین. لەو باوەڕەدایە فەلسەفاندنی تەواو لەسەر بیرکردنەوەی هۆشەکی و لۆجیکێکی دروستەوە دادەمەزریت.

### (کۆمار)

ئەمە یەکێکە لە دایەلۆگە هەرە گرنگەکانی ئەفلاتون، کە تیایدا فەلسەفەی ئەفلاتون بەتەواوی دەخوێنرێتەوە. بەشی یەکەمی ئەم دایەلۆگە، کە مامەڵە لەگەڵ (دادوەری) دەکات لەبەشەکانی دیکەی زووتر نوسراوە. هەندێک لەو باوەڕەدان ئەفلاتون بەشەکانی دیکەی کۆماری لە قۆناخی سێیەمدا نوسیوە. ئەم دایەلۆگەش لەنێوان سوکرات و دوو برای ئەفلاتون (گلاوکۆن و ئەدیمەنتۆس) دا ڕوودەدات. لێرەدا دەشێ ڕووداوەکە یان کۆبوونەوەی سوکرات لەگەڵ براکانی ئەفلاتوندا ڕوویدابێت، بەڵام مشتومڕیان لەسەر کێشە فەلسەفییەکان زادەی ئەندێشەی ئەفلاتون و بۆچوونی خۆیەتی لەسەر زاری سوکرات و براکانیەوە باسیاندەکات.

ئەفلاتون، لەم دایەلۆگەدا، دەیەوێت بۆ سەقامگیرکردنی دادوەریی کۆمەڵایەتی دەوڵەتێک دامەزرێنێت، کە تیایدا (فەیلەسوفەکان) بە ژن و پیاوەوە بێ جیاوازی فەرمانڕەوایی بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش، ئەفلاتون سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بۆ فەرمانڕەواکان بە درێژی باسدەکات. بێجگە لەوەی لەم دایەلۆگەدا میتافۆرە بەناوبانگەکەی

(ئەشکەوتی) تێدایە، بیردۆزەی فۆرمە بەرزەکان و ئەپستمۆلۆجی و فەلسەفەی کۆمەڵایەتی ئەفلاتونیش ڕوونکراوەتەوە.

**(فیدرۆس)**

لەم دایەلۆگەدا سوکرات لە دەرەوەی شاری ئەسینا و بە کەناری ڕووباری (ئیلسیۆس) دا لەگەڵ فیدرۆسی هاوڕێی پیاسەدەکات. لەسەر کێشەی ڕەوانبێژی و عەشق دەدوێن. سوکرات بۆ فیدرۆسی باس دەکات، کە ڕەوانبێژی بەگوێرەی بیسەرەکەی دەگۆڕێت و لە فەلسەفەشەوە جیاوازە. فەلسەفە بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت و ڕەوانبێژی ئەم خەسڵەتەی نیە. هەروەها ئەو ڕاستییەش لەنێو دەروندا دەمێنێتەوە، کە بەردەوام لەگەڵ (گوتن)دا مرۆڤ دەتوانێت ڕاڤەی نوێتری بۆ بکات. نوسین، هەرچەندە راستی دەردەبڕێت، بەڵام ئەو ڕاستییە دەچەسپێنێتە نێو بونیادێکی تەسک و خنکێنەری دەربڕینەوە و لەوە زۆرتر گۆڕانی بەسەردا نایەت. ئەمەش بۆچوونی ئەفلاتون سەبارەت گوتن و نوسین دەردەخات. هەرچەندە نوسین نەمری بە بیرۆکەکە دەبەخشێت و پاش مردنی نوسەرەکەش نوسراوەکە دەمێنێتەوە بەڵام خەسڵەتی (ئامادەبوون)ی نوسەر یان گوتەبێژەکەی تێدا نیە، کە لە گوتن دا هەیە.



**(سەمپۆزیەم)**

یەکیکە لە دایەلۆگە گرنگەکانی ئەفلاتون، کە بە زمانێکی شاعیرانە و جوان نوسراوە. ڕووداوی ئەم دایەلۆگە، دانیشتنێکی ڕێزلێنانە لە ماڵی ئەگاتۆن بە بۆنەی سەرکەوتنی شانۆگەرییەکەیەوە. ناوەڕۆکی ئەم دایەلۆگە لەسەر واتای خۆشەویستی (ئیرۆس)ە،کە شەش کەس بەشداری تێدادەکەن. بێجگە لە سوکرات، کە پاڵەوانی دایەلۆگەکەیە، فیدرۆس و ئەگاتۆن و دەستگیرانەکەی، هیپیاس و ئێرکیسماخۆس و دواجاریش ئەلسیبیادیس (ئەو لاوەی پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ سوکراتی مامۆستای هەیە و ئەفلاتون دایەلۆگێکی بەو ناوەوە نوسیوە) بە سەرخۆشی بەشداری دانیشتنەکەیان دەکات. لێرەدا ئەفلاتون باسی واتای خۆشەویستی و بابەتی خۆشەویستی دەکات، کە لە ئاکامدا ڕاڤەکردنی بۆ واتای ئەم چەمکە و بابەتەکەی شێوازێکی جیاواز وەردەگرێت و ئەمڕۆ بە (خۆشەویستی ئەفلاتونی) ناسراوە. بە دیدی ئەفلاتون، خۆشەویستی و بەرزی و نزمی ئەم هەستکردنە، بەگوێرەی بابەتەکەی دەگۆڕێت؛ لە خۆشەویستی بۆ کەسێکی دیکەوە دەست پێدەکات و بە خۆشەویستی بۆ بەرزترین فۆرمی جوانی کۆتایی دێت. خۆشەویستی مەیل و حەزکردنە لە جوانی. کاتێک مرۆڤ جوانی لە شتێکدا یان لە کەسێکی دیکەدا دەبینێت حەزی لێدەکات. بەڵام ئەو جوانییە دواجوانی نیە و لەو جوانتر هەیە. ئەم جوانییە پڕ و تەواو نیە. لەبەر ئەمەشە ئەوەی بۆ کەسێک یان لە کاتێکدا جوانە بۆ

کەسێکی دیکە یان لە کاتێکی دیکەدا ناشرینە. ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی خۆشەویستی. بۆئەوەی خۆشەویستی نەگۆڕ و هەمیشەیی بێت، پێویستە بەدوای جوانترین بابەتدا، کە فۆرمی هەمەکی جوانییە بگەڕێین و خۆشمان بوێت.

### (پارمەنیدس)

یەکیکە لە دایەلۆگە قوڵ و سەختەکانی ئەفلاتونە، کە باسی ڕێچکەی ئایدیا (فۆرمە بەرزەکان)دەکات. لەم دایەلۆگەدا سوکرات لاوێکی تازە پێگەیشتوە و شارەزاییەکی ئەوتۆی لە فەلسەفەدا نیە و لە ئەسینا پارمەنیدس، کە ئەو کاتە تەمەنی شەست ساڵان بووە، لەگەڵ زینۆی خوێندکاری پارمەنیدس دەبینێت. لەبەر ئەمە سوکرات لەم دایەلۆگەدا ڕۆڵێکی سەرەکی پینەدراوە و ئەفلاتون لەسەر زاری پارمەنیدسەوە بۆچوونە فەلسەفییەکانی دەردەبڕێت. شوێنی دایەلۆگەکە ماڵی (پیتۆدۆرۆس)ەو زینۆ نوسراوێکی خۆی لەسەر (فرەلایەنی ڕاستەقینە) بۆ میوانەکان دەخوێنێتەوە. سوکراتیش پرسیار لە زینۆ سەبارەت تێگەیشتنی لە ڕاستەقینە دەکات. پارمەنیدسیش پاش پرسیارکردن لە سوکرات ئاماژە بۆ شەش خاڵ و کێشەی گرنگی فەلسەفی دەکات، کە یەکێکیان لە بیردۆزەی ئایدیا (فۆرمە بەرزەکان)دا بە (مرۆڤی سێیەم) دادەنرێت. لە کۆتایی بەشی یەکەمی دایەلۆگەکەدا، پارمەنیدس میتۆدی شیکردنەوە فێری سوکرات دەکات تاکو بیردۆزەی ئایدیاکانی



لەسەر دامەزرێنێت، بەشی دووەمی دایەلۆگەکە، کە جێگەیەکی زۆری داگیرکردووە، پارمەنیدس لەوەڵامی ئەوپرسیارەدا لاوێک بەناوی (ئەریستۆ)وە لێیدەکات، لەسەر ئەم میتۆدە بە درێژی دەدوێت. (48)

### (سیاسەتمەدار)

لەم دایەلۆگەدا ئەفلاتون لەسەر گفتوکۆی نێوان سوکرات و فەیلەسوفێکی میوان (کە ناوی نەبردووە) لە ئیلیاوە لەسەر کێشەی سیاسەتمەدار دودێت. ئەم فەیلەسوفە لەوباوەڕەدایە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکیدادوەر و بەختەوەرکردنی هاووڵاتیان پێویستیمان بەو سیاستمەدارانە هەیە تەواناى بیرکردنەوە و زانینیان یارمەتیان دەدات دەستگاکانی دەوڵەت بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرن و لە بەرژەوەندی هاووڵاتیان کاربکەن. بەڵام ئەمڕۆ هیچ وڵاتێک بە دەست ئەم جۆرە سیاسەتمەدارانەوە نیە و تەنانەت ئەم جۆرە سیاسەتمەدارانەش نادۆزرێنەوە. کەوابوو باشترین کەس بۆ بەرێوەبردنی وڵات لەگەڵ نەبوونی ئەم سیاسەتمەدارانەدا سەفسەتییەکانن. سەفسەتییەکان دەزانن، کە نازانن چۆن وڵات بەڕێوەبەرن بەڵام ئەم ڕاستییە بە کەس ناڵێن. لەم دایەلۆگەدا ئەفلاتون بیردۆزەیەکی سیاسی ڕاڤە ناکات، هاوکات دەردەکەوێت پێش (کۆمار)ەکەی ئەم دایەلۆگەی نوسیبێت

(48) دەزانین ئەریستۆ سوکراتی نەبینیوە، ئەو کاتەی سوکراتیش مردووە ئەریستۆ تەمەنی (15 ساڵان) بووە. ئەفلاتون، وەکو نوسەری ئەم دایەلۆگە ئەریستۆی خستۆتە نێو گفتوکۆکەوە. ئەو کاتەی ئەم دایەلۆگەی نوسیوە ئەریستۆ لە ئەکادیمیا لای ئەفلاتون خوێندویەتی.

چونکە باسی سیسەتمەداریی فەیلەسوفەکان ناکات.

### (تیاتیتیۆس)

تیاتیتیۆس هاوڕێ و خوێندکاری ئەفلاتون و زانای ماتماتیک بووە. لەم دایەلۆگەدا سوکرات و تیاتیتیۆس مشتومڕ لەسەر کێشەی زانین دەکەن. لەم ڕووەوە ئەمە یەکەم دایەلۆگی ئەفلاتونە، کە بۆ زانین تەرخانکراوە و ئەفلاتون تیایدا باسی بیردۆزەی زانین یان ئەپستمۆلۆجی دەکات. لێرەدا سوکرات بە دریژی ڕەخنە لە پێناسەکەی تیاتیتیۆس بۆ زانین (زانین هەستکردنە) دەگرێت. هەمان کات، لە ڕوانگەی ڕەخنەکەیەوە ئاماژە بۆکەم و کورتی گوتەکەی پرۆتاگۆراس (مرۆڤ پێوەری هەمووشتێکە) و ڕێژەگەری دەکات.

### (کراتیلۆس)

ئەم دایەلۆگە لەسەر کێشەیەکی زمانەوانی بەتایبەتی (ناودانان) نوسراوە. مامەڵە لەگەڵ وەڵامی ئەو پرسیارە دەکات، کە ئایا هۆی دروستی ناولێنان چیە؟ سوکرات دوو بۆچوونی ڕوونکردۆتەوە. یەکەمیان پەیوەندی بە بۆچوونی (هێرمۆجینس)ەوە هەیە، کە لەو باوەڕەدا بووە پێوەری دروستی ناولێنان کەلتوور یان ڕازیبوونی کۆمەڵە لەسەر ناوەکان. دووەمیش، لەسەر بۆچوونی کراتیلۆس، کە فەیلەسوفێکی سەر بە فێرگەی هیراکلیتسە و ئەفلاتونیش فەلسەفەی



لە لا خوێندووە و من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا باسم کردووە، ڕادەوەستێت. کراتیلۆس باوەڕی بە هەڵوێستێکی سروشتانە هەبووە. گوایە ئێمە ناوێک دادەنێین، کە پەیوەندی بە سروشتی ئەو کەسەوە یان ئەو شتەوە هەبێت. لە قۆناخی دواییدا، ئەو قۆناخەی ئەفلاتون بە تەمەن گەورە و لە بیرکردنەوەدا خەمڵیوە، شەش دایەلۆگمان لەبەر دەستدایە. ئەم دایەلۆگانە بەرهەمی بیست ساڵی دوا تەمەنی ئەم بیریارەن؛ لە تەمەنی شەست ساڵییەوە بۆ هەشتا. لەم بیست ساڵەدا ئەفلاتون زۆربەی کاتی بۆ نوسین و وانە گوتنەوە تەرخان کردوە. هەندێک لە مێژوونوسان لەو باوەڕەدان، کەنەیتوانیوە دوا دایەلۆگ بە ناوی (یاساکان)ەوە تەواو بکات. لەبەر ئەمە دەگونجێت خوێندکارێکی ئەفلاتون، کە زۆر لە مامۆستاکەیەوە نزیک بووە و شارەزایی لە بۆچوونەکانییدا هەبووە ئەم دایەلۆگەی تەواوکردوە. دایەلۆگەکانی ئەم قۆناخە بەتەواوی نوێنەرایەتی بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەفلاتون دەکەن. لە زۆر بەشیاندا ڕۆڵی سوکرات کەم بۆتەوە. تەنانەت لە (یاساکان)دا ئەفلاتون ناوی سوکراتی مامۆستای ناهێنێت.

### (سۆفست)

لەم دایەلۆگەدا تیۆدۆرۆس، زانای ئەندازیاری و خوێندکارێکی بە ناوی تیتاتیتۆس فەیلەسوفێکی میوانیان، کە لە شاری ئیلیاوە هاتووە،

دەبەن بۆ سەردانی سوكرات. سوكراتیش بەم دیدارە دڵخۆش دەبێت چونكە (ئیلیا) شاری پارمەنیدس و زینۆیە، كە لەپێشتر ناسیونی و ئەفلاتون لە دایەلۆگی (پارمەنیدس) دا باسی ئەم چاوپێكەوتنەی سوكرات و پارمەنیدسی كردووە. گفتوگۆی نێوان سوكرات و فەیلەسوفە میوانەكە لەسەر ئەو كێشەیەیە، كە ئایا لە شاری ئیلیا خەڵكی جیاوازی نێوان فەیلەسوف و سیاسەتمەدار و سۆفست دەكەن یان هەرسێكیان لە یەک كەسدا كۆدەكەنەوە. بۆ پێناسكردنی سۆفست، فەیلەسوفە میوانەكە (میتۆدی دابەشكردن)، كە ئەفلاتون لە دایەلۆگەكانی (فیلەبوس) و (فیدرۆس)یشدا باسی كردوە، بەكاردەهێنێت و شەش بنەما بۆ تێگەیشتن لە واتای سۆفست دەستنیشان دەكات. لەوێوە دابەشكردنەكە بەسەر گروپی بچوكتردا ڕووندەكاتەوە تاكو بە گروپی سۆفستەكان دەگات. لە پێناسەكەدا دەردەكەوێت سۆفست ئەو كەسە بە تواناوە بەدوای لاوە پارەدارەكاندا دەگەڕێت تاكو زانینیان سەبارەت چاكە پێبفرۆشت و پارەی دەستكەوێت. دەروونی ئەو لاوانە لە ڕێگەی سڕینەوە و فڕێدانی كارە خراپەكانیان پاكدەكاتەوە. هەروەها، سۆفست ئەو كەسەیە، كە دەزانێت هیچ نازانێ و هێشتا دەیەوێت ڕاستی بە خەڵكی بناسێنێ. ئەم فەیلەسوفە میوانە، وەكو سۆفستێک دەزانێ، كە ئەو نازانێ بەڵام بە جۆرێک باس لە شتێک دەكات، كە ئەو شتە ڕاست نیە و ئەو بە ڕاستی دادەنێت. گرفتەكە لێرەدا لەوێدایە، كە ئەو تێدەگات بە



ناڕاستی لەسەر شتێک دەدوێت، كە نیە. ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونەكی پارمەنیدسەوەیە. بۆ پارمەنیدس ناتوانین بڵێین شتێک نیە، ئەوەی هەیە بوونە، بوونیش پڕ و تەواوە. من لە بەشێكی ئەم نوسراوەدا لەسەر بۆچوونە مێتافیزیكییەكانی ئەفلاتون ئەم خاڵە بەدرێژی باسدەكەم و ڕوونیدەكەمەوە ئۆنتۆلۆجی پارمەنیدس، كە لەم دایەلۆگەدا ئاماژەی بۆ كراوە چ پەیوەندییەكی بە بیردۆزەی ئایدیاكانی ئەفلاتونەوە هەیە.

## (فیلەبوس)

لەم دایەلۆگەدا سوكرات لەگەڵ دوو لاودا (فیلەبوس) و (پرۆتاركۆس) لەسەر واتای خۆشی بۆ ژیان دەكەوێتە گفتوگۆ. هەرچەندە سوكرات لەم دایەلۆگەدا یەكێكە لە پاڵەوانەكان بەڵام ڕۆڵی سەرەكی پێنەدراوە. فیلەبۆسیش كەسێكی نەناسراوە. لەوانەیە ئەفلاتون خۆی ئەم ناوەی دانابێت، كە لە زمانی یۆنانییدا واتای (لاوی عاشق) دەبەخشێت. هەروەها ئەم دایەلۆگە یەكێكە لەوانەی ئەفلاتون لە دوا ساڵەكانی تەمەنیدا نوسیویەتی. ئایا ژیانی خۆش چییە؟ چۆن پەیدا دەبێت؟ لەسەر چێژوەرگرتن یان زانین ڕادەوەستێت؟ فیلەبوس، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئاماژە بۆ چێژوەرگرتن دەكات و سوكراتیش خۆشی ژیان بە زانینەوە دەبەخشێتەوە. پرۆتاركۆسیش (كوڕی كالیاس، یەكێک لە دەوڵەمەندەكانی ئەسینا و لای سۆفستەكان

فەلسەفەی خوێندوەو خۆی بە شاگردی جۆرجیاس دادەنێت) پشتگیری فیلەبوس دەکات. لە دواییدا گفتوگۆکە ڕێگایەکی دیکە دەگرێتەبەر. سوکرات دەگاتە ئەو باوەڕەی ژیانی خۆش بە تەنیا لەسەر زانین یان چێژوەرگرتن ڕاناوەستێت و بەڵکو ئەو بناخەیەی ژیانی خۆشی لەسەر دادەمەزرێت شتێکی دیکەیە؛ تێکەڵەی زانین و چێژوەرگرتنە. هەرچەندە زانین خۆشی ژیان نیە بەڵام لە چێژوەگرتن لە خۆشی ژیانەوە نزیکترە. هەروەها چەند شێوازێکی زانین و چێژ هەن، کە پێویستە ڕەچاو بکرێن و بزانین کامیان بەرەو ژیانێکی خۆشمان دەبات. لەم میتۆدی دابەشکردنەوە گفتوگۆکە بەرەو کێشەی یەکێتی فرەلایەنەکانیان دەبات. لە کۆتاییدا بەو باوەڕە دەگەن، کە ژیانی خۆش یەک ڕەهەندی نیە و(تێکەڵە)ی چەند لایەنێکە یان یەکێتییەکی فرەلایەن نیە.

**(تیمایۆس)**

ئەم دایەلۆگە لە نێوان سوکرات و تیمایۆسدا ڕوودەدات. تیمایۆس زانایەکە لە خواروی ئیتالیاوە سەردانی ئەسینا دەکات. پاڵەوانێکی خەیاڵییە و کەسێکی ڕاستەقینە نیە و ئەفلاتون دایهێناوە. دایەلۆگەکەشیان بەم شێوەیە زادەی ئەندێشەی ئەفلاتونە. هەروەها، ئەم نوسراوە شێوازی دایەلۆگی لە هەموو بەشەکانیدا وەرنەگرتوە، وەکو(ئەپۆلۆجی) زۆربەی گوتار خوێندنەوەیە. ناوەڕۆکی ئەم



نوسراوەی ئەفلاتونیش کۆسمۆلۆجییە. ئەفلاتون بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت پەیدابوونی جیهان دەردەبڕێت. تیمایۆس لە گوتارەکەیدا ڕوونیدەکاتەوە، کە چۆن دوو جیهان هەیە: جیهانی فۆرمە بەرزەکان و جیهانی بڕاوە و ئافەریدکراو. لێرەدا ئەفلاتون ڕۆڵی ئافەریدکەر(خوا) بۆ ئافەریدکردنی جیهان لەسەر شێوەی فۆرمە بەرزەکان باسدەکات.

**(کریتیاس)**

ئەم دایەلۆگە لە نێوان سوکرات و کریتیاسدایە(کریتیاس ئامۆزای دایکی ئەفلاتونە) و لەسەر چۆنیەتی بەرگری کۆمارەکەی ئەفلاتون یان ئەو دەوڵەتە چاکەی ئەفلاتون دەیەوێت دایمەزرێنێت دەکەونە گفتوگۆ. دەیانەوێ بزانن ئەو دەوڵەتە لە کاتی جەنگدا یان پەلاماردانی دوژمنەوە چۆن بەرگری لەخۆی دەکات. کریتیاس چیرۆکی جەنگی نێوان ئەسیناییەکان و ئەتلەنتییەکان دەگێڕێتەوە. گوایە ئەتلەنتیک دەوڵەتێکی پێشکەوتوو بووە، ئیتالیا و چەند بەشێکی ئەوروپا و سەروی ئەفریقای داگیرکردوە. دەوڵەتی ئەسینا بۆ ڕزگارکردنی ئەو ناوچانە لەگەڵ ئەتلەنتیک دەکەوێتە جەنگەوە و سەرکەوتوو دەبێت. دواجاریش ئەو شارە بە هۆی بوومەلەرزە (زەمین لەرزە)وە وێران دەبێت و دەکەوێتە ژێر دەریاوە. ئەم دایەلۆگەی ئەفلاتون تەواو نەبووە و بەبێ ئاکام بەجێماوە. دیارە ئەفلاتون فریای تەواوکردنی نەکەوتووە.

**(ئێپینۆمیس)**

بەگوێرەی ناوەکەی دەردەکەوێت ئەم نوسراوە پاشکۆی دایەلۆگی (یاساکان) بێت. کلینیاس و مێگیلۆس و کەسێکی دیکە لە ئەسینا میوانن و لەسەر کێشەی (زانین)، کە سەرچاوەی چاکەیە دەکەونە گفتوگۆ. دەیانەوێت ڕوونی بکەنەوە چۆن سیاسەتمەدارەکان بۆ بەرقەرارکردنی یاسای پەروەردە کار بکەن، کە لە دایەلۆگی یاساکاندا ئەفلاتون باسیدەکات. ئەم کێشەیە لە سەرەتاوە مشتومڕی لەسەر ناکرێت چونکە لەپێشدا دەبێت دەوڵەت و یاسامان هەبێت و سیستەمێکی پەروەردەشمان بۆ دروستکردنی هاووڵاتی چاک دامەزراندبێت. مێژوونوسان لەو باوەڕەدان ئەم دایەلۆگە ئەفلاتون و یەکێک لە خوێندکارەکانی (فیلیپی ئۆپوس) نوسیویانە یان ئەفلاتون دەستیپێکردوە و خوێندکارەکەی تەواویکردوە.

**(یاساکان)**

ئەگەر ئەفلاتون (ئێپینۆمیس)ی نەنووسیبێت، ئەوا ئێمە لەگەڵ (یاساکان)دا بە کۆتایی گەشتەکەمان دەگەین و لە بەردەم دوا بەرهەمی ئەم فەیلەسوفەدا ڕادەوەستین. مێژوو نوسانیش لەو باوەڕەدان مردن دەرفەتی ئەفلاتونی نەداوە پیایدا بچێتەوە یان تەواوی بکات. دوای مردنی ئەفلاتون فلیپی ئۆپۆس ئەم دایەلۆگەی بڵاو کردۆتەوە. هەروەها (یاساکان) وەکو (کۆمار) یەکێکە لە دایەلۆگە



گەورەکانی ئەفلاتون. لەم نوسراوەدا ڕۆڵی سوکرات بە تەواوی ون بووە و سێ کەسی دیکە، کە زادەی ئەندێشەی ئەفلاتونن و (کلینیاس هاووڵاتی کریت، مێگیلۆس هاووڵاتی سپارتا و هاووڵاتییەکی شاری ئەسینا، کە ناوی نەهێنراوە) بۆسەردانی شوێنی لە دایکبوونی زیۆس لەسەر چیای ئیدا لە کریت دەکەونە ڕێ. لەسەر چاکترین دەوڵەت و سەقامگیربوونی یاسا گفتوگۆ دەکەن. لە سێ بەشی دایەلۆگەکەدا (یەکەم و دووەم و سێیەم) هاووڵاتییەکەی ئەسینا باسی یاسا و دەستوردانان بۆ دەوڵەتێکی چاک دەکات. لەو باوەڕەدایە، کە پەروەردە بۆ دروستکردنی هاووڵاتی چاک پێویستە و ئەسینایییەکانیش، وەکو سپارتاییەکان دەبێت ڕوو لە دامەزراندنی دەستەڵات و بەرقەراربوونی یاسا لەسەرو سەربەستی تاکەکانەوە بکەن. لە کۆتایی بەشی سێیەمدا کلینیاس خۆی ئاشکرا دەکات، کە یەکێکە لە یاساسازەکانی کریت و داوای لێکراوە بە یاساکانی (کریت)دا بچێتەوە و چاکیان بکات. لەبەر ئەمە پێویستی بە پێشنیاری هاوڕێکانی هەیە. لێرەوە ئەفلاتون باسی یاساکانی خێزان، فێربوون، سزادان، بازرگانی و خاوەنێتی و هتد.. دەکات و بە بنەمایەکی فەلسەفییەوە دەیانبەستێتەوە.

# بەشی سێیەم

## گەشەکردنی بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە

له سەرەتای ئەم بەشەوە پرسیاری ئایا مێتافیزیک چیە؟ خۆی دەسەپێنێت. پێویستە پێش ڕوونکردنەوەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە لای ئەفلاتون لە واتای مێتافیزیک بکۆڵینەوە. ئەم چەمکە فەلسەفییە لەبنەڕەتەوە یۆنانییە و لە دوو بەش پێکهاتوە؛ (مێتا)، واتە ئەودیو، (فیزیک)یش سروشت. ئەم دوو بەشە پێکەوە واتای (ئەودیو سروشت) دەبەخشێن. ئەمە ڕوونکردنەوەی بنەڕەتی وشەکەیە و تاکو ڕادەیەک چۆنیەتی ئەم بیرکردنەوەیەمان بۆ دەردەخات. ئەوە ڕادەگەیەنێت، کە بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە مامەڵە لەگەڵ بوونێکدا لەودیو سروشتەوە دەکات. لێرەدا دوو جۆر بوون سەرهەڵدەدەن؛ سروشت و ئەوەی لەودیو سروشتەوە هەیە. ئەگەر سروشتیش بە کۆی دیاردەکان دابنێین ئەوا دابەشبوونەکە دیاردەکان و بوونی ئەودیو دیاردەکان دەگریتە خۆی. توێژینەوەیەک خۆی بەو بوونەوە یان ڕاستەقینەیەوە ماندوبکات و هەوڵی دۆزینەوەی بدات، ئەو توێژینەوەیە میتافیزیکییانەیە. ئەم جۆرە تۆژینەوەیە لەگەڵ ئەفلاتوندا گەشەی کردووە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە لە پێش ئەودا بیریاران باسی ئەودیو دیاردە یان سرەشتیان نەکردوە. پێش ئەفلاتون هەندێک فەیلەسوفی یۆنانی ئاماژەیان بۆ هێزێکی



هۆشەکی (لۆگۆس) لەودیو دیاردەکانەوە کردووە. بۆ نموونە پیتاگۆراس، هیراکلیتس و ..هتد، باوەڕیان بە لۆگۆس، وەکو هێزێک لەودیو دیاردەکانەوە هەبووە. بەڵام، مەبەستی من ئەوەیە، کە ئەفلاتون گەشەی بەو بۆچوونە داوە و لەنێو سیستەمێکی فەلسەفییدا دایمەزراندوە.

بەگوێرەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە هیچ دیاردە یان ڕووداوێک بوونێکی پێویست و سەربەخۆی نیە و بەستراوە بە هۆکەیەوە، دووکەڵ بەبێ ئاگر کەوتنەوە نابێت، مرۆڤ لەخۆیەوە پەیدا نابێت. کەوابوو بوونی دووکەڵ یان مرۆڤ ئاماژە بۆ بوونێکی دیکە لەودیو بوونی خۆیانەوە دەکەن. بەڵام ئایا ئەو بوونەی (ئەودیو) چییە و چۆنە؟ ئەم نموونانە خوێنەر بەرەو بیرکردنەوەی زانستانەش دەبات. بێگومان، زانستیش پشت بە یاسای هۆیەکی (هەموو هۆکردەیەک هۆی هەیە) دەبەستێت. ئێمە دەتوانین ئاگر بە هۆی دووکەڵ و جووتبوونی نێوان نێرینە و مێیینە، بە هۆ بۆ پەیدا بوونی مرۆڤ دابنێین. ئەمانە هۆن و دەکەونە ئەودیو دیاردەکانەوە. کەوابوو پێویستە بپرسین ، ئایا جیاوازی ئەم بۆچوونە زانستییە و مێتافیزیک چییە؟

لەوێدا، کە میتافیزیک و زانست بە دوای هۆکاندا دەگەڕێن لە یەکدییەوە نزیکن. جیاوازییەکەی نێوانیان لەگەڵ چۆنیەتی هۆکەدا سەرهەڵدەدات. زانست بە دۆزینەوەی هۆیە نزیک و ڕاستەوخۆکان ڕازی دەبێت و لەوە زۆرتر خۆی ماندوو ناکات. بەڵام توێژینەوەی

میتافیزیکییانە دەیەوێت دوورترین هۆ بدۆزێتەوە، کە لە دوای ئەو هیچ هۆیەکی دیکە پەیدانابێت و (ئەودیو)ی نیە. پزیشکێک بە دۆزینەوەی جۆری (بەکتریا) یەک بۆ نەخۆشی گەڕانەتا دەوەستێنێت و لەوێوە چارەسەری نەخۆشەکە دەکات. بیر لەوە ناکاتەوە بەکتریا چییە و چۆن پەیدابووە یان هۆی بوونی ئەو بەکتریایە چییە. لەوانەیە ئاماژە بۆ گۆڕینی ئاوو هەوا، پیسی ژینکە و لاوازی لەشی نەخۆشەکەش بکات. بەڵام ئەمانە هۆی (بوونی) بەکتریا نین، بەڵکو بارودۆخێکی یاریدەدەرن بۆ پەلاماردانی لەشی نەخۆشەکە لە لایەن بەکتریاکانەوە. لەبەر ئەمە دەبینین پزیشکەکە، وەکو زانستیار نەک بیریارێکی مێتافیزیک مامەڵە لەگەڵ دیاردەی نەخۆشییەکە دەکات. با ئەو خاڵەشمان لە بیرنەچێت، کە زانست هەوڵی دۆزینەوەی یاسا سروشتییەکان دەدات و دەیەوێت ئەو یاسایانە، کە هەمەکین و ناکەونە بەر ڕۆشنایی ئەزمونی هەستەکییەوە، بەسەر هەموو ڕووداوو دیاردەکاندا بسەپێنێت. هێشتا ئەو یاسایانە دوورترین هۆ نین و لە سروشت یان لە دیاردەکان دانابڕێن. بە دڵنیاییەوە دەڵێین ئەم یاسایانە هەمەکین و هەستەکی نین. ئەمەش لەخۆیدا خەسڵەتێکی گرنگی ڕاستەقینەی مێتافیزیکییە. یاسای هۆیەکی، ئەو یاسایەی بانگەشەی ئەوە دەکات، کە هەموو هۆکردەیەک هۆی هەیە، هەمەکییە و هۆکرد و هۆش دوو چەمکن هەرگیز ئەزموونی هەستەکی نایاندۆزێتەوە. ئێمە دەڵێین ئاگر هۆیە بۆ سوتان.



ئەمە دەستەواژەیەکی زانستانەیە. زانستیش پشت بە بە ئەزموونی هەستەکییەوە دەبەستێت و ڕەتی هەموو بیرۆکە و بۆچوونێک دەداتەوە، کە بناخەیەکی ئەزمونگەرییان نیە. ئایا ئەم دەستەواژەیە (ئاگر هۆیە بۆ سوتان) تا چ ڕادەیەک ئەزمونگەرانەیە؟

باشترین ڕێگە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە تاقیکردنەوەیە. ئێمە دەتوانین لە تاقیگەیەکدا ئاگر لە بابەتێک بەردەین و بیسوتێنین. بەم تاقیکردنەوەیە ڕاستی دەستەواژەکەمان دەسەلمێنین. بەڵام گرفتەکە لەگەڵ باسکردنی تاقیکردنەوەکەمان خۆی دەردەخات. ئەوەی ئێمە لە تاقیکردنەوەکەدا دەیبینین (هۆ) نیە؛ بەڵکو ئاگر و خەسڵەتەکانی ئاگر و ڕەنگ و شێوەی بابەتە سوتاوەکەیە. بێجگە لەم کۆمەڵە خەسڵەتە هەستەکییانە ئەزموون چی دیکەمان پێناناسێنێت. چەمکی هۆ، کە لە دەستەواژەکەدا بەکاریدەهێنین و زانست خۆی دەکات بە خاوەنی لەنێو ئەزموونی ئێمەدا نیە و ئەزموون نایدۆزێتەوە. لێرەدا دەبینین زانست پشت بە دەستەیەک یاسا دەبەستێت، کە ئەزموونی نین یان لەودیو ئەزموونی مرۆڤەوەن. ئەمەش لە خۆیدا، لەم بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەوە، نزیک بوونەوەی زانستە لە مێتافیزیکەوە. زانست دەیەوێت ڕەتی ئەو بوونانە بداتەوە، کە ناکەونە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەوە، لەلایەکی دیکەوە یاسا زانستییەکان لەودیو ئەزموونەوەن. لەم بەراوردکردنەوە دەتوانین چەند ئاکامێک دەستنیشان بکەین:

**یەکەم**، بیرکردنەوەی مێتافیزیک خۆی بە دیاردەکانەوە ماندوو ناکات و دەیەوێت ڕاستەقینەی ئەودیو دیاردەکان بدۆزێتەوە.
**دووەم**، توێژینەوەکەی بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ دۆزینەوەی دوا ڕاستەقینە یان دوورترین‌دا ڕادەوەستێت.
**سێیەمیش**، ئەو ڕاستەقینەیە ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەوە و زانینی هەستەکی نایدۆزێتەوە.
پاش ئەم ڕوونکردنەوەیەی واتای مێتافیزیک و چۆنیەتی توێژینەوەکەی ئەو خاڵە دەخەمەڕوو، کە ئەفلاتون ئەم جۆرە توێژینەوەیەی بەرەوپێشەوە بردووە و سیستەمێکی مێتافیزیکی بۆ یەکەمجار دامەزراندوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم سیستەمەدا مامەڵە لەگەڵ کێشە فەلسەفییەکانی دیکەدا دەکات. لەگەڵ ئەفلاتوندا بیرکردنەوەی فەلسەفی خەملیوە و کاریکردۆتە سەر هەموو لق و پۆپەکانی دیکەی فەلسەفە. بەڵام بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتون لەنێو بۆشاییدا پەیدانەبوە. من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا باسی ژیانی کۆمەلایەتی و ڕامیاری سەردەمەکەی ئەفلاتون و چەند بیریارێکم کرد، کە کاریگەرێتییان بە سەر بیرکردنەوەی ئەفلاتونەوە جێهیشتوە. لێرەدا بۆچوونی ئەو بیریارانە شیدەکەمەوە، کە لەم کاریگەرێتییەدا و لە پێشخستنی بیرکردنەوەی ئەفلاتوندا هاندەر و یاریدەدەربوون.
بە دیدی من، بێ ئاماژەکردن بۆ بۆچوونە فەلسەفییەکانی هیراکلیتس و پارمەنیدس و سوکرات مەحاڵە بە باشی لە بیرکردنەوەی ئەفلاتون



تێبگەین. ئەم سێ بیریارە بوون بەبناخەی سیستەمە مێتافیزیکییەکەی ئەفلاتون، کە من لێرەدا بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە باسیاندەکەم و دوایی ڕوونی دەکەمەوە چۆن کاریگەرێتییەکە سەریهەڵداوە یان چۆن ئەفلاتون بۆچوونی ئەم بیریارانەی لەنێو فەلسەفەکەیدا موتوربە کردووە.
هیراکلیتسی ئەفیسۆس لە سەدەی پێنجەمی پێش زاینیدا ژیاوە. تاکو ئەمڕۆ ڕۆژی لە دایک بوون و مردنی دیار نیە. زۆرکەم لە بارەی ژیانییەوە دەزانین. گوایە شازادە بووە، بەڵام وازی لە دەستەڵاتی ڕامیاری بۆ براکەی هێناوە و خۆی بە فەلسەفەوە خەریک کردوە.(49) بێجگە لە ئەریستۆ، کە ناوی پەرتووکەکەی هیراکلیتس دەهێنێت، مێژوونوسان بەگشتی لەو باوەڕان ئەم بیریارە پەرتووکی نەنوسیوە.(50) ئەوەی پاش خۆی بەجێ ماوە و بەدەستمان گەیشتوە کۆمەڵێک گوتەن. هەندێک لەم گوتانە لە دەستەواژەیەکی سادە و

(49) دیۆجنیس دەیگێڕێتەوە، کە ڕۆژێک هیراکلیتس لە کۆڵانێکدا لەگەڵ منداڵان یاری دەکات. چەند پیاوێک دەیبینن و گاڵتەی پێدەکەن. ئەویش دەڵێت: یاری کردن لەگەڵ منداڵان، لە یاری کردن لەگەڵ کەسانی وەکو ئێوە و سیاسەتمەدارەکانتان چاکترە. بڕوانە:
Diogenes Leartius, *Lives of Eminent Philosophers*, xi, 6, pp. 413-15 1x,6,p.413-15.

(50) Aristotle, "Rhetoric", 1407616, in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 2, Princeton: Princeton University Press, 1984.
حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵەش بکەم، کە ئەریستۆ لەم بەشەی ئەم نوسراوەیدا هەمان کات باسی شێوازی چاکی نوسین دەکات. نوسینی چاک بە ڕستەی کورت و خاڵبەندییەوە دەبەستێتەوە. لەو باوەڕەدایە گرنگە نوسەر بزانێت لە کوێدا کۆتایی بە ڕستە بهێنێت و چۆن خاڵبەندی نوسینەکەی بکات، تاکو خوینەر بتوانێت لە ناوەڕۆکی نوسراوەکە تێبگات.

ئەوانی دیکە لە دەستەواژەیەک زۆرتر پێکهاتوون، کە واتایەکی فەلسەفی و ڕەوشتی قوڵیان هەیە. لەنێو بۆچوونەکانی هیراکلیتسدا باسی دوو کێشەی گرنگ دەکەم. یەکەم، کێشەی گۆڕان و دووەمیش، لۆگۆس. هیراکلیتس یەکەم بیریارە بە ئاشکرا بانگەشەی گۆڕانێکی بەردەوامی لە بووندا کردبێت. لەو باوەڕەدایە هەموو شتێک لە گۆڕاندایە و دینامیکییە. هیچ شتێک، وەکو خۆی نامێنێتەوە. بۆ نموونە دەڵێت:

**ناتوانیت دووجار پا بخەیتە نێو هەمان ڕووبارەوە**
**چونکە ئاوەکە بەردەوام دەڕوات. (گوتەی 41)**
**خۆر هەموو ڕۆژێک نوێیە. (گوتەی 32)**
**جەنگ خاوەن دەستەڵات و باوکی هەموو شتێکە.**
**هەندێکی کردوە بە خوا و هەندێک بە مرۆڤ،**
**هەندێک کۆیلە و هەندێکیش سەربەست. (گوتەی 95)** (51)

بەگوێرەی ئەم گوتانە گۆڕان ڕاستەقینەی بوونە و حوکم بەسەر هەموو شتێکدا دەکات و دەیانکات بە هەبوویەکی کاتی. گۆڕان ڕێگە بە هیچ شتێک نادات بەردەوام بمێنێتەوە و خاوەنی ناسنامە یان (خۆیەتی) بێت. ئەم گۆڕانەش لە هەرچ جۆرە بوونێکدا سەرهەڵدات لە ئاکامی زۆرانبازی لایەنە ناکۆکەکان و جەنگی نێوانیانەوە پەیدا

(51) من ئەم گوتانەم لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا پاتریکەوە دەرهێناوە، بڕوانە:
G.T.W. Patrick, *Heraclitus of Ephesus*, with an introduction and selected biography by Lewis A. Richard, Chicago: Argonant lnc. 1969. Pp. 92-95.



دەبێت و خەسڵەتێکی دیالیکتیکیان پێدەبەخشێت. گۆڕان و زۆرانبازی نێوان لایەنە ناکۆکەکان کتوپڕ و کوێرانە ڕوونادات. هێزێک لەژێر گۆڕان و زۆرانبازییەکان و بوونی هەموو ئەو شتانەی گۆڕانیان بەسەردا دێت هەیە. ئەو هێزە یان ئەو ڕاستەقینە نادیارە بناخەیەکە بۆ یەکگرتن و ڕاوەستانی هەموو شتە جۆراوجۆر و فرەلایەنەکان. دەبێت بە یەکێتییەک بۆ هەموویان. ئەو هێزەش کوێر و بێ ئاگا نیە و مەبەستدارێتیش بە گۆڕانەکانی بوون دەبەخشێت. لەگەڵ چۆنیەتی و ڕۆڵی ئەم هێزە ئاگامەند و مەبەستدارەدا دێینە سەر کێشەی دووەم لە بۆچوونەکانی هیراکلیتسدا و باسی (لۆگۆس) دەکەین چونکە ئەو هێزە بە (لۆگۆس) ناوزەددەکات. تەنانەت بانگەشەی ئەوەش دەکات، کە بۆچوونە فەلسەفییەکانی یان ئەو ڕاستییەی سەبارەت بوونەوە دەیزانێت لە ئاکامی توێژینەوەی هۆشەکی و گەڕاندا دەستی نەکەوتووە. بەڵکو لۆگۆس بۆی دابەزاندووە و سەرچاوەیەکی پیرۆزی هەیە بۆیە لە (گوتەی 50) دا دەڵێت :"گوێ لە من مەگرە، گوێ لە لۆگۆس بگرە. ئەو کەسەی لەو باوەڕەدایە هەموو شتەکان یەکن، زانایە." واتە ئەوەی هیراکلیتس باسیدەکات زادەی هۆش و ئەندێشەی خودی ئەم بیریارە نیە و (لۆگۆس) پێی بەخشیوە. دەنگی ئەو دەنگی لۆگۆسە و گوتەکانیشی لەو سەرچاوە پیرۆزەوە هەڵقوڵاون. لەو سەردەمەدا ئەم جۆرە بانگەشەکردن و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی پیرۆز لای هەندێک فەیلەسوف ئاسایی بووە. بۆ نموونە ئیمپادۆکلیس

هەروەها پیتاگۆراس، کە پێش هیراکلیتس ژیاوە هەمان بانگەشەی کردوە و زۆر کەس باوەڕیان بە خوایەتی (حلول) پیتاگۆراس هەبوە. دوای هیراکلیتس، پارمەنیدسیش، کە من لە دواییدا باسیدەکەم، هەمان پلەی بۆ خۆی داناوە و گوایە ئەو ڕاستییەی دەیزانێت لە خواوە وەریگرتوە.

چەمکی (لۆگۆس) لە زمانی یۆنانییدا چەند واتایەکی هەیە: واتای گوتن، گوتار، گوتە، واتا، ڕاڤەکردن، باسکردن، فەرمان، بیر، هۆش، هۆ، پێوەر، ڕاستی، یاسا دواجاریش ئەو هێزە هۆشەکییەی هیراکلیتس دەگرێتەوە. هیراکلیتس لە (گوتەی1) دا دەڵێت، "هەموو شتێک بەگوێرەی ئەم لۆگۆسە پەیدا دەبێت و لەناودەچێت." لەوانەیە مەبەستی یاسای گۆڕان بێت. هەروەها لە (گوتەی 72) دا دەلێت، "من باسی لۆگۆس دەکەم، کە هەموو شتێک ڕێک دەخات". لە (گوتەی 87)دا دەڵێت، "گەمژە بە هەموو لۆگۆسێک خۆشحاڵ دەبێت." لێرەدا لۆگۆس واتای گوتە یان گوتن دەبەخشێت. دواجاریش لە (گوتەی 50)دا دەڵێت، "گوێ لە من مەگرە، گوێ لە لۆگۆس بگرە..." واتایەکی مێتافیزیکی بەم چەمکە دەبەخشێت. لەپێشتر باسمکرد، ئەم بانگەشەیە یان گەڕانەوەی زانینە فەلسەفییە بۆ سەرچاوەیەکی نادیار و پیرۆز ئاسایی بووە. لە کۆندا شاعیریش بەو کەسە دانراوە، کە لەو سەرچاوە نادیار و پیرۆزەوە ئیلهامی بۆ هاتووە. بەڵام بەگشتی فەیلەسوف خۆی ناکات بە خاوەنی ئەو بانگەشەیە و ئامادەیی خۆی



بۆ پەیوەندیکردن بەو سەرچاوەیەوە دەرنابڕێت. ڕۆڵی فەیلەسوف و میتۆدی زانینی فەلسەفییانە لە ڕۆڵی پێغەمبەر و میتۆدی زانینی ئەزمونی ئایینییەوە جیاوازە. فەیلەسوف پێغەمبەر نیە و پێغەمبەریش فەیلەسوف نیە چونکە هەردووکییان بانگەشە بۆ دوو میتۆدی جیاوازی زانین دەکەن. من ناڵێم ناوەڕۆکی بابەتە فەلسەفییەکان لێکچون و پەیوەندییان بە ناوەڕۆکی بابەتە ئایینییەکانەوە نیە یان ناتوانین پەیوەندی لە نێوانیاندا بدۆزینەوە، هەر جۆرە لێکچونێک هەبێت ئێمە فەیلەسوف و پێغەمبەر یان فەلسەفە و ئایین بە میتۆدی زانین یان ئەپستمۆلۆجییەکەیان لە یەکدی جیادەکەینەوە و بە دوو ڕێگای تەریبی دایاندەنێین.(52) بەو شێوەیەی هیراکلیتس لە زانینە فەلسەفییەکەی دەدوێت، وا خۆی دەردەخات، کە ئەو زانینەی لە (لۆگۆس) وەرگرتبێت. لەم بەستێنەوە، لۆگۆس دەسەڵاتێکی هۆشەکییە و یەکێتییەکە لە نێوان هەموو لایەنە جیاوازەکانی هەبووە فرەجۆرەکاندا. هەمان کات، سەرچاوەی گۆڕانکارییەکانیشە. هۆی ئەم بۆچوونەی هیراکلیتس، وەکو مامۆستا گۆتری بۆیدەچێت، شێوازی خوێندن و پەروەردەبوونی ئەم فەیلەسوفەیە.(53) هیراکلیتس لەژێر دەستی هیچ مامۆستایەکدا نەیخوێندووە و پەروەردە نەکراوە.

(52) ئەم خاڵە لە لایەن ئیبن توفەیل و ئیبن ڕوشدەوە باسکراوە. ئیبن توفەیل لە ڕۆمانە فەلسەفییەکەیدا حي بن يقظان بە ئاشکرا فەلسەفە و ئایین لە یەکدی جیادەکاتەوە. ئیبن ڕوشدیش ڕاستی فەلسەفییانە و ڕاستی ئایین بە دوو شتی جیاواز دادەنێت ناوی دەنێت (حقيقە مزدوجة).

(53) W.K.C. Guthrie, *A History of Greek Philosophy*, vol.1, p. 417.

وەکو هەندێک لە بیریارەکانیش شارەو شار بەدوای زانیندا نەگەڕاوە. تەنیایی و دوورەپەرێزی و خەڵوەت و شۆڕبوونەوەی بە ناخی خۆیدا هەڵبژاردووە. باوەڕی بە هەڵبەستنی پەیوەندییەکی گیانەکی بە لۆگۆسەوە هەبووە و ئەو پەیوەندییەی بە سەرچاوەی زانینە فەلسەفییەکانی داناوە. هەمان کات، هیراکلیتس (لۆگۆس) لە دەرەوەی هەبووەکاندا نابینێت و بە هێزی ناوەکی دادەنێت. ئەمەش شیوازی مێتافیزیکی (یەکانەگی بوون)ە، کە پاش هیراکلیتس لە جیهانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات چەند بیریارێک پەیڕەوییان کردوە. لەم شێوە میتافیزیکییەدا ڕاستەقینەی بوون بەرز نیە و ناکەوێتە دەرەوەی هەبووەکانەوە، بەڵکو لایەنی ناوەوە و بناخەی یەکبوونی هەموویانە. لە پەیوەندی نێوان (هەموو) لەگەڵ بەشەکاندا ئاشکرا دەردەکەوێت. هیچ بەشێک بە تەنیا بەبێ هەموەکە نیە و نابێت. بەش لە دەرەوەی هەموودا نیە؛ هەروەها ناتوانین ئەو بەشە و هەمووەکەش هاوتەراز دابنێین چونکە هەموو بەشێک نیە و بەشەکەش هەموو نیە، بەڵام لە یەکدیش دانابڕێن. دواجاریش، لە (گوتەی 31 و 66)دا، هیراکلیتس لۆگۆس بەو ئاگرە هەمیشەییە دادەنێت، کە بەردەوام هەبووەکان دەهێنێتە کایەوە و لەناویشیان دەبات و دەبێت بە هێزی دروستکەر و ڕوخێنەر.

پارمەنیدس بیریارێکی دیکەیە، کە پێویستە بۆ تێگەیشتنمان لە سیستەمی مێتافیزیکی ئەفلاتون ئاوەڕی لێبدرێتەوە. ڕۆژی لە



دایکبوونی ئەم بیریارەش بە تەواوی نەزانراوە. ئەفلاتون لە دایەلۆگەکەیدا بە ناوی (پارمەنیدس)ەوە باسیدەکات، کە ئەو کاتەی پارمەنیدس لەگەڵ زینۆی خوێندکاریدا گەیشتۆتە شاری ئەسینا، سوکرات چووە بۆ لایان تەمەنی شەست و پێنج ساڵان بووە و سوکراتیش لاو بووە و لە بیست و پێنج ساڵ تەمەنی ژوورتر نەبووە. بەگوێرەی ئەم زانیارییە و زانینی ساڵی لە دایکبوونی سوکرات (470 پ ز) دەردەکەوێت پارمەنیدس لە ساڵی (515 پ ز) لە دایک بووبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بیریارێکی سەردەمی پێش سوکراتە و دوای هیراکلیتس ژیاوە. لە سەرەتاوە لای پیتاگۆراسییەکان فەلسەفەی خوێندوە و دوایی لەگەڵ بۆچوونەکانی هیراکلیتس دا ئاشنایەتی پەیداکردووە. بۆ ماوەیەکیش لە لای زینۆفانس خوێندوویەتی. بەڵام بیروباوەڕی ئەم مامۆستایە کارینەکردۆتە سەر بیرکردنەوە فەلسەفییەکەی. زیاتر ڕێزی بۆ (ئەمایناس) بیریاری پیتاگۆراسی داناوە. گوایە پاش مردنی ئەمیناس، پارمەنیدس گۆڕی ئەميناسی هەڵبەستوە و مەزارێکی جوانی بۆ دروستکردوە.(54) پارمەنیدس یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی بە شیعر بۆچوونەکانی خۆی هۆنیوەتەوە. شیعرێکیشی، کە ئەمڕۆ (154 دێری) بە دەست ئێمە گەیشتوە و بووە بە سەرچاوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم بیریارە.

(54) Diogene, Laeritus, *Lives of Eminent Philosophers*, viii, 21-23 p. 431.

هەروەها مامۆستا گۆتری لە (میژووی فەلسەفەی یۆناندا)هەمان ڕووداوی گێڕاوەتەوە .بڕوانە:
W.K.C.Guthrie, *A History of Greek Philosophy* , vol.11, p. 3.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە پارمەنیدس، وەکو پێغەمبەرێک نەک فەیلەسوف لە(ڕاستی بوون) دەدوێت و شیعرەکەی بە بەرهەمی ئەزموونێکی (ڕۆحانی) یان سۆفیگەرانەش دادەنێت.

ئەو ڕاستییەی سەبارەت بوون و خەسڵەتەکانی بوون باسیدەکات، خۆی گوتەنی، لە زمانی خواوەندەوە دەرچووە و بە پارمەنیدس بەخشێنراوە. بۆ نموونە لە شیعرەکەیدا دەڵێت؛ خاتو خواوەندەکە دەستی گرتم و گوتی:

**مرۆڤی ژیر دوای یەک ڕێگا دەکەوێت**

**سەربەستانە دەڵێت؛**

**بوون هەیە و نەبوون نیە.**

**ئەمە ڕێگەی گەیشتنە بە ڕاستی.**

**ڕێگەی دیکە بە نەبوونت دەگەیەنێت**

**ئەم ڕێگەیە، من دەڵێم، تیایا نابینیت**

**تۆ ناتوانیت نەبوون بناسیت.**

**ئەمە مەحاڵە و ناگونجێت؛**

**بیرکردنەوە و بوون یەک شتن.**(55)

---

(55) من شیعرەکەی پارمەنیدسم لە پەرتووکەکەی (مارتن هێن)ەوە وەرگرتوە. ئەم مامۆستایەش وەرگێڕانی شیعرەکە بۆ زمانی ئینگلیزی و ژمارە دانانی بۆ دێرەکانی لەگەڵ وەرگێڕانە ئەڵمانییەکەی مامۆستا (هێرمان دیڵس)دا بەرانبەر داناوە و نەیگۆڕیون. مامۆستا هێرمان دیڵس لە ساڵی 1897 شیعرەکەی پارمەنیدسی بۆ ئەڵمانی وەرگێڕاوە و بڵاویکردۆتەوە. بڕوانە:
Martin J. Henn, *Parmenides of Elea*, A verse translation with interpretative essay and commentary to the text, London: Praeger, 2003. B2, p. 25.



کێشەی (بوون هەیە) لەم دەستەواژەیەدا دانراوە تۆتەلۆجی یان کانت گوتەنی دەستەواژەیەکی شیکارییە و بارەکە هیچ زانیارییەکی نوێ یان واتەیەکی جیاوازتر ناخاتە سەر بارهەڵگرەکە. وەکو دەستەواژەی (مرۆڤ مرۆڤە)وایە. ئەمە لە ڕوویەکی لۆجیکییەوە دروستە بەڵام با ئەوەشمان لە بیرنەچێت دەستەواژەی(بوون هەیە)، کە بە دەستەواژەی دووەمەوە (نەبوون نیە) گرێدراوە دەروازەی توێژینەوەیەکی نوێی ئۆنتۆلۆجییانە و ڕاستی بوونمان بۆ ئاوەڵا دەکات. دەبێت بە سەرەتای بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی نوێ لەسەر زەمینەی ئۆنتۆلۆجی پارمەنیدس و (نەبوون) ڕەتدەکاتەوە. ڕەتدانەوەکەش لەسەر ئەو خاڵە ڕادەوەستێت، کە ئەوەی ئێمە دەیزانین بوونە یان سەبارەت بوونە و(نەبوون) هەرگیز نا ناسرێت. کەوابوو ناتوانین لەبارەی نەبوونەوە بدوێین یان زانینمان لەسەری هەبێت. ئەگەر مرۆڤیش زانینی لەبارەوە نەبێت، چۆن بوونی دەسەلمێنێت یان دەڵێت هەیە.

لێرەدا بوون و بیرکردنەوە بە یەک شت دادەنرێن و ئۆنتۆلۆجیش دەبێت بە زەمینەی ئەپستمۆلۆجی. پاش ناسینی ڕاستی بوون، ئەو ڕاستییەی دەبێت بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ هەبووەکان و هەروەها ڕەتدانەوەی نەبوون، پارمەنیدس دێتە سەر ئەو خاڵەی، کە (بوون) سەرەتا و کۆتایی نیە. نە پەیدا بووە و نە لەناودەچێت. لە گۆڕان بەردەوە و ڕاستییەکی هەمیشەییە و هەستکردن پەی پێنابات؛

**ئەوەی بڕوای بە بوون هەیە**

**لەسەر ڕێگای ئەم هێمایانە دایدەمەزرێنێت؛**

**بوون لەناوناچێت و هەرگیز ناڕوخێت،**

**بێ کۆتاییە و لە هەموو لاکانەوە پڕو تەواوە.**

**نەهەبووە و نەدەبێت؛ نەڕابردوو نەداهاتووی هەیە**

**بوون یەک شتە و هەمیشە بەردەوامە**.(56)

ئەم بوونە، مرۆڤێک، درەختێک یان مێزەکەی بەردەستم نیە. بوونێکی گشگرە و لە هەموو لایەکەوە پڕو تەواوە و هەموو شوێنێکی داگیرکردوە. هیچ شتێک بەبێ ئەو نابێت. ئەویش لە (هیچ)ەوە پەیدانەبووە و بەرەو هیچ ناڕوات، یان (نەبوون)، وەکو لایەنێکی دژوەستاو لە بەرانبەریدا ڕاناوەستێت. لەبەر ئەمە گۆڕانیشی بەسەردا نایەت و وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

لەم ڕووەوە پارمەنیدس دەڵێت؛

**ئاسانە تێبگەیت**

**لە هیچەوە تەنیا هیچ پەیدا دەبێت**

**تەنیا بوون سەرچاوەی پەیدابوون و لەناوچوونە**.(57)

لێرەدا دوو کێشەی ئۆنتۆلۆجی گرنگ هەن، لە دوای پارمەنیدس بەردەوام لە مێژووی فەلسەفەدا سەریان هەڵداوەتەوە؛ یەکەم کێشەی هەمیشەبوونی جیهان و دووەم کێشەی گۆڕانە. یەکەمیان، وەکو

(56) هەمان سەرچاوە. ل 23.

(57) هەمان سەرچاوە. ل 26.



دەزانین لای هەموو ئەو بیریارانەی لەژێر کاریگەریتی بیردۆزەی ئافەریدبوونی جیهان لەلایەن دەستەڵاتێکی بەئاگاوە مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە. تەنانەت بیریارە موسوڵمانەکانیش لە کەندییەوە بۆ ئیبن ڕوشد لە سەر ئەم کێشەیە لەلایەن زانایانی ئاینییەوە بەرەنگاری کراون و هەندێکیان سزادراون. ئەگەر لە هیچەوە تەنیا هیچ پەیدابیبێت، ئەوا ئێمە ناتوانین بڵێین لە پێش ئافەریدبوونی جیهاندا (هیچ) شتێک نەبووە و جیهان لەو (هیچ)ەوە پەیدابووە. لەم ناکۆکییەوە ئەریستۆ، بۆ نموونە، بەو باوەڕە دەگات، کە لەگەڵ هۆی یەکەمدا (هیۆلی) یان ئەستویەکی لە فۆرم بەدەر (هەمیشە) هەبووە و هۆی یەکەم، کە هۆیەکی بەئاگایە فۆرمێکی دیاریکراوی بە بەردا کردوە. لەم بۆچوونەی ئەریستۆوە هۆی یەکەم ئافەریدکەری جیهان یان هیۆلی نیە، بەڵکو ئافەریدکەری فۆرمەکەیەتی و لەو پەیکەرسازە دەچێت، کە پەیکەرێکمان لە بەردێک بۆ دادەتاشێت. پەیکەرسازەکە بەردەکە ناهێنێتە بوونەوە و ئافەریدی ناکات، بەڵکو فۆرمی پەیکەرەکە بەو بەردە دەبەخشێت. بەم شێوەیە بۆ ئەریستۆ، هۆی یەکەم (هیۆلی) ئافەرید نەکردوە. ئافەریدکردنی هیۆلی دەبێت لە هیچەوە یان لە هێۆلییەکی لەپێشترەوە بێت. لە حاڵەتی یەکەمدا هیچ شتێک لە هێچەوە نایەتە بوونەوە، پارمەنیدس گوتەنی؛ هیچ سەرچاوەی هیچە. لە حاڵەتی دووەمیشدا ئەگەر هیۆلییەکی لەپێشتر هەبێت؛ یان لە پێش ئەو هیۆلییەدا هیۆلییەکی دیکە هەبێت چ

پێویست دەکات هیۆلی دووەم لە یەکەم دەربهێنین؟ ئەگەر ئەم کارەش بکرێت ئەوا گەڕانەوەکە بۆ بنەڕەت بەردەوام دەڕوا و ناگاتە کۆتایی و دوا بنەڕەتمان دەست ناکەوێت. لەبەر ئەم هۆیە (بوون) بۆ پارمەنیدس ئافەریدنەکراوە و ڕاستەقینەیەکی هەمیشەییە. دووەمیش، مادام (نەبوون) نیە، ئەوا بوون گۆڕانی بەسەردا نایەت و نەگۆڕ و وەستاوە. گۆڕان لە بوونەوە بۆ نەبوون، کە دەبێت بە تێکشان و لەناوچوون، هەروەها لە نەبوونەوە بۆ بوونە و ئەمەش دەبێت بە زەمینە بۆ پێکهینان. ئەگەر لەگەڵ پارمەنیدس هاوڕا بین و باوەڕ بە (نەبوون) نەکەین، ئەوا هەردوو دیوی گۆڕان: لە بوونەوە بۆ نەبوون و لە نەبوونەوە بۆ بوون دەبن بە لە بوونەوە بۆ بوون. هەر شتێکیش لە بوونەوە بۆ بوون بڕوات گۆڕانی بەسەردا نایەت. گۆڕان پێویستی بە لایەنە ناکۆکەکان هەیە. شتێکی سپی گۆڕانی بەسەردا دێت ئەگەر ببێت بە ڕەش. بەڵام لە ڕەنگی سپییەوە بۆ سپی یان لە ڕەشەوە بۆ ڕەش بە گۆڕان دانانرێت. بوونیش لایەنی ناکۆکی نیە و نابێت بە نەبوون یان به شتێکی جیاوازتر لە خۆی. بێجگە لەم خەسڵەتانە ڕاستی بوونیش ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی هەستکردنەوە. راستییەکە تەنیا (هۆش) یان زانینی هۆشەکی دەتوانێت بیناسێت. لە ئاستی ئەم ڕاستییەدا چاو کوێرە و گوێچکە کەڕە چونکە (بوون) ئەم شتە و ئەو شتە نیە و ڕاستەقیینەی هەموویانە. ئەو بناخەیەیە، کە هیچ شتێک



بەبێ ئەو نیەو نابێت؛ هیچ زانینێک بە بێ ئەو پەیدانابێت. بەبێ بوون بیر لە هیچ شتێک ناکرێتەوە.

لێرەدا، ئێمە دوو ڕاڤەکردنی جیاوازمان بۆ ڕاستەقیینە ڕوونکردۆتەوە. لەلایەکەوە لە بۆچوونەکەی هیراکلیتسەوە ڕاستەقیینە بە دینامیکی و گۆڕینۆک دادەنێن. لەلاکەی دیکەوە، وەکو پارمەنیدس ئەو ڕاستەقینەیە بە نەگۆڕ و گشتگر لە قەڵەم دەدەین و گۆڕان لە بووندا ڕەتدەکەینەوە. زینۆی شاگردی پارمەنیدسیش بە بەڵگە ناسراوەکەی لەنێو نموونەکانی پێشبڕکێی نێوان ئەخیلۆس و کیسەڵەکەدا و تیر وەشاندنەکە لۆجیکمەندانە پشتگیری ڕاڤەکردنەکەی پارمەنیدسی کردووە و هەوڵیداوە پوچەڵی گۆڕانکاری بسەلمێنێت، کە ئەمڕۆ بە پارادۆکسی زینۆ ناوزەد دەکرێت.

ئەو پرسیارەی پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە خۆی دەسەپێنێت ئەوەیە، ئایا ئەفلاتون پشتگیری چ ڕاڤەکردنێک دەکات؟ ئایا سیستەمە میتافیزیکییەکەی لەسەر زەمینەی چ بۆچوونێک دادەمەزرێنێت؟ ئەفلاتون بۆچوونەکانی هیچ کام لەم بیریارانە ڕەتناداتەوە بەڵکو هەردووکیان تێهەڵکێش دەکات. لەوانەیە ئەم تێهەڵکێشکردنە لای خوێنەر جێگەی سەرسوڕمان بێت و ئەو پرسیارەی لادروست بێت، کە چۆن دوو جۆر ڕاڤەکردنی ناکۆک بۆ ڕاستەقینەیەک تێهەڵکێش دەکرێن و لەنێو یەک سیستەمدا جێگەیان دەبێتەوە؟ من وەڵامی ئەم پرسیارە دوایی ئامادە دەکەم. ئێستا گرنگە باسی ڕێچکە (میتۆد)ی ئەفلاتون

بکەین و بزانین چ جۆرە ڕێچکەیەکی بەکارهێناوە و ئەو ڕێچکەیەشی لە کوێوە هێناوە.

توێژینەوە لەسەر ڕێچکە لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا گرنگە و چونکە یارمەتیمان دەدات بزانین چۆن ئایدیا (فۆرمە بەرزە) نەگۆڕەکان دەدۆزرێنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت ئاوەڕ لە سوکرات بدەینەوە و کاریگەرێتییەکەی بەسەر بیرکردنەوەی ئەفلاتونەوە دیاریبکەین. لەپێشتر باسمانکرد، سوکرات هیچ دەقێکی فەلسەفی نەنوسیوە و ڕۆژانە لەگەڵ خوێندکار و میوانەکانییدا لە شوێنە گشتییەکاندا یان لە ماڵاندا لەسەر کێشە فەلسەفییەکان مشتومڕی کردوە. ئەم مشتومڕو گفتوگۆکردنە شێوازێکی تایبەتیان هەبووە. ئەمڕۆ بە هۆی ئەو شێوازەوە بە (ڕێچکەی سوکرات یان میتۆدی سوکرات) دەناسرێت. من، لێرەدا، پرۆسەی گفتەگۆکردنەکە یان ڕێچکەی سوکرات، بۆ مەبەستی تێگەیشتنێکی باشتر بەسەر چەند قۆناخێکدا دابەش دەکەم و خەسڵەتی هەر یەکێک لە قۆناخەکانیش ڕووندەکەمەوە.

لە قۆناخی یەکەمدا و لە سەرەتاوە، سوکرات لە گفتوگۆکردنەکەیدا لەسەر کێشەیەکی فەلسەفی، بۆ نموونە دادوەری بە جۆرێک خۆی دەردەخات، کە هیچ شتێک لەبارەی ئەو کێشەیەوە نازانێت. بێگومان، ئەمەش ڕاست نیە و سوکرات بە مەبەستەوە ئەم هەڵوێستە هەڵدەبژێرێت. ئەم هەڵوێستەی سوکرات (گاڵتەجاڕی)یە بۆیە بە (گاڵتەی سوکرات) ناودەبرێت. لە دایەلۆگی (مینۆ)دا، سەبارەت واتا



و پێناسەی (چاکە) مینۆ پرسیار لە سوکرات دەکات. سوکراتیش خۆی وانیشان دەدات، کە هیچ نازانێت و ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە. تەنانەت کەسیشی نەدۆزیوەتەوە زانیاری لەسەر چاکە هەبێت؛

**سوکرات:** مینۆ، منیش لەسەر ئەم کێشەیە، وەکو هاووڵاتییە هەژارەکانم. سەبارەت ئەم نەزانینەشم گلەیی لە خۆم دەکەم. ئەگەر شتێک نەزانم چۆن باسی بکەم؟ لەو باوەڕەدایت کەسێک (مینۆ)ی نەدیبێت بتوانێت باسی جوانی و دەوڵەمەندی و خێزانەکەشی بکات یان خەسڵەتە خراپەکانی دەربخات؟

**مینۆ:** ئەمە دروستە، بەڵام ئایا تۆ ڕاست دەکەیت، کە واتای چاکە نازانیت؟ ئایا من ئەمە بە هاووڵاتیانی شارەکەم بڵێم؟

**سوکرات:** تەنیا ئەوەیان بۆ مەگێڕەوە، کە من تاکو ئەمڕۆ کەسم نەدیوە ئەو زانینەی هەبێت.(58)

خۆدەرخستنی سوکرات بەو شێوەیەی هیچ زانیارییەکی لە بارەی واتای چەمکی (چاکە)وە نیە، مینۆ دەخاتە نێو حاڵەتێکەوە، کە بە ڕاکشاوی و بێ ترس بەرانبەر سوکرات بۆچوونەکانی خۆی دەربڕێت. سوکرات دوو مەبەستی لەم هەڵوێستەدا هەیە:

**یەکەم**، هێمن کردنەوە و لابردنی ترس لەلای کەسەکەی بەرانبەری، تاکو سەربەستانە بۆچوونە کانی باسبکات.

(58) Plato, “Meno”, in *Plato: Complete Works*, 71 b- c, p. 871-72.

**دووەمیش**، کاریگەرێتی سوکرات بەسەر ئەو کەسەوە جێدەهێڵێت.

لە قۆناخی دووەمدا، پاش ئەوەی سوکرات سەبارەت واتای چەمکەکە یان پێناسەکردنی خۆی بە نەزان دادەنێت ئەو کێشەیەی لەژێر توێژینەوەدایە، دەکەوێتە بەر ڕۆشنایی پرسیارکردن. لەم قۆناخەدا، بەرنبەرەکە وەڵامێک یان چەند وەڵامێک بۆ پرسیارەکان دەخاتە بەردەم سوکرات و بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕێت. بەڵام ئایا سوکرات بە وەڵامەکان ڕازییە؟ ئایا بۆچوونەکانی بەرانبەری بە تەواو دادەنێت؟ لەم پرسیارانەوە ئێمە دەستنیشانی قۆناخی سێیەمی ڕێچکەی سوکرات دەکەین، کە من بە قۆناخی هەڵوەشاندنەوەی دادەنێم. سوکرات وەڵامی بەرانبەرەکەی هەڵدەسەنگێنێت و دەیخاتە بەر نەشتەری ڕەخنەو هەڵیدەوەشێنێتەوە. لایەنە ناتەواوەکانی دەردەخات، تاکو بەرانبەرەکەی بەو ڕایە بگەیەنێت، کە وەڵامەکە جێگەی خۆی نەکردۆتەوە و بە دوای وەڵامێکی چاکتردا بگەڕێت، نموونەی بەردەستیش گفتوگۆکەی نێوان سوکرات و (پۆلیمارکۆس)ە لە دایەلۆگی (کۆمار)ی ئەفلاتوندا:

**ئایا دادوەری ئەوەیە، کە قەرزەکانت بەبێ مەرج بدەیتەوە؟ یان ئەم کارە هەندێک جار ڕەوایە و جاری دیکەش ڕەوا نیە؟ بۆ نموونە، ئەوەیە، کە ئەگەر مرۆڤێک چەکێکی لای هاوڕێکەی دانابێت و ئێستا ئەو مرۆڤە شێت بێت، بچێت داوای چەکەکەی لە هاوڕێکەی بکاتەوە، ئەگەر هاوڕێکەی**



**چەکەکەی نەداتێ کارێکی ناڕەوای کردوە و نابێت کەسیش حوکم بەسەر باری هۆشەکی کەسێکی دیکەدا بدات.**

**بەڵێ وایە.**

**کەوابوو، پێناسەی دادوەری گوتنی ڕاستی و قەرزدانەوە نیە**.(59)

ئەم قۆناخە دەستکەوتێکی مەزنی بیرکردنەوەی تێدایە. دۆگماکان و بۆچوونە ناتەواوەکان هەڵدەوەشێنێتەوەو دەیانخاتە بەر نەشتەری ڕەخنە. سوکرات دەیەوێت لە تێگەیشتن لە واتای چەمکە فەلسەفییەکاندا چەند ڕێگە و بۆچوونی جیاواز دیارییبکات و هاوکات ڕوونیبکاتەوە، کە هیچ کام لەو بۆچوونانە ڕەها نیە و دەتوانین هەڵیبوەشێنینەوە. پرسیارکردنیش بناخەی هەڵوەشاندنەوەکەیە. بێگومان ئەم قۆناخەی ڕێچکەی سوکرات لە سەردەمەکەماندا ئاشکرا بەکاردێت و بووە بە زەمینە بۆ (بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە). لە زۆربەی توێژینەوە فەلسەفییەکان و زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەکاردەهێنرێت. لە قۆناخی چوارەمدا، چاوەڕوانی وەڵامێکی تەواو و هەمەکی بۆ پێناسەکردنی چەمکەکە دەکرێت. دەمانەوێت سوکرات لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بۆچوونەکانی بەرانبەرەکەی وەڵامێکی چاکترمان بۆ ئامادە بکات. بەڵام ئایا سوکرات دەتوانێت دوا وەڵاممان بداتێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسان نیە و هۆکەشی بۆ دوو خاڵ دەگەڕێتەوە؛

(59) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی یەکەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2009. ل 16- 17.

**یەکەم**، سوکرات لەو باوەڕەدایە هەموو مرۆڤێک بە زکماکی زانینی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە و ئەوەی فێریدەبێت (بیرکەوتنەوە)یە. لەبەر ئەمە ڕۆڵی سوکرات لەم گفتوگۆیانەدا، وەکو ڕۆڵی دایکی، کە مامان بووە، دەرهێنانی زانینە لە ناوەوەی مرۆڤەکان بۆ دەرەوە.

**دووەم**، ئێمە دەزانین سوکرات هەوڵیداوە پێناسەیەکی نەگۆڕ بۆ چەمکەکان دروست بکات و واتایەکی هەمەکییان پێ ببەخشێت بەڵام بەم ئاکامە نەگەیشتوە. لە زۆرینەی دایەلۆگەکانی قۆناخی سەرەتایی ئەفلاتوندا، کە باسی مشتومڕی سوکرات لەسەر ئەم چەمکە فەلسەفییانە دەکەن، دایەلۆگەکان بەبێ گەیشتن بە ئاکام کۆتاییان دێت. دەشێ سوکرات نەیتوانیبێت ئاکامەکان دیارییکات یان دەرفەتی پێنەدراوە سیستەمێکی فەلسەفی دامەزرێنێت. ئەفلاتون ئاکامەکان دیاریدەکات و لەسەر ڕێچکەی مامۆستاکەی خۆی بە واتایەکی هەمەکی و نەگۆڕ بۆ هەر یەکێک لەو چەمکانە دەگەیەنێت. ڕێچکەی سوکرات یاریدەی ئەفلاتونی داوە بە بەرزترین و تەواوترین فۆرم یان چەمک بگات، کە لە ژوور ئەوانەوە فۆرمێکی بەرزتر نادۆزێتەوە. ئەفلاتون ئەم ڕێچکەیەی لە سیستەمە مێتافیزیکییەکەیدا بەکارهێناوە. لە دایەلۆگی (سەمپۆزییەم)دا بۆ دۆزینەوەی واتاو فۆرمی جوانییەک، کە هەمەکی و نەگۆڕە پەیڕەوی کردنی ئەم ڕێچکەیە ئاشکرایە و لەوێوە بۆمان دەردەکەوێت چۆن ئەفلاتون بەو باوەڕە گەیشتوە، کە ئەم فۆڕمە هەمەکییانە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا هەن.



پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە، کاتی ئەوە هاتووە بزانین ئەفلاتون چۆن سودی لە بۆچوونە فەلسەفییەکانی هیراکلیتس و پارمەنیدس و سوکرات وەرگرتووە. لەپێشتریش ئاماژەم بۆ ناکۆکی نێوان بۆچوونەکانی هیراکلیتس و پارمەنیدس لەسەر کێشەی چۆنیەتی ڕاستەقینە کرد. ئەو خاڵەم باسکرد، کە هیراکلیتس باوەڕی بە گۆڕانکاری بەردەوام و ڕاستەقینەی گۆڕینۆک هەیە و پارمەنیدس گۆڕانکاری ڕەتدەداتەوە و جەخت لەسەر وەستان و نەگۆڕی بوون دەکات. سوکراتیش لە ڕێچکەکەیدا لە گۆڕانەوە بۆ نەگۆڕان و لە هەندەکییەوە بۆ هەمەکی دەڕوات. ئەفلاتون بەبێ ترس ئەم لایەنە ناکۆکانەی تێهەڵکێش کردووە و سیستەمێکی مێتافیزیکی لەسەر دامەزراندوە. باوەڕی بە نەگۆڕ و گۆڕانیش هەیە. بە دیدی ئەو، ئێمە ناتوانین نکۆڵی لە گۆڕانکاری بکەین، هاوکات، لەو دیو گۆڕانکارییەکانەوە ڕاستەقینەیەکی نەگۆڕ هەیە. بەڵام ئایا چ شتێک گۆڕانی بەسەردا دێت؟ یان چ شتێک ناگۆڕێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لای پارمەنیدس ئاشکرایە. مادامەکی (بوون هەیە) و (نەبوون نیە) ئەوا بوون ناگۆڕێت چونکە گۆڕان لە بوونەوە بۆ نەبوون یان لە نەبوونەوە بۆ بوونە، نەک لە بوونەوە بۆ بوون یان لە نەبوونەوە بۆ نەبوون. ئایا مەبەستی پارمەنیدس لە ڕەتدانەوەی (نەبوون) چییە؟ بۆچی بوون هەیە و نەبوون نیە؟ نەبوون نیە چونکە ئێمە هیچ لەبارەیەوە نازانین. ئەوەی دەیزانین لە بارەی بوونەوەیە. هەروەها، بوون، وەکو

پارمەنیدس بۆیدەچێت، لە هەموو لایەکەوە پڕو تەواوە. هەر شتێک پڕو تەواوبێت لە کەم و کورتی بەدەرە و هیچی کەم نیە. هیچ جۆرە (نەبوون)ێکی نیە و بە کەمییەوە نایەتە کایەوە. لەبەر ئەمە بوون هەژار نیە و پڕو تەواوە و گۆڕانی بەسەردانایەت. گۆڕانکاری ئاکامی کەمی و هەژارییە و ئاماژە بۆ جۆرێک نەبوونی لە بووندا دەکات. گۆڕانکاری لە بووندا ئەوە دەگەیەنێت، کە بوون لە کەم و کورتی بەدەر نیە و بە تەواوکۆیی نەگەیشتوە. ئەو کاتەی بە تەواوکۆیی دەگات گۆڕانکارییەکانیش لەنێویدا تەواو دەبن و دەوەستن ئیدی بوون لەوە زۆرتر بەچی دیکە نابێت و خۆی بە پلەی ڕەهایی دەگەیەنێت. لەم بۆچوونەوە، ئەگەر بوونێکی تەواوکۆ هەبێت، ئەوا دەبێ نەگۆڕێت. گۆڕان خەسڵەتی ئەو بوونانەیە بە کەمییەوە پەیدادەبن و بە نەبوونییەوە هەن.(60) لێرەدا، ئەفلاتون ڕاڤەکردنەکانی هیراکلیتس و پارمەنیدس بە دروست دادەنێت. لەلایەکەوە باوەڕی بە بوونێکی پڕ و تەواوکۆ هەیە. لەلایەکی دیکەشەوە، لەو باوەڕەدایە هەبووەکان بە کەمی و ناتەواوییەوە پەیدادەبن و بەردەوام لە گۆڕاندان. کەوابوو، ڕاستەقینە دوو لایەنییە: گۆڕاو لەگەڵ نەگۆڕ. لەژوور هەموو شتێکی هەندەکی و گۆڕاوەوە ڕاستییەکی هەمەکی نەگۆڕ هەیە. لەم بەستێنەوە بۆ یەکەمجار سیستەمێکی مێتافیزیکی لەسەر تێڕوانینێکی

(60) من ئەم کێشەیەم لەنوسراوێکمدا لەسەر واتای بوون لای پارمەنیدس، کە لە کتێبێکی دوو بەرگیدا بەناوی *An Anthology of Comparative Philosophy* لە ساڵی 2011 لە لەندەن لەچاپ دەدرێت، باسکردوە.



دووانەکی بوون سەرهەڵدەدات. بۆچوونی مێتافیزیکییانە لە دایک دەبێت، کە جیهان دەکات بە دوو بەشی جیاوازەوە: بەرز و نزم، نەگۆڕ و دینامیک، تەواوکۆ و کەم، هەمەکی و هەندەکی. ئەم دوو بەشەیە لەنێو یەکدا ناژین و جیاکراونەتەوە. ئەگەر لۆگۆسی هیراکلیتس هێزی ناوەکی جیهان بێت یان هیچ شتێک لە دەرەوەی ئەو بوونەدا نەبێت، کە پارمەنیدس باسیدەکات، بۆ ئەفلاتون جیهانی بەرز لەژوور و لە دەرەوەی جیهانی نزمدایە و پێکەوەنین. پەیوەندییەکەیان لەگەڵ پەیوەندی لایەنی دەرەکی و ناوەکی یان دەروون و لەشەوە بەراورد ناکرێت.

ئەفلاتون بانگەشەی سیستەمێکی مێتافیزیکی دووانەکی دەکات و یەکانەکی بوون ڕەتدەداتەوە. پەیوەندییەکی هۆکاریش لەنێوان ڕاستەقینە و دیاردەکاندا دادەمەزرێنێت، کە لە دواییدا باسیدەکەم. ڕاستەقینە لەنێو دیاردەکاندا خۆی نەشاردۆتەوە و دیاردەکانیش بەشێکی نەپچڕاوی ئەو نین. ڕاستەقینە و دیاردە دوو شتی جیاواز و لە یەکدی دابڕاون. لە بۆچوونەکانی هیراکلیتس و پارمەنیدسدا، لوگۆس و بوون لە دیاردەکانەوە جیاوازن، بەڵام جیاوازییەکەیان لە یەکدی دابڕان و جیابوونەوە نیە. لۆگۆس یان بوون بووە بە زەمینە و ناوەڕۆکی هەموو دیاردەیەک. لایەنی ناوەوە و ڕاستەقینەی هەموو شتێکە. ئەم بۆچوونە یەکانەکییە یان مۆنیزمە لەنێو فێرگە فەلسەفییە سروشتناسەکانی پێش سوکراتیشدا باو بووە.

تالیس، کە ئاو بە بنەڕەتی بوون دادەنێت و لەو باوەڕەدایە هەموو شتێک لە ئاو دروست بووە، ئەم بنەڕەتە لە شتەکان جیاناکاتەوە و بە ناوەڕۆک و ڕاستەقینەی ناوەکی هەموو شتێکی دادەنێت. لەم ڕووەوە، ئەفلاتون یەکەم بیریارە خۆی لە ڕاڕەوی یەکانەکی دوور دەخاتەوە و سیستەمێکی مێتافیزیکی دووەلیست دادەمەزرێنێت. ئەمەش سەرەتای ئەو بیرکردنەوە مێتافیزیکییەیە ڕاستەقینە بە شتێکی جیاوازتر لە دیاردە و لە ژوور دیاردەوە دادەنێت. پەیوەندییەکەی نێوانیشیان تەنیا لە سەرێکەوە بە (پێویست) دەبینرێت. ڕاستەقینە پشت بە دیاردە بۆ بوونی نابەستێت بەڵام دیاردە بە بێ ڕاستەقینە نیە و نابێت.

بیریارانی پاش ئەفلاتون، وەکو ئەریستۆ و بیریارە موسوڵمانەکانی، وەکو فارابی و ئیبن سینا، لەسەر ئەم جیاوازییە ئاماژەیان بۆ دوو جۆر بوون کردووە؛ پێویست و گونجاو. پەیوەندی نێوان ئەم دوو جۆرەی بوونیشیان لەبەر ڕۆشنایی مێتافیزیکە دووەلیستییەکەی ئەفلاتون ڕوونکردۆتەوە.(61)

ئەگەر جیاکردنەوەی ڕاستەقینە لە دیاردەوە بە بۆچوونی مێتافیزیکانە دابنێین، ئەوا ئەفلاتون بە یەکەم بیریاری مێتافیزیک دادەنرێت و دامەزرێنەری ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە یە، کە پاش خۆی ئەریستۆ

(61) ئەریستۆ، مێتافیزیک، بەشی دێلتا، چاپی یەکەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2008، ل 102- 103.
هەروەها بڕوانە: الفارابي، آراء أهل المدينة الفاضلة، ص 74.



بەزانستی خواناسی یان (تیۆلۆجی) ناوزەدیدەکات.(62) مێتافیزیک لەسەر جیاکردنەوەی نێوان ڕاستەقینە و دیاردە ڕاناوەستێت. ئەم جیاکردنەوەیە لەنێو وەڵامدانەوەی پرسیاری ئایا ڕاستەقینە چییە؟ دێتەکایەوە. ئەم پرسیارە بنەڕەتییە و جێگەیەکی گەورەی لە بیرکردنەوەی فەلسەفییدا داگیرکردوە. ئایا چ شتێک بە ڕاستەقینە دادەنرێت؟ واتای ڕاستەقینە چییە؟ ئایا ئەو شتانەی ئێمە هەستیان پێدەکەین و ڕۆژانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین ڕاستەقینە نین؟ ئەگەر ڕاستەقینە نەبن ئایا چین؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا ئەفلاتون شتەکانی دەوروبەرمان، کە ڕۆژانە هەستیان پێدەکەین بە ڕاستەقینە دانانێت. ئەمەش پەیوەندی بە تێگەیشتنی ئەفلاتون بۆ ڕاستەقینە هەیە. ئەو ڕاستەقینە بە نەگۆڕ و چەسپاو دادەنێت. بەو زەمینە نەجوڵاوەی دەبینێت، کە بوونی شتەکانی لەسەر ڕادەوەستێت. وەڵامەکەی ئەفلاتون جێگەی سەرسوڕمانە، بەتایبەتی بۆ بیریارانی سەردەمەکەی خۆی.

بەڵام با بە وردی سەرنجێکی بۆچوونەکەی بدەین و بزانین لە چ ڕوویەکەوە لەنێو ڕاستەقینەدا ناژین و چۆن هەستکردن ڕاستەقینەمان پێ ناناسێنێت.

ئێمە ڕۆژانە هەست بە شتەکانی دەوروبەرمان دەکەین؛ دەیانبینین، گوێ لە دەنگیان دەگرین، تامیان دەکەین و دەستیان لێدەدەین.

(62) بڕوانە ئەریستۆ، مێتافیزیک، بەشی ئێپسیلۆن، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، چاپی یەکەم دەستگای سەردەم، سلێمانی ، 2008، ل 133.

خەسڵەتە هەستەکییەکانیان؛ ڕەنگ، دەنگ، تام، بۆن و شێوەیان دەخوێنینەوە. ئایا ئێمە تاکو چ ڕادەیەک خوێندنەوەکانمان یان هەستکردن بەم خەسڵەتانە دروستن و ڕاستی دەپێکن؟ بەرگی پەرتووکەکەی بەردەمم لەسەر مێزەکە شینە. ئەم هەستکردنە لای من دروست بووە و دەتوانم باسی بکەم بەڵام ئەگەر کەسێک ڕەنگ کوێر بێت چۆن بڕیار لەسەر ڕەنگی (شینی) بەرگی پەرتووکەکە دەدات؟ ئایا بۆ ئەویش ڕەنگی بەرگەکە شینە؟ هەروەها کاڵی و تۆخی ڕەنگەکان بەگوێرەی ڕووناکی دەگۆڕێن. هەنگوینیش بۆ من شیرینە و بۆ کەسێکی نەخۆشی تا بەرز تاڵە. چیایەک لە دوورەوە بچووک و لە نزیکەوە گەورەیە. لەسەرو ئەم نموونانەشەوە، ڕەنگی خوێن سورە و لە ژێر میکرۆسکۆپدا شینە. مێزە سەر لوسەکەی بەردەمم بە ڕووبەرە پانەکە و چوار پاکانییەوە لە ژمارەیەکی زۆر لە ئەتۆم و ئەتۆمیش لە چەند بەشێکی دیکە، کە من بەچاو نایانبینم پێکهاتوە. ئەو بابەتانەی لەنێو خەودا دەیانبینم لەگەڵ بەئاگاهاتنەوەم ووندەبن و جارێکی دیکە نایاندۆزمەوە. ئەگەر ڕەنگی بەرگی پەرتووکەکە، تامی هەنگوین، سوری خوێن، پانتایی چیاکە و ڕووبەری لوسی مێزەکە ڕاستەقینەی ئەو شتانە بوونایە ئەوا نابێت بۆ کەسێک هەبن و بۆ کەسێکی دیکە نەبن یان گۆڕانیان بەسەردابێت. لێرەدا دەردەکەوێت، ئەفلاتون لەژێر کاریگەرێتی پارمەنیدسدا ڕاستەقینە بە نەگۆڕ دادەنێت. ئەگەر ڕەنگی سور ڕاستەقینەی خوێن بێت، ئەوا دەبێت



خوێن لەژێر چاوی میکرۆسکۆپیشدا سور بێت. واتە ئەو شتەی بە ڕاستەقینە دادەنرێت پێویستە هەمیشە وەکو خۆی بمێنێتەوە. ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو شتە ئەوەیە و ئەوەش نیە یان خوێن سورە و سوریش نیە. خوێن دەبێت هەمیشە سوربێت یان هەمیشە سور نەبێت؛ سەلماندن و ڕەتدانەوە لە یەک شوێندا و لە یەک کاتدا کۆنابنەوە. کەوابوو، ڕاستەقینە نەگۆڕە و خاوەنی ناسنامەیەکی چەسپاوە. لەهەر گۆشەنیگایەکەوە تەماشای بکرێت، لە هەر کات و شوێنێکدا بێت، تۆزقاڵێک گۆڕانی بەسەردا نایەت. نزیکترین نموونە لەم ڕاستەقینەیەوە، ئەگەر پەیڕەوی ماتماتیکی ئەکلیدس بکەین و ژمارە بە هەبوویەکی ڕووتکراوە دابنێین دەستەواژەی (1 + 1 = 2) وە. ئەم دەستەواژەیە جیاوازی نێوان گۆشەنیگاکان و کات و شوێن بناخەکەی لەق ناکات و نایگۆڕێت. ڕاستییەکەی، وەکو ڕاستی سوربوونی خوێن لە مەترسیدا نیە. (63)

بۆچوونە مێتافیزیکییەکەی ئەفلاتون لە بۆچوونی زانستانە و ڕاڤەکردنی زانستانەوە بۆ جیهان دوور نیە. زانستیش باسی دیاردە و جیهانی ئەو دیو دیاردە دەکات. بابەتە هەستەکییەکانی دەوروبەرمان، بەو شێوەیەی ئێمە دەیانبینین، نین. ئەوان لە ئەتۆم پێکهاتون.

(63) خەسڵەتی نەگۆڕی ڕاستەقینە و مانەوەی وەکو خۆی دواجار لە سیستەمی لۆجیکی ئەریستۆدا بووە بە یەکێک لە یاساکانی بیرکردنەوە، کە بە یاسای ناسنامەیان (خۆیەتی) ناوزەد دەکرێت. بەگوێری ئەم یاسایە ناکرێت دوو لایەنی ناکۆک سەبارەت بابەتێک لە یەک کاتدا کۆبکرێنەوە. ئەگەر بڵێین گۆچان خوارە. لەهەمان کاتدا بۆمان نەهاتوە بڵێین گۆچان خوار نیە؛ واتە، ئەلف ئەلفە و ناتوانین بڵێین ئەلفیش نیە.

ئەتۆمەکانیش هەستیان پێناکرێت و چاو نایان بینێت. بۆ زانایەکی فیزیا ڕاستەقینەی مێزەکەی بەردەمم پانتایی و ڕووبەرو ڕەنگ نیە، بەڵکو ئەو ئەتۆمانەیە مێزەکەیان پێکهێناوە و من هەستیان پێناکەم. ئەتۆمەکانیش بەردەوام لە جوڵاندان، کەچی مێزەکە ناجوڵێت و شتێکی وەستاوە و مەگەر من بیجوڵێنم و شوێنەکەی بگۆڕم. ئەگەر ڕاستەقینە خۆی نەخاتە بەر ڕۆشنایی هەستکردن، ئایا چۆن دەناسرێت؟ من ئەم پرسیارە ئاڕاستەی زانست ناکەم و دەمەوێت ئەفلاتون وەڵامی بداتەوە؟ وەڵامدانەوەکەشی بۆ ئەفلاتون دژوار نیە چونکە هەستکردن تاکە ڕێگەیەک بۆ زانین نیە، بەڵکو ڕێگەیەکی نالەبارە و هەر زانینێک دروست بکات خێرا لەگەڵ گۆڕانی بابەتەکەیدا و کەسەکان و شوێن و کات دەگۆڕێت. ئێمە ناتوانین موتمانەی پێبکەین. لە ڕێگەی هەستکردنەوە ڕەنگی سوری خوێن یان تامی هەنگوین دەدۆزینەوە، بەڵام زانینەکەمان ڕێژەگەرانەیە و کاتییە. بە دیدی ئەفلاتون، زانست، بەتایبەتی ئەو زانستەی دەیەوێت لە واتای ڕاستەقینە بکۆڵێتەوە، پشت بە هەستکردن و بابەتە هەستەکییەکان نابەستێت و خۆی بەودیو هەبووە هەستپێکراوەکان دەگەیەنێت. ئەریستۆ ئەم زانستە بە تیۆلۆجی یان فەلسەفەی یەکەم ناوزەد دەکات و لە پەرتووکی مێتافیزیکدا دەڵێت؛

**ئەم زانستی یەکەمە لەو بابەتانە دەدوێت، کە لە ئەستو بەدەر و نەگۆڕن. هەموو هۆکان بەتایبەتی هۆیە خوداییەکان هەمیشەیین. لەم بۆچوونەوە بەو خاڵە دەگەین، کە سێ جۆر فەلسەفەی بیردۆزەییانە هەیە: ماتماتیک و زانستی سروشتی و تیۆلۆجی (خواناسی). باڵاترین زانستیش مامەڵە لەگەڵ باڵاترین و گەورەترین (جۆر)دا دەکات. لەبەر ئەم هۆیەشە زانستە بیردۆزەییەکان لە زانستەکانی دیکە باڵاترن. ئەم زانستەی ئێمەش لێرەدا باسیدەکەین لەنێو زانستە بیردۆزەییەکاندا باڵاترینە.**(64)

گەیشتن بە ڕاستەقینە لە ڕێگەی هەستکردنەوە مەحاڵە. هەروەها ئەو زانستەی لە ئاکامی تێگەیشتنمان لە واتای ڕاستەقینە دادەمەزرێت باڵاترین زانستە و بابەتی لێکۆڵینەوەکەشی باڵاترینە. بەم شێوەیە هەستکردن سەرچاوەی زانینێکی کاتی و ڕێژەیی خەسڵەتە هەستەکییەکانی وەکو ڕەنگی سوری خوێن و تامی هەنگوین و ڕووبەری مێزەکەیە. دیاردەکان ڕاستەقینە نین و ڕاستەقینەشمان پێناناسێنن. ئەوەی ئەفلاتون بە دوایدا دەگەڕێت لەڕێگەی توێژینەوەی هۆشەکییەوە دەیگاتێ و هەبوویەکە لەودیو جیهانی دیاردەکانەوەیە. نەگۆڕینی ڕاستەقینەش بۆ ڕاڤەکردنەکەمان لەسەر واتای (بوون) بەرەو لای پارمەنیدس جارێکی دیکە پەلکێشمان دەکات. ڕاستەقینە نەگۆڕە چونکە شتێک نیە پەیدابووبێت و بەرەو نەمان بچێت؛ لە هەموو لاکانەوە پڕو تەواوە و (نەبوونی) بە خۆوە نەدیوە. هەر شتێکیش پڕو

(64) ئەریستۆ، مێتافیزیک، بەشی ئێپسیلۆن، ل 133.

تەواوکۆ بێت گۆڕانی بەسەردا نایەت. گۆڕان ئاماژە بۆ ناتەواوی ئەو هەبووە دەکات، کە لە گۆڕاندایە. ڕاستەقینە وەکو (بوون)ی نێو فەلسەفەی پارمەنیدس و جوڵێنەری یەکەمی ئەریستۆ و بوونی پێویستی فارابی و ئیبن سینا لە کەم و کورتی بەدەرە و لەسەر بوونی خۆی ڕادەوەستێت و پەنا بۆ هیچ شتێک نابات.

## بیردۆزەی فۆرمە هەمەکییەکان

مادامەکی بابەتە هەستەکییەکان زەمینەیەکی پتەو بۆ دامەزراندنی ئەو زانینە دروست ناکەن، کە لە ناوەڕۆک و واتای ڕاستەقینە دەکۆڵێتەوە و لە گۆڕانێکی هەمیشەییدان، ئەوا ڕاستەقینە پێکناهێنن. ڕاستەقینە بابەتی هەستەکی نیە و هەستکردن نایدۆزێتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕاستەقینە هەیە بەڵام لەودیو جیهانی هەستکردنەوەیە. ئەمە یەکەم هەنگاونانە بۆ جەختکردن لەسەر بوونی ڕاستەقینە. هەنگاوی دووەم وابەستە بە پێناسەکردنی ڕاستەقینە و تێگەیشتن لە واتاکەی. پێش ڕوونکردنەوەی هەنگاوی دووەم حەزدەکەم ئەو خاڵە باس بکەم، کە زۆرجار بیردۆزەی فۆرمە هەمەکییەکان بە بیردۆزەی ئایدیاکانیش دادەنرێت. وشەی ئایدیا لە زمانی ئینگلیزیدا لە وشەی (ئایدۆس)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە، کە زۆرتر پەیوەندی بە پێناسەی چەمکێکەوە هەیە. هاوکات، بەکارهێنانی



هەردوو وشەکان بۆ بیردۆزەکەی ئەفلاتون بووە بە باو. لەبەر ئەمە بە هەڵەدا ناچین (فۆرم) یان (ئایدیا) لێرەدا بە یەک شت دابنێین. من لەم توێژینەوەیەدا وشەی (فۆرم) بەکاردەهێنم و لە سەردەمی نوێشدا زۆربەی ئەوانەی لەسەر ئەفلاتونیان نوسیوە چەمکی (فۆرم) یان لە جێگەی (ئایدیا) داناوە. ئەمەش تاکو ڕادەیەک پەیوەندی بە چییەتی ئۆنتۆلۆجی ئەم دوو چەمکەوە هەیە. بۆ زۆرینەمان ئایدیا، کە لە زمانی کوردییدا دەبێت بە (بیر، بیرۆکە یان هزر) خاوەنی بنەمایەکی دەرەکی و ئۆنتۆلۆجی نیە. بیرۆکە بە بێ بیرکردنەوە و لە دەرەوەی جیهانی بیرکردنەوەدا نادۆزرێتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە فۆرمە هەمەکییەکانی ئەفلاتون لەنێو بیرکردنەوەدا نین و بوونێکی دەرەکی و سەربەخۆیان هەیە. ئێمە فۆرمەکان داناهێنین و بە بوونی ئێمەشەوە نەبەستراون؛ بەڵکو ئۆنتۆلۆجییانەن. واتە، هەر یەکێک لەو فۆرمانە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا بە تەنیا ڕاوەستاوە و بوونێکی دەرەکی هەیە. لێرەدا ئەفلاتون، هەرچەندە سەر بە فێرگەی ئایدیالیستانەیە، دانانی فۆرمەکان لەو شێوازە ئۆنتۆلۆجییەدا، دەیکات بە بیریارێکی ڕیالیست خواز. بۆچوونە مێتافیزیکییەکەی کاڵای ئایدیالیستانەی—ڕیالیستانە دەپۆشێت و لە ئایدیالیستە ناڕیالیستەکانی جیادەکاتەوە.

ئێمە ژمارەی فۆرمەکان نازانین. بەڵام هەموویان لە جیهانی ژوور هەست و بابەتە هەندەکییەکانەوە هەن. ئەگەر پەیڕەوی ڕێچکەی نێگەتیڤی بگرین، لە ڕێگەی خەسڵەتەکانی بابەتە هەستەکییەکانی نێو

جیهانی ئەستویی (ماتەری)یەوە دەتوانین خەسڵەتەکانی فۆرمەکانیش بدۆزینەوە. ئەم ڕێچکەیەش بۆ دۆزینەوەی فۆرمەکان پەیڕەوی بیری فەلسەفی سوکراتی دەکات، کە لەپێشتر باسمانکرد و لە دواییدا ڕوونیدەکەمەوە چۆن بەو ڕێچکەیە فۆرمەکان پەیدا دەکرێن. ئێستا پێویستە بزانین ڕێچکەی نێگەتیڤی چییە و چۆنە. ئەگەر دوو شتی ناکۆک و جیاواز هەبن، ئێمە تەنیا یەکێک لەو دوو شتە بناسین لە ڕێگەی ئەو ناسینەوە دەتوانین خەسڵەتەکانی شتی دووەمیش بدۆزینەوە. ئێمە دەزانین هەر شتێک لەنێو ئەم جیهانە ئەستوییەدا هەبێت لە ئەستو پێکهاتوە. ئەمەش دوو واتا دەگەیەنێت؛ لەلایەکەوە ئەو شتە بوونێکی ئەستویی هەیە و لە لاکەی دیکەوە مادامەکی (ئەستو) سادە نیە و لە چەند توخمێک پێکهاتوە، ئەوا ئەو شتە تێهەڵکێشراوە و ئاوێتەیە. بۆ نموونە مێزەکەی بەردەمم بابەتێکی لە ئەستو دروستکراوە و لە چەند شتێک پێکهاتوە. ئەگەر مێزەکە فۆرمێکی بەرزی هەبێت، ئەوا ئەو فۆرمە لە جیهانی بەرزدا دانراوە. لەبەر ئەوەی لە مێزەکەی بەردەمیشم جیاوازترە نابێت هەمان خەسڵەت هەڵگرتبێت. هاوکات جیاوازییەکەی نێوانیشیان ڕەها نیە و جۆرە هاوبەشییەکیان تێدایە. لەم ڕێگەیەوە بەو خاڵە دەگەین، کە فۆرمی مێزەکە لە ئەستو بەدەرە و لەبەر ئەمە سادەیە و فۆرمێکی ڕووتە. لەسەرو ئەمەشەوە، فۆرمی مێزەکە و مێزەکەی بەردەمم لە (شێوە و فۆرمدا) لە یەکدی دەچن و میزەکەی بەردەمم وەرگیراوی



فۆرمە سادەکەیە. بەهەمان شێوە، دەتوانم بەو ئاکامەش بگەین، کە مادامەکی مێزەکەی بەردەمم هەندەکییە و بابەتێکی هەستپێکراوە، لەنێو شوێن و کاتدایە، ئەوا فۆرمەکە هەمەکییە و هەستکردن نایدۆزێتەوە و لەنێو شوێن و کاتدا نیە. لێرەدا چەند خەسڵەتێکی فۆرمەکانمان دەست کەوتووە و زانیاریمان لە بارەیانەوە پەیدا کردوە.

ئەفلاتون، لە دۆزینەوەی فۆرەکاندا، وەکو ئێمە لە بابەتە هەستەکییەکانەوە گەشتەکەی خستۆتەگەر. بەڵام ڕێگاکەی دوور و درێژترە و قۆناخ بە قۆناخ خۆی گەیاندۆتە ئاکامەکە و ئەو شتەی بە دوایدا گەڕاوە. باشترین نموونە، گفتوگۆکەیەتی لە دایەلۆگی (سەمپۆزیەم)دا لەسەر واتای (خۆشەویستی). لەم دایەلۆگەدا ئەفلاتون باسی چەند پلەیەکی خۆشەویستی دەکات و لە نزمترین پلەوە تاکو بەرزترین پلە پەیوەندی خۆشەویستی بە بابەتە جیاوازەکانەوە دیاریدەکات. نزمترین پلەی خۆشەویستی دوو خەسڵەتی تێدایە؛ یەکەم خۆشەویستییە بۆ تام و چێژی سێکسی. دووەم، ئەوەی بووە بە بابەتی خۆشەویستییەکە و حەزی لێکراوە (لەش)ە نەک کەسایەتی و جوانی ناوەوەی کەسە حەزلێکراوەکە. لەبەر ئەمەشە ئەم جۆرە خۆشەویستییە کاتییە و زوو دەگۆڕێت چونکە بابەتەکەی بەردەوام لە گۆڕاندایە. ئەو جوانییەی ئەمڕۆ لە لەشێکدا دەبینرێت و دەبێت بە کانیاوی چێژوەرگرتن گۆرانی بەسەردا دێت و وەکو خۆی نامێنێتەوە. هەروەها، لەم قۆناخەدا جوانی کەسایەتی و بیرکردنەوە و ناوەوەی

بابەتە حەزلێکراوەکە گرنگ نیە. تەنانەت، ئەو کەسەی ئەم جۆرە خۆشەویستییە دەکات نایەوێت بابەتەکە (کەسە حەزلێکراوەکە) کەسایەتی و بیرکردنەوەی هەبێت. چەند ئەو کەسە گەمژە و بێ ناوەڕۆک بێت زۆرتر خۆشی دەوێت و چێژ لە لەشی وەردەگرێت. لەبەر دوو هۆی سەرەکی، ئەفلاتون بەم جۆرە خۆشەویستییە ڕازی نیە. یەکەم، بابەتی خۆشەویستییەکە، کە (لەش)ە ڕاستەقینەی کەسەکە نیە و دووەمیش، ئەو بابەتە دەگۆڕێت. کەوابوو، خۆشەویستییەکەش وەکو خۆی نامێنێتەوە و گۆڕانی بەسەردا دێت چونکە ئەو جوانییەی لەنێو لەشەکەدایە وەکو خۆی نامێنێتەوە. بۆ بەردەوامبوونی خۆشەویستی پێویستە جوانییەکە لە جوانی لەش بەرزتر و درێژخایەنتر بێت. ئەم جوانییەش لەنێو جیهانی ئەستوییدا نادۆزرێتەوە و لەسەر بوونی لەش ڕاناوەستێت. دەشێت ئەم جوانییە لەنێو کەسایەتی و بیرکردنەوەی خۆشەویستەکەماندا ببینین. ئەمەش جوانییەکە پەیوەندی بە دەروونی ئەوەوە هەیە، کە لایەنێکی نەگۆڕی بوونی مرۆڤە. جوانییەکە لەگەڵ تێکچوونی لەش و تەمەن ناشێوێت. بەڵام هێشتا ئەم جوانییەش دوا جوانی نیە و لەسەرو ئەوەوە فۆرمی جوانی هەیە، کە هەمەکی و هەمیشە نەگۆڕ و ڕەهایە؛

**یەکەم:** جوانییەکە هەمیشە هەیە، نەپەیدابووە و نە لەناودەچێت.



**دووەم:** لە لایەکەوە جوان و لە لایەکی دیکەوە ناشرین نیە. ئەمڕۆ جوان و سبەینێ ناشرین نیە. بۆ کەسێک جوان و کەسێکی دیکە ناشرین نیە. لێرە جوان و لە شوێنێکی دیکە ناشرین نیە.(65)

لێرەدا، ئەفلاتون خەسڵەتەکانی بابەتێکی جوانی هەندەکی لە فۆرمی جوانی دادەماڵێت و بە جوانییەکی ڕووتی هەمەکی دادەنێت. ئەم جوانییە دەکات بە فۆرمێک لەنێو جیهانی بەرزدا و هەموو جوانییەکی نێو بابەتە هەندەکییەکانی لێوەرگیراوە؛

**کەسێک بە دوای ئەم جوانییەدا بگەڕێت بەرەو ژوور دەڕوات.**
**شتە جوانەکان دەکات بە پەیژە و پیایاندا سەردەکەوێت.**
**لە لەشێکەوە بۆ لەشێکی دیکە و دوایی بۆ ڕەوشتە جوانەکان و لەوێشەوە فێردەبێت چۆن جوانی بناسێت.**(66)

وەکو لەپێشتر ئاماژەم بۆ کرد، ژمارەی فۆرمەکان لە جیهانی بەرزدا نەزانراوە.

ئەگەر شوێن بۆچوونەکەی ئەفلاتون بکەوین، بۆ هەر یەکێک لە بابەتە هەندەکییەکانی نێو ئەم جیهانە، وەکو تاکە مرۆڤ، ئاژەڵەکان، شتەکانی نێو سروشت ئەوا ژمارەی فۆرمەکان هێندەی ژمارەی بابەتە هەندەکییەکان دەردەچێت.

(65) Plato, "Symposium" in *Plato: Complete Works*, 211a- c, p. 493.

(66) هەمان سەرچاوە.

ئەم فۆرمانە لە ڕیز یەکدا هاوشان دانراون و پلەی بەرزی و نزمییان بۆ دانەنراوە بێجگە لەوەی ئەفلاتون فۆرمی (چاکە) یان (ئەگاتۆن) لەسەرو هەموویانەوە دادەنێت؛

ئەوەی ڕاستی بە شتەکان و هێزی زانین بە زانەر دەبەخشێت فۆرمی چاکەیە. ئەم فۆرمە دەبێت بە هۆی زانین و ڕاستی بابەت بۆ زانین. زانین و ڕاستی دوو شتی جوانن، بەڵام چاکە جیاوازە و لەوانیش جوانترە. لە جیهانی هەستەکییدا بینین و ڕووناکی لە ڕۆژ دەچن، بەڵام نابێ بڵێین، کە ڕۆژن.

بەهەمان شێوەش زانین و ڕاستی لە چاکە دەچن، بەڵام چاکە نین. بۆچوونەکەت جوانە. دڵنیام ئەو شتە (چاکە) بە چێژوەرگرتن دانانێت.

با زۆرتر (واتاکەی) ڕوونبکەینەوە.

چۆن؟

لەو باوەڕەدام لەگەڵ مندا لەسەر ئەو خاڵە ڕێدەکەویت، کە ڕۆژ هێز بە شتە بینراوەکان دەدات تاکو ببینرێن و هاوکات (هێز) بەوشتانەش دەدات، کە پەیدادەبن و گەشەدەکەن، بەڵام ڕۆژ خۆی پەیدا نابێت.

چۆن دەبێت؟

کەوابوو، دروستە بڵێین، بابەتە زانراوەکان تەنیا بۆ ئەوەی بناسرێن قەرزاری چاکە نین، تەنانەت بوونیشیان دەکەوێتە



سەر چاکە. هاوکات چاکە بوون نیە. بەهێز و پلە لەژوور بوونەوەیە.(67)

دانانی فۆرمی چاکە لەسەرو هەموو فۆرمەکانی دیکەوە و لەسەرو بوونەوە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو بیرکردنەوە میتافیزیکییەیە، کە جۆرێک لە (هەبوو) بە بەرزترین و لەپێشتر دادەنێت. ئەریستۆ یەکەم بیریارە ئەم بۆچوونەی بەرەو پێشەوە بردووە و دواتریش بە درێژایی مێژووی بیرکردنەوەی میتافیزیکی و ئایینی (بەتایبەتی ئایینی یەهودی و مەسیحایەتی و ئیسلام) دەوری بینیوە. بۆ ئەفلاتون جیهانێکی بەرزتر لەسەرو جیهانی ئەستویی و بابەتە هەستەکییەکانەوە هەیە و فۆرمە هەمەکییەکانیش لەنێو ئەو جیهانە بەرزەدا دانراون. لەسەرو فۆرمە هەمەکییەکانیشەوە یان لەنێو فۆرمەکاندا فۆرمی چاکە بەرزترینە و سەرچاوەی فۆرمەکانی دیکەیە، بەڵام خودی فۆرمی چاکە لە سەرچاوە بەدەرە و هیچ فۆرمێک پێش بوونی ناکەوێت. لەم ڕووەوە، فۆرمی چاکە ئۆنتۆلۆجییانە لەپێشترە. بیرۆکەی (هەبوو)یەکی لەپێشتر لەگەڵ ئەریستۆدا خۆی سەپاندوەو بووە بەخەسڵەتێکی سەرەکی بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە. ئەریستۆ چەمکی (فۆرمی چاکە)ی بۆ (هۆی یەکەم)، (جوڵێنەری یەکەم) یان خوا گۆڕی و ئەم هەبووەی لە بەرزترین نهۆمی بووندا داناوە.(68)

من لێرەدا چەمکی (هەبوو) نەک (بوون) بۆفۆرمی چاکە یان جوڵێنەری

---

(67) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی شەشەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 220.

(68) بڕوانە: ئەریستۆ، میتافیزیک، بەشی کاپا، وەرگێڕانی د.محەمەد کەمال.ل 221.

یەکەم دادەنێم چونکە هەر یەکێک لە ئەوان شتێکی تاکە. (بوون)، بە پێچەوانەی (هەبوو)ەوە، واتایەکی گشتگری هەیە و ڕاستەقینەی هەموو هەبووەکانە. مرۆڤ، ئاژەڵ، ڕووەک و بەرد و مێزەکەی بەردەمم گەلێک لەیەکدییەوە جیاوازن و خەسڵەتی جیاوازیان هەیە بەڵام لەسەرو جیاوازییەکانەوە بنەڕەتێکی هاوبەشیان هەیە، کە هیچ کام لەوانە بەبێ ئەو بنەڕەتە نابێت؛ ئەویش (بوون)ە. مرۆڤی گەورە و بچوک، مێینە و نێرینە، ڕەش و سپی، کورد و یۆنانی لە یەکدییەوە جیاوازن، بەڵام هەموویان هەن. (بوون) بناخەی هەموو هەبوویەکە، تەنانەت بناخەی فۆرمی چاکە و جوڵێنەری یەکەمیشە. بەبێ (بوون) بیر لە فۆرمی چاکە و جوڵێنەری یەکەم ناکرێتەوە. کەوابوو، فۆرمی چاکە و جوڵێنەری یەکەم لەپێشتر نین و ئەوانیش بۆ ئەوەی هەبن پێویستییان بە (بوون)هەیە. ئەم بۆچوونە سەبارەت فۆرمی چاکە و جوڵێنەری یەکەمی ئەریستۆ بیرکردنەوەی ئۆنتۆلۆجی بۆ (ئۆنتۆ—تیۆلۆجی)گۆڕیوە.(69) لەم تێڕوانینە ئۆنتۆلۆجییەدا (هەبوو)یەک، وەکو فۆرمی چاکە، جوڵێنەری یەکەم و ئافەریدکەری نێو ئایینی (یەهودیەت و مەسیحایەتی و ئیسلام)بە بنەڕەتی هەموو شتێک دادەنرێت.(70)

(69) من چەمکی (ئۆنتۆ – تیۆلۆجی) م لە هایدگەرەوە وەرگرتوە، بڕوانە:
Martin Heidegger, *Identity and Difference*, transleted by Joan Stambaugh, Chicago: Chicago, University Press, 2002. P. 54.

(70) بێگومان جیاوازییەکی سەرەکی لەنێوان چەمکی جوڵێنەری یەکەمی ئەریستۆ و ئافەریدکەری ئەم سێ ئایینەدا هەیە. بۆ ئەریستۆ جوڵێنەری یەکەم جیهانی لە هیچەوە ئافەریدنەکردوە. ئەو تەنیا فۆرمی جیانی دروست کردوە، نەک ئەستو یان ماتەر. ئەمەش لەگەڵ بیرۆکەی ئافەریدکردنی جیهان لە هیچەوە، کە لەنێو ئایینەکاندا هەیە، ناکۆکە.



ئەم هەبووە نابێت بە بوونێکی گشتگر و پێکهاتەی هەبووەکان. هەندێک لە بیریارانی ئایینی لەو باوەڕەدان لەنێو تەنە زیندووەکاندا، بەتایبەتی لەشی مرۆڤ بەشێک لەو هەبووە بەرزەی پێبەخشێنراوە. گیانی مرۆڤ بەشێکی بچوکە لە گیانی خوا یان لەو سەرچاوەیەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام ناتوانین لەشی مرۆڤ بە بەشێک لە لەشی خوا دابنێین. بەگوێرەی باوەڕی ئایینی خوا لەشی نیە. لەبەر ئەمەشە لەنێو کات و شوێندا نیە و ناکەوێتە ژێر کاریگەرێتی گۆڕانکارییەوە. هەڵبەتە ئەمە تەنیا هۆ بۆ نەگۆڕانی بوونی خوا نیە. ئێمە لەپێشتر باسمانکرد، کە ڕاستەقینە، لە هەرچ فۆرمێکدا هەبێت، لە ڕوانگەی مێتافیزیکییانەوە تەماشای بکرێت، ئەو ڕاستەقینەیە دەبێت پڕ و تەواوکۆ بێت. هەر شتێکیش تەواوکۆ بێت نەگۆڕ و وەستاوە. چەمکی ئۆنتۆ—تیۆلۆجی ئاماژە بۆ دانانی (ئۆنتۆ) لە پێش (تیۆلۆجییەوە) دەکات. واتە هێزێکی پیرۆز، پڕ و تەواو پێش بوون دەکەوێت و ئەو بڕیار لەسەر ئامادەبوون و پەیداکردنی بوون دەدات. پیرۆزی و لەپێشتر بوونی ئەم هێزە ئەوە دەگەیەنێت، کە تەواوکۆیە و هیچ شتێک پێش بوونی ئەو ناکەوێت. پیرۆزی خوا، لە ئاییندا، لە پڕی و تەواوی بوونیدایە. خوا، لە دیدی ئاینخوازەکانەوە، لە هیچ خەسڵەتێکی چاک دانەبڕاوە. هەموو خەسڵەتە چاک و جوانەکانی بە تەواوی و بێ کەم و کورتی هەڵگرتوە. خوا، بۆ نموونە خاوەنی زانینە، زانینەکەشی تەواوە و ڕەهایە، سەبارەت ڕابردوو، ئێستا و

داهاتوو بە تەواوی دەزانێت. خەسڵەتە ڕەهاکان پڕی و تەواوکۆیی بە بوونی دەبەخشن و تەواوکۆییش لە هەرچ هەبوویەکدا هەبێت ئەو هەبووە پیرۆز دادەنرێت.

لێرەدا، لەگەڵ خەسڵەتی(هەمەکی) فۆرمە بەرزەکاندا توشی کێشە دەبین. مەبەست لە هەمەکیبوونی شتێک یان خەسڵەتێک لەوەدایە، کە ئەو خەسڵەتە لەنێو زۆر هەبوودا لە کات و شوێنی جیاوازدا هەیە. جوانی هەمەکییە و لەنێو هەموو شتێکی جواندا هەیە. لە کات و شوێنی جیاوازیشدا شتە جوانەکان دەناسرێنەوە. بەڵام خودی جوانی یان فۆرمی بەرزی جوانی شتە جوانەکان نیە. جوانی لە دیمەنێکدا فۆرمی بەرزی جوانی نیە، هاوکات لەویشەوە جودا نیە و لەوێوە سەریهەڵداوە یان وەرگیراوە. ڕەنگی سور لای هونەرمەندێکی شێوەکار هەیە و لەنێو چەند تابلۆیەکییدا بۆ بابەتە سورەکان دایدەنێت. ڕەنگی سوری سەر کانڤاسەکان یان نێو تابلۆکان لەو ڕەنگە سورە وەرگیراون، کە هونەرمەندەکە لەنێو قوتوی ڕەنگەکەیدا هەیەتی. من ڕۆڵی خواکەی ئەفلاتون (هەرچەندە بیرۆکەی ئافەریدکردنی جیهانی لە لا ڕوون نیە)، وەکو ڕۆڵی هونەرمەندەکە دەبینم. بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان هەردووکیشیاندا دەدۆزینەوە. ڕەنگی سوری نێو قوتوەکە بەگوێرەی بەکارهێنانی کەم دەبێتەوە و گۆڕانی بەسەردا دێت و بەڕادەی نەمان دەگات. فۆرمی بەرزی جیهانی ئەفلاتونی کەم نابێتەوە و گۆڕانی بەسەردا نایەت. بێ کەم بوونەوەی خەسڵەتی



جوانی لە فۆرمی جوانیدا جوانی لەسەر هەموو شتە جوانەکان دادەنرێت. ئەگەر خوا بەو هونەرمەندە دابنێین، ڕەنگی سور لەسەر کانڤاسەکان دادەنێت، ئەوا هەرگیز ڕەنگی سوری لێنابڕێت و ڕەنگی سوری نێو قوتوەکەشی لەگەڵ بەکارهێنانی کەم نابێتەوە. ئێمە ڕەنگی سور و فۆرمی جوانی بە هەمەکی دادەنێین چونکە لەنێو هەموو شتێکی سور و جواندا هەن. لەژێر کاریگەرێتی ئەریستۆشەوە ڕەنگی سور یان جوانی بە دوو شتی جیاواز و سەربەخۆ لە هەبووەکانەوە دانانێین. بۆ ئەوەی ڕەنگی سور یان جوانی بدۆزینەوە هەمیشە ئاماژە بۆ شتێکی سور یان جوان دەکەین. ئەم دوو فۆرمە هەمەکییە پەیوەندییەکی پێویستیان بە بابەتە هەندەکییەکانەوە هەیە. تەنانەت ڕەنگی سوری نێو قوتوەکەش فۆرمی ڕەنگی سور نیە، بەڵکو ئەو ڕەنگە بە شتێکەوەیە، بۆ نموونە ئەو گژو گیایانەی ڕەنگی سوریان هەڵگرتوە لەگەڵ ڕۆندا گیراونەتەوە و ئەو شتەیان پێکهێناوە، کە هونەرمەندەکە بە ڕەنگی سوری دادەنێت و دەیخاتە سەر کانڤاسەکەی. تێگەیشتنی ئەفلاتون لەم بۆچوونەوە، کە لە سەردەمی ئەریستۆوە جێگەی خۆی کردۆتەوە، جیاوازە. ڕەنگی سور و جوانی لە هەموو شتێکی سور و جواندا هەن. ئەمە ڕاستییەکە نکۆڵی لێناکرێت. بەڵام ئەفلاتون لە ئاستی ئەم بیرکردنەوەیەدا ناوەستێت و دەیەوێت بزانێت بابەتێک بۆچی سورە یان جوانە. ئەمە بیرکردنەوە لە ئاستێکەوە بەرەو ئاستێکی دیکە دەبات و لەگەڵ دۆزینەوەی بنەڕەتدا

سەرگەرمی دەکات. لەم ڕوانگەیەوە، ئەفلاتون بەو باوەڕە گەیشتوە، کە لەسەرو بابەتە سورەکانەوە فۆرمی ڕەنگی سەر هەیە. بوونی بابەتە سورەکان یان سوربوونی ئەو بابەتانە پەنا بۆ فۆرمی سور دەبەن و ئەو خەسڵەتە سورەیان لەو فۆرمەوە وەردەگرن. هەموو شتێکی سور وەرگیراوی سورییە لە فۆرمە سورە بەرزەکەوە. ئەمە بناخەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ئەفلاتون و جیاوازییەکی بنەڕەتییە لە گەڵ بۆچوونی ئەریستۆدا، کە من لە پێشەکییەکەمدا بۆ پەرتووکی (کاتیگۆرییەکان)ی ئەریستۆ ئاماژەم بۆ کردووە. (71)

هەموو فۆرمێکی بەرز هەمەکییە، لە هەمان کاتدا فۆرمێکی تاکە و سەربەخۆ ڕاوەستاوە. فۆرمێکە هەندەکی و هەمەکی. مەبەستم لە هەندەکی دانانی فۆرمەکە لەنێو کات و بەستنەوەی بە تەنەکانەوە نیە. ئێمە دەزانین فۆرمە بەرزەکان لە ئەستو بەدەرن و لەنێو تەندا نین. ئەمەش فۆرمەکان لەنێو (شوێن) دەردەهێنێت. بەگشتی، شوێن بە بوونی تەنەکانەوە گرێدراوە. لەگەڵ بوونی تەنێکی ئەستوییدا بیر لە بوونی شوێن دەکرێتەوە و تەن هەمیشە دەبێت لەنێو شوێندا بێت یان شوێنێک پڕبکاتەوە. من دەڵێم مێزەکە لە ناوەڕاستی ژوورەکە دانراوە، ئوتومۆبیلەکە لەسەر شەقامەکە ڕاوەستاوە. ئەم دەستەواژانە ئاماژە بۆ شوێن دەکەن. ئەو شتانەی باسکراون (مێز، ژوور، ئۆتۆمۆبیل، شەقام) هەندەکین.

(71) بڕوانە : ئەریستۆ، کاتیگۆرییەکان، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە د.محەمەد کەمال.دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2010. ل 6-8.



فۆرمەکانیش لەگەڵ بوونی ئۆنتۆلۆجییاندا و جیاکردنەوەیان لە بابەتەکانی نێو ئەم جیهانەوە بە هەندەکی دادەنرێن. هەر یەکێک لە ئەوان تاکە و بوونی سەربەخۆی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا هەندەکیبوونی ئەم فۆرمە هەمەکییانە بە کات و تەنەوە نەبەستراوە. فۆرمی جوانی شتێکی جوان نیە و ڕووتکراوەیە. لەسەرو هەموو شتێکی جوانەوە تەنیا و سەربەخۆ و بێ گۆڕان ڕادەوەستێت.

ئەو پرسیارەی لێرەدا گرنگە بکرێت سەبارەت بوونی شوێنە بۆ فۆرمەکان. ئایا فۆرمەکان لەنێو شوێندان؟ ڕووتکردنەوەی فۆرمەکان لە (ئەستو—ماتەر) و دەرهێنانیان لەنێو کاتدا ڕاستەوخۆ بەو باوەڕەشمان دەگەیەنن، کە ئەم فۆرمانە لە شوێن بەدەرن. ئەمەش تێگەیشتنێکی لۆجیکمەندانەیە و لەوانەشە پرسیارەکەمان بە نابەجێ دابنێت. مادامەکی فۆرمەکان هەندەکی نین هەروەها خودی جوانی شتێکی جوان نیە، ئەوا فۆرمی جوانی لە هیچ شوێنێکدا نیە. ئەوەی ئێمە دەیبینین و ئاماژەی بۆ دەکەین شتێکی جوانە نەک فۆرمی جوانی. ئەمە لە کاتێکدا دروستە، کە ئێمە فەلسەفییانە بیرنەکەینەوە. کەسانی سادە و ساویلکە لە ئاستی فۆرمی جوانییدا نابینان. ئەوەی دەیبینن ئەم شتە و ئەو شتە جوانەیە، کە بەگوێرەی کات و شوێن و کەسەکان دەگۆڕێت. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە خۆی بەودیو شتە جوانەکان و ڕێژەگەرایەتی دەگەیەنێت و خودی جوانی دەدۆزێتەوە. بەڵام ئایا خودی جوانی لە کوێدایە؟ ئەم پرسیارە

پەیوەندی بە (شوێن)ەوە هەیە. ئەگەر فۆرمی جوانی (هەبێت) ئەوا دەبێت لەنێو (شوێن)دا بێت. کەوابوو، بوونی هەمیشەیی فۆرمەکان لە کاریگەرێتی (کات) دەیانپارێزێت، بەڵام لەنێو (شوێن) دەریانناهێنێت و بێ شوێنیان ناکات. فۆرمەکان لە کات بەدەرن، نەگۆڕن، هەمەکیین، هەمان کات هەر یەکێک لە ئەوان تاکە و (لەنێو) جیهانی بەرزدا دانراوە. جیهانی بەرز (شوێن)ی فۆرمەکان دیاریدەکات.

ئەم (شوێن)ەش لە شوێنی بابەتە هەستەکییەکانەوە جیاوازە و بوونی بە (ئەستو)ەوە نەبەستراوە. پەیوەندی نێوان فۆرمە هەمەکییەکان و بابەتە هەندەکییەکانیش ئاشکرایە. ئێمە دەزانین، لەبەر ڕۆشنایی بیرکردنەوە مێتافیزیکییەکەی ئەفلاتوندا، بەرگی پەرتووکێک بۆچی سورە. ئەمەش پەیوەندییەکی هۆکاریی بڕیار لەسەریان دەدات. ئەم پەیوەندییەش لە دایەلۆگی فیدۆدا باسکراوە. هەروەها ئەم پەیوەندییە بۆ سەرهەڵدانی بابەتە هەندەکییەکانی نێو جیهانی هەستەکی پێویستییەکی ئۆنتۆلۆجی هەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەبێ فۆرمی هەمەکی سور بابەتێکی هەندەکی سور نادۆزرێتەوە؛

> کەوابوو، من هەموو ئەو شتانە نا ناسمەوە و باوەڕیان پێ ناکەم. ئەگەر کەسێک هۆی جوانی بابەتێکم بداتێ و جوانییەکە بە ڕەنگ، شێوە یان خەسڵەتێکی دیکەوە ببەستێتەوە، من ڕەتی دەدەمەوە چونکە ئەمانە توشی ئاڵۆزیم دەکەن. زۆر بە ئاسانی بە بڕواوە دەڵێم ئەوەی



> شتێک جوان دەکات خودی جوانییە.(72)

پەیوەندی هۆکاری نێوان فۆرمە هەمەکییەکان و بابەتە هەندەکییەکان بە دەستەواژەی (ئەوەی شتێک جوان دەکات خودی جوانییە.) لە دایەلۆگی هیپیاسی گەورەشدا ئاماژەی بۆکراوە و لەسەر زاری سوکراتی مامۆستای ئەفلاتون دەڵێت، (دادوەری کەسەکان دەکات بە دادوەر) یان (زانایی مرۆڤ زانادەکات) هەروەها، (چاکە مرۆڤ چاک دەکات.)(73) بەهەمان شێوە دەتوانین بڵێین هۆی سوربوونی بەرگی پەرتووکەکە سورییە، گەرمی لەشی نەخۆشەکە گەرمییە و ساردی زستانیش بەفربارین نیە، بەڵکو خودی فۆرمی ساردییە، کە خەسڵەتی ساردبوونیش بە بەفرەکە دەبەخشێت. ئەو فۆرمە بەرزانەی لە دایەلۆگەکاندا باسکراون، وەکو فۆرمی چاکە، جوانی، دادوەری، ئازایەتی، هاوڕێیەتی و هتد بۆ ئێمە بەهای ڕەوشتین. باسنەکردنی فۆرمەکانی دیکە ئەو واتایە ناگەیەنێت، کە تەنیا ئەم فۆرمە ڕەوشتییانە لە جیهانی بەرزدا هەن و فۆرمی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەک و...هتد تێدا جێنابێتەوە. ئەفلاتون لە ڕێگەی گەیشتن بەم چەند فۆرمەوە بیردۆزەکەی دادەمەزرێنێت. بەڵام هاوکات گەلێک بابەتی هەندەکی لەم جیهانەدا دەدۆزینەوە بێ ئەوەی فۆرمێکی بەرزیان لەنێو جیهانە بەرزەکەدا هەبێت. خراپە، ناشرینی گەلێک چەمکی دیکەشمان

(72) Plato,"Phaedo," in *Plato: Complete Works*,100c9- d8, pp. 86- 87.

(73) Plato, "Hippias Major," in *Plato: Complete Works*, 287c2, c5- 6, pp. 904-5.

هەیە، کە واتایەکی (نەرێ)یان هەیە و ناگونجێت فۆرمی بەرزیان هەبێت چونکە جیهانی بەرز پاکە و لە هەموو ناشرینی و خراپییەکەوە بەدەرە. ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو پرسیارەی ئایا خراپە لە کوێوە هاتووە؟ ئەگەر ئەم جیهانە وەرگیراوی فۆرمە بەرزەکان بێت پێویستە ئەوەی لێرەدا هەیە فۆرمێکی بەرزیشی لەو جیهانەدا هەبێت. ئێمە ئەم بۆچوونەمان لەسەر بیردۆزەکەی ئەفلاتون دامەزراندوە و خۆشی نکۆڵی لێناکات. لەبەرئەمەیە، ئەفلاتون (زانین) بە بیرکەوتنەوە یان بیرەوەری و بەرهەمی هونەریش بە لاسایی کردنەوە دادەنێت. ئێمە تابلۆی (گۆرنیکا)ی پیکاسۆ بە بەرهەمێکی داهێنراوی ئەندێشەی ئەو هونەرمەندە دادەنێین، کە لەوەوپێش نەبووە و پیکاسۆ هێناویێتییە کایەوە. ئەم خەسڵەتەشە (پەلکێشکردنی هەبوویەک لە هیچەوە یان لە نەبوونەوە بۆ بوون) واتا بەداهێنان دەبەخشێت و پیکاسۆ دەکات بە هونەرمەند. بەڵام ئەفلاتون لەگەڵ ئەم واتایەی ئێمە بۆ بەرهەمی هونەری ناکۆکە. ئەو پیکاسۆ بە لاساییکەر دادەنێت؛ لەو باوەڕەدایە فۆرمی ئەو بەرهەمە هونەرییە لە جیهانی بەرزدا هەیە و پیکاسۆ لە ڕێگەی بیرکەوتنەوە لەنێو بیرەوەری خۆیدا دەریهێناوە و تابلۆکەی لێوەرگرتوە. ئەمە بەسەر هەموو جۆرەکانی زانیندا ساخدەبێتەوە.(74) کەوابوو، خراپەش، کە لەم جیهانەدا دەدۆزرێتەوە وەرگیراوی فۆرمی

(74) من بۆچوونەکانی ئەفلاتونم لەسەر هونەر و بەرهەمی هونەری لەنوسراوێکدا بە ناوی (شیعر و فەلسەفە) ڕوونکردۆتەوە و بە پێویستم نەزانی لێرەدا باسی بکەمەوە. بڕوانە: د. محەمە کەمال، نەهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، دەستگای سەردەم، سلێمانی،2005، ل 91 – 93 .



هەمەکی خراپەی نێو جیهانە بەرزەکەیە. ئەمە ئاکامێکی لۆجیکمەندانەیە ئێمە بەبێ لادان لە بیردۆزەکەی ئەفلاتون پێی گەیشتوین. ئایا ئەفلاتون لە ئاستی ئەم ئاکامەدا ڕەزامەندە؟ بێگومان، ئەو نکۆڵی لە ڕەوایی گەیشتن بە ئاکامەکە ناکات چونکە لەسەر ئەو پێشەکییە دامەزراوە، کە خودی ئەفلاتون بە بناخەیەکی بەهێزی دادەنێت و گوایە هەموو شتەکانی ئەم جیهانە وەرگیراوی فۆرمە هەمەکییەکانی جیهانی بەرز. هەر شتێکی جوان ببینین، ئەوا بەشێکی لە فۆرمی هەمەکی جوانی پێدراوە و لەبەر ئەمەشە ئەو شتە جوانە. ئەگەر بەشێک لە فۆرمی جوانی تێدا نەبێت یان وەرگیراوی ئەو فۆرمە نەبێت جوان نابێت. شتێک جوانە چونکە جوانی تێدایە. (جوان)یش فۆرمە نەک شتە جوانەکە. ئێمە دەتوانین لەم بۆچوونەوە ڕەخنەکەمان بەم سیلۆجیزمە دەربڕین:

هەموو شتێک لەم جیهانەدا وەرگیراوی فۆرمە هەمەکییەکانە.

خراپەش لەم جیهانەدا هەیە.

کەوابوو، خراپەش وەرگیراوی فۆرمە هەمەکییەکانە.

ئەفلاتون لە ئاستی ئەم سیلۆجیزمەدا وەڵامی پێ نییە و ڕاستەوخۆش باسیناکات خراپە، ناشرینی یان ئەم خەسڵەتە نەرێیانە لە چ سەرچاوەیەکەوە سەریان هەڵداوە و چ پەیوەندییەکیان بە جیهانی بەرزەوە هەیە. سەرنجێکی ورد لە بیرکردنەوەی ئەفلاتون بەتایبەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ زانیندا، کە لە بەشێکی دیکەی ئەم نوسراوەدا

باسیدەکەم، ڕوونیدەکاتەوە چۆن خەسڵەتە نەرێکان بە ئەزمونی هەستەکی و بۆچوونی تاکە کەسەکانەوە گرێدەدات. زانینی هەستەکی و بۆچوونی تاکە کەسەکان، کە خۆیان بەودیو جیهانی ئەستوییەوە ناگەیەنن (ڕاستی) ناس نین و مرۆڤ بە ڕێگەی هەڵەدا دەبەن و ناخی ڕاستەقینە ناپێکن. لەم ڕووەوە، خراپە نەناسینی ڕاستەقینەیە و پشت بەستنە بەئەزموونی هەستەکی و بۆچوونەوە. دوورکەوتنەوەیە لە جیهانی بەرز، کە لە مێتافۆری ئەشکەوتدا بە درێژی باسکراوە. ئەم ڕاڤەکردنە بۆ خراپە لەم جیهانەدا و چاکە لە جیهانی بەرزدا کارێکی زۆری کردۆتە سەر چەند ڕاپەوێکی فەلسەفی پاش خۆی. یەکێک لەو ڕاپەوانە، کە لێرەدا دەمەوێت ئاماژەی بۆ بکەم، فەلسەفەی (ئیشراق)ی سوهرەوەردییە. ئەم فەیلەسوفە لە پەرتووکی (حکمة الاشراق)دا ئاشکرا دان بە کاریگەرێتیی ئەفلاتون بەسەر بیروباوەڕە فەلسەفییەکانیەوە دەهێنێ. هەمان کات خوا، کە سەرچاوەی بوونی هەموو شتێکە بە ڕووناکی (نور الأنوار) دادەنێت. چاکە و خراپەش بە دووری و نزیکی هەبووەکان لە سەرچاوەکەیانەوە دەبینێت. ئێمە چەند لە سەرچاوەی بوونمانەوە (نور الآنوار) نزیک بینەوە ئەوەندە زیاتر بەرەو چاکە دەڕۆین و جەوهەری خۆمان دەناسینەوە.
دوورکەوتنەوەشمان لە سەرچاوەکە بە تاریکی و نامۆییمان دەگەیەنێت و توشی خراپەمان دەکات. بەتێکرا، بۆ ئەو بیریارانەی پەیرەوی مێتافیزیکی ئەفلاتون و ئەفلاتونییەتی نوێ دەکەن، چاکە و خراپە بە



دووری و نزیکی لە ڕاستەقینەوە دەبەستنەوە و خودی ڕاستەقینە بە چاک، پاک و جوان دادەنین و هیچ خەسڵەتێکی (نەرێ)ی ناخەنە سەر. وەکو دەزانین، فۆرمە هەمەکییەکان هەمیشەیین؛ سەرەتا و کۆتاییان نیە. هیچ هێزێک ئافەریدی نەکردوون؛ پەیدانەبوون و لەناوناچن. ئەم خەسڵەتانەش پەیوەندییان بە چۆنیەتی بوونی فۆرمەکانەوە هەیە، کە جیاوازی بنەڕەتی لەگەڵ چۆنیەتی بوونی بابەتە هەندەکییەکانەوە دیاریدەکات. فۆرمە هەمەکییەکان، بەپێچەوانەی هەبووکانی نێو ئەم جیهانەوە، (هۆ)ی بوونیان نیە و هەمیشەیین و کۆتاییشیان نایەت. دروستە فۆرمی چاکەی لەسەرو هەموویانەوەیە بەڵام پەیوەندی هۆکاری نێوان فۆرمی چاکە و فۆرمەکانی دیکەی باس نەکراوە. وادەردەکەوێت لەژێر نهۆمی فۆرمی چاکەوە فۆرمەکانی دیکە هاوتەراز دانرابێتن و هیچ کامیان لەوی دیکە بەرزتر و پاکتر نەبێت. پەیوەندییەکەیان تەنیا لە ڕیز داناندایە لەو (شوێن)ەدا، کە بە جیهانی بەرز ناوزەد دەکرێت. پەیوەندی نێوان فۆرمەکان لە هەبووە وەرگیراوەکانیاندا دەردەکەوێت، نەک لەنێو خودی فۆرمەکان و بوونیان لەنێو جیهانە بەرزەکەدا. هەریەکێک لەئەوان بوونێکی سەربەخۆ و تاکی هەیە و پێویستی بە فۆرمەکانی دیکە نیە. فۆرمی جوانی، بۆ نموونە پێویستی بە فۆرمی درەخت نیە. پەیوەندییەکە لە درەختێکی جواندا لەم جیهانەدا هەستی پێدەکرێت. کاتێک من دەڵێم درەختی بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەم جوانە؛

دوو فۆرمی ئەو بوونەم باسکردووە، کە لەوێدا کۆبوونەتەوە و ئەو شتە جوانەیان بۆ من دەرخستوە. من لەگەڵ دەربڕینی ئەم ڕاستییەدا سەبارەت ئەو بابەتە پەیوەندی نێوان (جوانی) و (درەخت)م دەرخستوە. بەڵام لە جیهانی بەرزدا ئەم دوو فۆرمە سەربەخۆن و یەک ناگرن. فۆرمی جوانی بە هیچ فۆرمێکی دیکەوە گرێنەدراوە. فۆرمی درەختەکە لەو جیهانەدا ڕووتە و ناتوانین بڵێین جوانە یان چاکە چونکە جوانی و چاکە دوو فۆرمی سەربەخۆی جیاوازن و پەیوەندییان بە فۆرمی درەختەوە نیە. بێجگە لەوەی فۆرمەکان هەمیشە پێکەوەن و لە شوێنێکدا دانراون پەیوەندی لە نێوانیاندا نابینین بەڵام پەیوەندی فۆرمەکان بە بابەتە هەندەکییەکانەوە، وەکو پەیوەندی هۆکاری، کە ئاماژەم بۆ کرد و ئەفلاتون لە دایەلۆگی (فیدۆ) دا باسیدەکات، هەروەها پەیوەندی (لێکچونیان) باسکراوە. فۆرمەکان هۆن بۆ بوونی بابەتە هەندەکییەکان و بابەتە هەندەکییەکانیش، کە وەرگیراوی فۆرمەکانن، لە فۆرمەکان دەچن. جوانی درەختەکە لە فۆرمی جوانی و درەختەکەش لە فۆرمی درەخت دەچێت.(75)

(75) Plato, “Parmenides,” in *Plato: Complete Works*, 132c-133a, pp. 366-67.



# بەشی چوارەم

## ڕاستەقینە و زانین

پاش ڕوونکردنەوی واتای ڕاستەقینە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتوندا خۆمان لە ئاستی کێشەی (زانین) دا ڕادەگرین و ئەو پرسیارە دەکەین، ئایا چۆن ڕاستەقینە دەناسرێت؟ ئەم پرسیارە بە چۆنیەتی ئەو زانینەوە وابەستە، کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ڕاستەقینە و بە ئێمەی دەناسێنێت. لێرەدا، پێویستە لەو زانینە بدوێین بۆ مەبەستی ناسینی ڕاستەقینە دانراوە و خەسڵەتەکانی شیبکەینەوە.

(زانین) یەکێکە لە کێشە گەورەکانی فەلسەفە و توێژینەوەش لە چییەتی و چۆنیەتی زانین بە (ئەپستمۆلۆجی)؛ بیردۆزەی زانین دادەنرێت. بە دیدی مامۆستا کرۆمبی، کێشەی زانین لە مێژووی فەلسەفەدا لە پرۆتاگۆراسەوە (بیریاری سۆفست) سەرهەڵدەدات و دەکەوێتەگەر.(76) پرۆتاگۆراس لەو بۆچوونەوەی مرۆڤی بە پێوەری هەموو شتێک دادناوە جەختی لەسەر ڕۆڵی سەرەکی ئەزمونی هەستەکی بۆ پەیداکردنی زانین کردوە و بە ئاکامی ڕێژەگەرایەتیش گەیشتوە. لە ئەزمونی هەستەکییدا زانینەکان بەگوێرەی بارودۆخە دەرەکییەکان و ناوەکییەکان، لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە و لە کات و شوێنێکەوە بۆ کات و شوێنێکی دیکە دەگۆڕێن.

(76) I. M. Crombie, *An Examination of Plato’s Doctrine*, London: Routledge and Kegan Paul, 1963. P. 1.

ئەوەی تاکە کەسێک لە بارەی بابەتێکەوە دەیزانێت ڕێژەیی و لە گۆڕاندایە. بەڵام ئەگەر سەرنجێکی وردی هۆنراوە فەلسەفییەکەی پارمەنیدس بدەین دەبینین لە پێش پرۆتاگۆراسدا ئەم بیریارە هەوڵیداوە خۆی بەودیو جیهانی هەستکردن بگەیەنێت و پەنا بۆ جۆرە زانینێکی جیاوازتر بۆ ناسینی ڕاستەقینە بەرێت. لە هۆنراوەکەیدا خاتو خواوەندێک بە پارمەنیدس دەڵێت، دەرگای هەستەکانی دابخات چونکە هەستکردن دەستکورتە و بە ڕاستەقینە ناگات و پێویستە پشت بە هۆش ببەستێت.(77)

ئەمە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەپستمۆلۆجییەکە، کە ئاشکرا جیاوازی نێوان ئەزمونی هەستەکی و هۆشەکی دەستنیشان دەکات. لەبەر ڕۆشنایی ئەم هۆنراوە فەلسەفییەدا دەتوانین پارمەنیدس نەک ئەفلاتون بە پێشەوای فێرگەی هۆشەکی و ئەفلاتونیش بە یەکێک لە شوێنکەوتوانی دابنێین. هەروەها، جیاوازییەکی گەورە لەنێوان پارمەنیدس و پرۆتاگۆراسدا هەیە. ئەپستمۆلۆجی پرۆتاگۆراس لەسەر ئەزموونی هەستەکی و زانینە هەستەکییەکان دامەزراوە و خۆی بە ئەو دیو جیهانی هەستەکردنەوە ناگەیەنێت. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە چۆنیەتی ڕاستەقینە بۆ ئەم بیریارە هەیە. پرۆتاگۆراس باوەڕی بە ڕاستەقینەیەک لەودیو جیهانی هەستەکییەوە نیە. ڕاستەقینە ئەوەیە دەکەوێتە بەرڕۆشنایی ئەزمونی هەستەکییەوە و بە ڕێگەی هەستکردن

(77) Martin J. Henn, *Parmenides of Elea*. B7, p. 26.



دەناسرێت. ئەگەر شتێک لەودیو جیهانی هەستەکییەوە بێت، ئەوا مرۆڤ ناتوانێ بیدۆزێتەوە و زانینی لەبارەوە هەبێت. پارمەنیدس، بەپێچەوانەی پرۆتاگۆراسەوە، زانین تەنیا بە هەستکردن دانانێت. ئەوەی هەستکردن بە ئێمەی دەگەیەنێت (ڕاستی) بوون نەیە. ڕاستی بوون لەوە بەرزترە هەستکردن بیگاتێ و ڕۆشنایی بخاتە سەر. بۆ ناسینی ڕاستی بوون پێویستە پەنا بۆ (هۆش) بەرین، کە تەوانای سنوربڕینی هەیە و خۆی بەودیو جیهانی هەستەکییەوە دەگەیەنێت.

لەسەر جیاکردنەوەی دوو جۆر زانین؛ هەستەکی و هۆشەکی، هەروەها دانانی یەکەمیان بە کەمتر لە دووەمیان، ئەفلاتون باسی دوو جۆر جیهانی کردووە. جیهانی نزم، جیهانی هەستەکی و بابەتە هەندەکییەکانی نێو کات و شوێنن و بەردەوام گۆڕانیان بەسەردادێت. جیهانی بەرزیش جیهانی هۆشەکی و فۆرمە بەرزە هەمەکی و نەگۆڕەکانە. ئەم فۆرمانە لە ئەستو بەدەرن و هیچ خەسڵەتێکی هەستەکی، وەکو ڕەنگ، بۆن، دەنگ و تام و..هتد یان هەڵنەگرتوە. لەودیو جیهانی هەستەکی و هەستکردنەوەن، وەکو (ڕاستی بوون) لە فەلسەفەی پارامەنیدسدا هەستکردن نایانگاتێ. ئەگەر مرۆڤ ئامێرێکی دیکەی زانینی بێجگە لە هەستکردن نەبێت، ئەوا جیهانی بەرز بۆ هەمیشە بە نەزانراوی دەمێنێتەوە. بەڵام پارمەنیدس ئاماژە بۆ (هۆش) دەکات. لەسەر زاری خاتو خواوەندی هۆنراوەکەیەوە بۆمان باسدەکات، کە پێویستە ڕێگەی بیرکردنەوەی هۆشەکی بگرینەبەر.

ئەم ڕێگەیە پرۆتاگۆراس ڕەتی دەداتەوە و بۆ ئەفلاتون بووە بە بناخەی ئەپستمۆلۆجییەکەی و تەنیا ڕێگەیەک بۆ ناسینی فۆرمە بەرزەکان. لەسەرو ئەمەشەوە، ئەو جۆرە زانینەیە فەیلەسوف لە مرۆڤە سادەکان جیادەکاتەوە و پلەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری بەرزی پێدەبەخشێت و بە کەسێکی لێهاتوی بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت دادەنێت. ئەمەش گرنگی (زانین) لە ژیانی مرۆڤدا دیاریدەکات. زانین تەنیا ئەوە نیە کەسێک ناوی چەند نەخۆشییەک و دەرمانەکان بۆ چارەسەرکردنیان بزانێت، کێشە ماتماتیکییەکانی لەبەر بێت یان جیاوازییەکانی نێوان هۆنراوەی دوو سەردەم دەربخات. گرنگی زانین لە ڕەهەندی کاریگەرێتی زانیندا دەردەکەوێت. وەکو چۆن درەختێک بە تیشکی خۆر و خۆڵ و ئاو گەورە دەبێ و بەردەگرێت، مرۆڤیش پێویستە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەو زانینەی پەیدای دەکات لە ناوەوە گۆڕانی بەسەردا بێت و ببێت بە کەسێکی چاکتر. زانین ژیان دەگۆڕێت، جوانتر و چاکتری دەکات چونکە مرۆڤ بەو پایەیە دەگەیەنێت (ڕاستی) بناسێت و بە فۆرمە بەرزەکان بگات. ئەم ڕۆڵەی زانین، کە پەیوەندی بە فەلسەفەی پەروەردەی ئەفلاتونیشەوە هەیە، لە دایەلۆگی کۆماردا لە مێتافۆری (ئەشکەوت)دا ڕوونکراوەتەوە؛

پاش ئەوە گوتم، بەراوردێکی کاریگەرێتی بوون و نەبوونی پەروەردە بەسەر سروشتی ئێمەوە لەم نموونەیەدا بکە: وای دابنێ کۆمەڵێک لەنێو ئەشکەوتێکدا دەژین. دەرگای



ئەشکەوتەکە لەسەرەوەیە ولەوانەوە دوورە. دەرگاکەش بەقەد پانی ئەشکەوتەکەیە و ڕووناکی لەوێوە بەنێو ئەشکەوتەکە دەگات. ئەو کۆمەڵە لە منداڵییەوە لەوێ دانراون. مل و پایان بە زنجیر بەستراوەتەوە و ناتوانن ملیان بسوڕێننەوە. ڕووناکیش بۆ نێو ئەشکەوتەکە لەو ئاگرەوە دێت، کە لە دەرەوە و لە پشتیانەوە هەڵکراوە. لەنێوان ئەوان و ئاگرەکەدا ڕاڕەوێکی درێژ هەیە. وای دابنێ لەبەردەم ئەو ڕاڕەوەدا، وەکو چیغی بەردەم شانۆی بووکەشوشە بۆ هەڵسوڕانی بووکەکان دیوارێکی نزم هەڵچنراوە.

باشە.

وادانێ هەندێک کەس لەودیو دیوارەکەوە پەیکەری مرۆڤ، ئاژەڵیان بە کۆڵەوەیە، کە لەبەرد و تەختە و شتی دیکە داتاشراون و هاتوچۆ دەکەن. هەندێکیان دەدوێن و ئەوانی دیکەیان بێدەنگن.

ئەوەی باسی دەکەیت سەیرە، کەسانی نێو ئەو زیندانەش سەیرن.

ئەوان لە ئێمە دەچن. ئایا بێجگە لە سێبەری خۆیان و ئەوانەی دیکە، کە ڕووناکی ئاگرەکە لەسەر دیوارەکەی بەردەمیان دەری دەخات هیچی دیکە دەبینن؟

ئەگەر نەتوانن ئاوەڕ بدەنەوە چۆن دەبینن؟

ئەی لەبارەی ئەو بابەتانەوە، کە تەنیا سێبەرەکانیان دەردەکەون؟

بۆ ئەوانیش بەوجۆرەیە.

ئەگەر لەگەڵ یەکدا دوان، لەو باوەڕەدا نیت تەنیا ناوی ئەو شتانە بزانن، کە لەسەر دیوارەکە سێبەرەکەی دەبینن؟

ئەوە ڕاستە.

ئەگەر ئەشکەوتەکە دەنگ بداتەوە، لەو باوەڕەدا نیت، کە لەگەڵ دەنگدانەوەکەدا سێبەرێک ببینن واهەست دەکەن دەنگەکە لەو سێبەرەوە دەرچووە؟

بەدڵنیاییەوە.

کەوابوو، کەسانی نێو ئەشکەوتەکە دەگەنە ئەو باوەڕەی ڕاستی بێجگە لە سێبەرەکانی سەر دیوارەکەی بەردەمیان چی دیکە نیە.(78)

ئەفلاتون تێگەیشتنی جیاوازی بۆ ڕاستی و زانین هەیە. بە دیدی ئەو ڕاستی نێو ئەشکەوتەکە ناڕاست و زانینیشی نەزانینە. ئەم بۆچوونەش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مێتافیزیکی ئەفلاتونەوە هەیە، کە لە میتافۆری ئەشکەوتدا بەرجەستە بووە. ئایا ئەشکەوتەکە لە کوێیە و کەسانی نێو ئەشکەوتەکە کێن؟ ئەشکەوت ئاماژەکردن بۆ (شوێن) بە واتا باوەکەی نیە. لەبەر ئەوە لە هیچ شوێنێکدا

(78) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 227 – 228.



ئەشکەوتەکە نادۆزرێتەوە.لەهەمان کاتیشدا دەتوانین هەموو شوێنێک و ئەم جیهانەی تیایدا دەژین بەو ئەشکەوتە دابنێن. کەسانی نێو ئەشکەوتەکەش، کە لەوێ لە دایک بوون و دەست و پایان بەستراوەتەوە و ناچارکراون لەوێ بژین ئێمەین. ئێمە لەنێو ئەو ئەشکەوتەدا بە بێ ناسینی ڕاستی و زانین دەژین. واتای ئەشکەوت لەم ڕووەوە، بارودۆخێکی هەبووی بەسەردا سەپێنراو دەگرێتەوە، کە تاکە کەسەکان ناچار دەبن شوێنی بکەون و نەتوانن بەرپێچی بکەن چونکە (مل و پایان بە زنجیر بەستراوەتەوە و ناتوانن بجوڵێن) و ئاوڕێک لە دەرگای ئەشکەوتەکەی پشتیانەوە بدەنەوە و بابەت و سەرچاوەی ڕووناکییەکە ببینن. ئێمە لە منداڵییەوە یان لەو ڕۆژەوە پەیدادەبین کۆمەڵ باوەڕ و بەها و نەریتی خۆی بەسەر ئێمەدا دەسەپێنێت. ئێمە ناچاردەکات بە ڕاستیان دابنێین و بێجگە لە ئەوان چی دیکە بە ڕاست نەزانین. ئەو شتانە دەناسین و دەزانین، کە ئەوان دەیانناسن و دەیزانن یان ئەفلاتون گوتەنی، وەکو سێبەر لەسەر دیواری ئەشکەوتەکە دەردەکەون.

لەم ڕوونکردنەوەیەوە دەتوانین بپرسین، ئایا سێبەری سەر دیواری ئەشکەوتەکە ڕاستییە؟ ئایا دەبێتە سەرچاوەی زانین؟ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لای ئەفلاتون نەرێیە. سێبەر ڕاستی نیە و نابێت بە سەرچاوەی زانینیش. کەسێک ناتوانێت لە ڕێگەی سێبەری درەختێکەوە ڕاستی بوونی درەختەکەمان بۆ باسبکات و زانینی

سەبارەت جۆری درەختەکە هەبێت ئەگەر ئەو کەسە درەختەکەی نەدیبێت. کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بەم جۆرە درەختیان نەبینیوە. ئەوان بە سێبەری درەختەکە لەسەر دیواری ئەشکەوتەکە ئاشنابوون. لەو باوەڕەدان سێبەرەکە شتێکی ڕاستە و ئەوەی لە بارەی سێبەری درەختەکەشەوە دەیزانن زانینە لە بارەی بوونی ئەو شتەوە. ئەگەر ئەوان خۆیان لە مەکۆی ئەم دۆگمایە ڕزگارنەکەن و خۆیان بە درەختە ڕاستییەکەی دەرەوەی ئەشکەوتەکە نەگەیەنن و ڕووناکی نەبینن، ئەوەی ئەوان بە ڕاستی دادەنێن ناڕاستە و زانینەکەشیان نەزانینە.

لێرەدا زانین پەیوەندی بە ڕاستییەوە هەیە. ئەگەر ئەوەی ئاماژەی بۆ دەکرێت ڕاستی نەبێت، زانینەکەش لە بارەی ئەو شتەوە نابێت بە زانین. کەوابوو، بێجگە لە زانین (ئەپستمە: بە یۆنانی)، کە لەسەر بناخەی ڕاستی دادەمەزرێت، جۆرە زانیارییەک هەیە لای کەسانی نێو ئەشکەوتەکە سەرهەڵدەدات و پەیوەندی بە تێگەیشتنیان لە سێبەری سەر دیوارەکە هەیە. بەڵام ئەم زانیارییە ڕاستی ناس نیە و ئەفلاتون بە بڕوا (دۆکسە: بە یۆنانی) ناوزەدیدەکات. ئەوەی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە دەیزانن بڕوایە نەک زانین. ئەوان لەو بڕوایەدان سێبەری درەختەکە لەسەر دیواری ئەشکەوتەکە ڕاستییە، بەڵام سێبەر ڕاستی نیە. ئەوان لە بوونی درەختەکە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە بێ ئاگان.

زانین و بڕوا لە یەکدییەوە جیاوازن. زانین ناخی ڕاستی دەپێکێت و لەبەردەم تێگەیشتنی مرۆڤدا بەرجەستەی دەکات. بڕوا ڕاستی ناس



نیە و شوێنکەوتنی کوێرانە و ناچار بوونە لە ئاستی نەریتی نێو ئەشکەوتەکەدا. بڕوا و زانین، وەکو دوو لایەنی جیاواز لەم ئەپستمۆلۆجییەدا بەرز و نزم بەرانبەر یەکدی ڕادەوەستن. بڕوا لە نزمترین نهۆم و زانینیش لە بەرزترینیدا دادەنرێت. بۆ ڕوونکردنەوەی واتای بڕوا و دیاریکردنی جیاوازییەکەی لە زانینەوە دەتوانین لەگەڵ (خەوبینین)دا بەراوردی بکەین. لە خەودا بابەتی جیا جیا دەبینین و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، بەڵام ئەو بابەتانە بە ڕاست دانانرێن و لەگەڵ چاوکردنەوەماندا نامێنن. تێدەگەین ئەوەی بینیمان ڕاست نیە و خەو بوو. بۆ دۆزینەوەی شتە ڕاستەکان پەنا بۆ خەو نابەین. بە چاوکراوەیی و ئاگاییەوە بە دوایاندا دەگەڕێین. بابەتی نێو خەوەکە، وەکو سێبەری درەختەکەی سەر دیواری ئەشکەوتەکەیە. تاکو تاکەکان زنجیری دەست و پایان نەکەنەوە و لە قوڵایی ئەشکەوتەکەوە بەرەو دەرگای ئەشکەوتەکە و دەرەوە نەڕۆن و درەختە ڕاستەکە نەبینن، ئەوان بەردەوام نوستون و خەو دەبینن. خۆڕزگارکردن و چوونە دەرەوە لە ئەشکەوتەکە بە ئاگا هاتنەوە و ڕەوانەوەی خەوبینین و تێکشکانی دۆگمای بڕوایە.

بێجگە لە دایەلۆگی کۆمار، ئەفلاتون لە دایەلۆگی (مینۆ)شدا باسی زانین و بڕوای کردووە و هەوڵی ئاشکراکردنی جیاوازییەکانی داوە. لەم دایەلۆگەدا، ئەفلاتون لەسەر زاری سوکرات چەند پرسیارێکی گرانی ئەندازیاری لە کۆیلەیەکی نەخوێندەوار دەکات. پرسیارەکان بە جۆرێک

رێكدەخات و ئاڕاستەی دەكات، كە وەڵامەكانی تاكو ڕادەیەک لە كۆیلە نەخوێنەوارەكە دەردەهێنێت. مەبەست لەم كارەش سەلماندنی زانینە لەسەر بناخەی (بیركەوتنەوە) یان دەتوانین بڵێین ئەفلاتون زانین نەک بڕوا بە بیركەوتنەوە دادەنێت.(79) ئاشكرایە، كە بیركەوتنەوە خەسڵەتی لەپێشتری هەیە. من لەپێشتر، بۆ نموونە، درەختم بینیوە بۆیە ئێستا دەزانم ئەو بابەتە درەختە؛ یان لەپێشتر كەسێكم ناسیوە بۆیە دەزانم كێیە. كۆیلە نەخوێندەوارەكەش، هەرچەندە ئێستا نەخوێندەوارە و كۆیلەیە، لەپێشتر زانستی ئەندازیاری هەبوە بۆیە دەتوانێت وەڵامی پرسیارەكانی سوكرات بداتەوە. دەگونجێت ئەو كۆیلەیە خوێندكاری ئەندازیاری یان زانا بوو بێت و پاش جەنگێک و وێرانكردنی شارەكەی بە كۆیلە كرابێت، بەڵام چەمكی (لەپێشتر) لەم بەستێنەوە بەم جۆرە ڕووداوانەی نێو مێژووەوە نەبەستراوە. ئەفلاتون باسی ئەم (ئەگەر)ە ناكات و دەیەوێت ئاماژە بۆ جیهانی بەرز بكات. كەسانی نێو ئەشكەوتەكە پێش پەیدابوونیان لەنێو ئەشكەوتەكەدا لە شوێنێكی دیكە ژیاون و زانینێكی تەواویان سەبارەت هەبووەكان لە فۆرمی هەمەكییدا هەبووە.

بەڵام زایندانی كردنیان لەنێو ئەشكەوتەكە هێندە تاڵ و نالەبارە، هەروەها دۆگمای نێو ئەشكەوتەكە هێندە بە دەستەڵاتە ڕێگەیان نادات بە ئاسانی ڕابردووی خۆیان بیركەوێتەوە. لەبەر ئەمەشە پێویستییان

Plato, "Meno." in *Plato:Complete Works*, 86- d, p. 886. (79)



بە بیرهێنانەوە هەیە. ئەوان هیچ شتێک بۆ یەكەمجار ناناسن. هەموو ناسینێكی یەكەمجار دووەمجارە چونكە لە پێش ئەمجارەدا، لە جیهانی بەرزدا، ئەو جیهانەی مرۆڤی هەمەكی تیدا دەژی، ئەو شتانە ناسراوە. مرۆڤی تاک، كە وەرگیراوی فۆرمی مرۆڤە لە جیهانە بەرزەكەدا، بە زانینێكی تەواوەوە سەبارەت فۆرمە هەمەكییەكان لەم جیهانەدا پەیدادەبێت. ئەو تەنیا سیما و ڕواڵەتی فۆرمی مرۆڤە هەمەكییە بەرزەكە نیە، خەسڵەتەكانی دیكەشی، وەكو جوانی، زانین، چاكە، دادوەری وەردەگرێت. پلەی بەرزی و نزمی ئەم خەسڵەتانە لە تاكە كەسەكاندا بۆ بیركەوتنەوە دەگەڕێتەوە. مرۆڤ فرێدراوەتە ئێرە و لەنێو ئەشكەوتدا بەجێماوە. لە ئاكامی ئەم فرێدانەدا توشی لە بیرچوونەوە و دۆگمای بڕوا بووە. تاریكی نێو ئەشكەوتەكە و دۆگمای بڕوا كوێری كردووە. تاكو خۆی ڕزگارنەكات ڕاستی ناناسێت و (زانین)ی دەست ناكەوێت. پێش ئەوەی باسی خۆ ڕزگاركردنی مرۆڤ لە دۆگمای بڕوا و تاریكی نێو ئەشكەوتەكە بكەم حەز دەكەم چەند خەسڵەتێكی (زانین) لەم بۆچوونەی ئەفلاتونەوە ڕوونبكەمەوە بۆ ئەوەی باشتر لە بیردۆزەی زانین تێبگەین.

**یەكەم** : زانین پەیوەندی بە فۆرمە هەمەكییەكانەوە هەیە؛ ناسینی بابەتێكی هەندەكی زانین پێكناهێنێت. سێبەری سەردیوار ئەشكەوتەكە نابێت بەسەرچاوەی زانین.

**دووەم** : زانین هەمەکییە نەک هەندەکی چونکە بابەتەکەی هەمەکییە.

**سێیەم** : زانین نەگۆڕە؛ لە تاکێکەوە بۆ تاتێک یان لە شوێن و کاتێکەوە بۆ شوێن و کاتێکی دیکە گۆڕانی بەسەردا نایەت. ئەمەش دیسانەوە پەیوەندی بە فۆرمە هەمەکییەکانەوە هەیە. زانین لەوەدا نیە شتێکی جوان بناسیت، بەڵکو لەوەدایە بزانێت خودی جوانی چیە.

**چوارەم** : زانین بیرکەوتنەوەیە. ئەمەش پەیوەندی بە فرێدانی مرۆڤ لەنێو ئەم جیهانەدا هەیە. ئەم جیهانە، بۆ ئەفلاتون، نیشتمانی ڕەسەنی مرۆڤ نیە، بەڵکو (مەنفا)یە.

**پێنجەم** : زانین تەنیا ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە ڕاستی. من لە نموونەی سێبەری درەختەکەی سەر دیواری ئەشکەوتەکە و درەختدا پەیوەندی نێوان زانین و ڕاستیم باسکرد.

**شەشەم** : ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە (زانین) ئەو جۆرە زانیارییەیە، کە بتوانرێت کەسێکی پێ فێربکرێت؛ ئەمەش پەیوەندی نێوان زانین و فێرکردن دەردەخات،کە لەدایەلۆگی (مینۆ)دا جەختی لەسەرکراوە.(80) بەهەرحاڵ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە بڕوا بە هیچ جۆرێک لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە ناگوێزرێتەوە. بێگومان ئێمە پەروەدەکراو یان فێرکراوی دۆگمای نێو ئەشکەوتەکەین، بەڵام

(80) Plato, "Meno," in *Plato: Complete Works* 80,b-d, p. 879.



مەبەستی ئەفلاتون لە فێربوون جیاوازە و پێوستە لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی پەروەردەی ئەم بیریارەوە تەماشای بکرێت. تێگەیشتنمان لەم خەسڵەتانەی زانین واتای (بڕوا)شمان بۆ دەردەخات. ئەگەر زانین بە فۆرمە بەرزەکانەوە گرێدرابێت، هەمەکی و نەگۆڕ بێت، ڕاستی ناس بێت و پەیوەندی بە جیهانی بەرزەوە هەبێت؛ بڕوا، کە بەرانبەر زانین دژوەستاوە، پەیوەندی بەم جیهانە ساختەیە و بابەتە وەرگیراوە هەندەکییانەوە هەیە و کاتییە. لێرەدا دەبینین (زانین) بەم خەسڵەتانەوە دەبێت بە کێشەیەکی دژوار. ئێمەی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە و دۆگمای بڕوا ڕاستی ناس نین. ئەوەی دەیناسین، کە سێبەرەکانە، ساختەن. ئایا چۆن بتوانین (زانین) بە دەست بهێنین؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بۆ دایەلۆگی کۆمار دەگەڕێمەوە، کە ڕێگەی پەیداکردنی (زانین) دیاریکراوە؛

> لەو باوەڕەدا نیت دەردی نەزانینیان چارەبکرێت، ئەگەر ئەمە ڕوویدات: یەکێک لەوان زنجیرەکەی دەکرێتەوە و هەڵدەستێتە سەر پێ. ئاوەڕ بۆ دواوە دەداتەوە. ڕوو دەکاتە ڕووناکییەکەو بەرەو دەرەوە دەڕوات. چاوەکانی بە تیشکی ئاگرەکە دەکەونە ژان و ناتوانێت ئەو شتانە ببینێت، کە لەوەو پێش سێبەرەکانی بینیون. بە ڕای تۆ چی ڕوودەدات، ئەگەر بەو کەسە بڵێین ئەو شتانەی لەپێشتر[لەنێو ئەشکەوتەکەدا] بینیویەتی، ڕاست نین و ئێستا لەبەر ئەوەی لە شتە ڕاستەقینەکانەوە نزیک بۆتەوە

دەتوانێت بیانبینێت؟ چونکە ئەگەر ئەو شتانەی یەکە یەکە
نیشاندەین و پرسیاری لێبکەین، کە چین لەو باوەڕەدا نیت
سەری لێ بشێوێت، وابزانێت بابەتەکانی[نێو ئەشکەوتەکە]لەمانە
ڕاسترین؟

وایە.

ئەگەر داوای لێبکەین بڕوانێتە تیشکی ئاگرەکە، ئایا چاوی
نایەشێت؟ ڕوو لەو شتانە ناکات، کە دەتوانێ بیانبینێت چونکە
لەو باوەڕەدایە ئەو شتانە چاکتر دیارن؟

ئەوە دەکات.

ئەگەر ئەو کەسە تەماشای ڕۆژ بکات و خۆرەکە لە چاوی بدات
بەهەمان شێوە چاوی نایەشێت و بێزار نابێت؟ دەتوانێت
ئەو شتانە ببینێت، کە لەپێشتر بە ڕاستی دادەنان؟

ئەو ناتوانێ بیانبینێت.

هەست دەکەم پێویستی بە کاتە تاکو لەگەڵ ڕاستییەکانی جیهانی بەرزدا ڕابێت. یەکەمجار بە ئاسانی سێبەرەکان دەبینێت، دوای ئەوە وێنەی کەسەکان و شتەکانی دیکە لەنێو ئاوەکەدا، دوایی خودی شتەکان دەبینێت. بە شەو تەماشای ئاسمان دەکات، مانگ و ئەستێرەکان باشتر لە ڕۆژ و تیشکی خۆر دەبینێت.

دروستە.



دواجار، خودی ڕۆژ، نەک ڕەنگدانەوەی لەنێو ئاودا یان لە
شتێکی دیکەدا دەبینێت و بیری لێدەکاتەوە.(81)

پەیداکردنی زانین و ناسینی ڕاستی پێویستی بە تێکشکانی دۆگمای بڕوا هەیە. ئەمەش لەسەر هەوڵدانی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بۆ خۆڕزگارکردن ڕادەوەستێت. ئەو کەسەی زنجیری دۆگماکە دەشکێنێت بەرەو ڕووناکی دەڕوات. دەتوانێت زانین وەدەست بهێنێت و ڕاستی بناسێت. ئەم زاراوانە (زنجیرکردنەوە، هەستانەسەرپێ، ئاوەڕ بۆ دواوە دانەوە، ڕووکردن لە ڕووناکی و بەرەو دەرەوە ڕۆیشتن) واتای تایبەتی خۆیان هەیە و ئەفلاتون بۆ مەبەستی فەلسەفی بەکاریهێناون. لەلایەن تاکە بە ئاگاکانەوە ئاماژە بۆ هەڵوێستی یاخیبوون لە دۆگمای بڕوا و نەریتی نێو ئەشکەوتەکە دەکەن. ئەو تاکانەی بەو کارانە هەڵدەستن و سێبەرەکان بە ڕاستی دانانێن تەواناى پەیداکردنی زانینیان هەیە. بۆ دۆزینەوەی ڕاستی مرۆڤ دەبێت زنجیری دۆگما بشکێنێ و بەرەنگاری بکات؛ ڕوو لەو ڕووناکییە بکات، کە تاریکی لەناودەبات و ڕاستی دەردەخات. بەڵام ئەم مرۆڤە یاخیبووە ئەفلاتون ئەم ئەرکەی پێدەسپێرێت و بە ئاگاوە زنجرەکە دەشکێنێت و خۆی ڕزگاردەکات کێیە؟ ئەو مرۆڤە کەسێکی بە ئاگایە و دەزانێت سێبەرەکانی سەردیوارەکە بڕوایەکی ڕووتن و(ڕاستی) دەرناخەن. سەرهەڵدانی ئەم ئاگاییە، وەکو سەرەتایەک هەنگاونانێکی گەورەیە و هەوێنی

(81)ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 228 – 229.

ياخیبوونەکەیە لە دۆگمای بڕواو نەریتی نێو ئەشکەوت. تاکو مرۆڤ ئەم ئاگاییە پەیدانەکات و لەم سەرەتایەوە نەکەوێتە گەر ناتوانێت پەنجەی یاخیبوون بەرزکاتەوە و ڕوو لە ڕووناکی بکات. کەوابوو، ئەم مرۆڤە ناوەڕۆکی سێبەرەکان دەناسێت و لە بنەڕەتی دۆگمای بڕوا تێگەیشتوە. کەسێکە بە ئاگاوە یان بە تێگەیشتنەوە هەوڵی دیاریکردنی جیاوازییەکانی نێوان سێبەرەکان و بابەتە ڕاستەقینەکان دەدات. بەڵام چۆن ئەو دەتوانێت جیاوازییەکان بدۆزێتەوە؟  ئێمە دەزانین ئەو هێشتا لە ئەشکەوتەکە نەچۆتە دەرەوە و ئەوەندە دەزانێت، کە سێبەرەکان بێجگە لە سێبەر چی دیکە نین و لە ڕاستییەوە دوورن. بۆ ئەم مەبەستە یان بۆ دۆزینەوەی جیاوازییەکان دەبێت ئەو بابەتە ڕاستەقینانە پەیدابات، کە سێبەرەکانیان لەسەر دیوارەکە  بوون بە دۆگمای بڕوا. بۆ هەڵوەشاندنەوەی دۆگماکە پێویستی  بە بابەتە ڕاستەقینەکانە. لەبەر ئەمە، یاخیبوونەکەی لەگەڵ تێگەیشتنی لە ناوەڕۆکی سێبەرەکان کۆتایی نایەت و ڕوو لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە بۆ پەیداکردنی بابەتە ڕاستەقینەکان دەکات. ئەو دەیەوێت درەختە ڕاستەقینەکە بدۆزێتەوە و تێبگات، کە چەند لە سێبەرەکەیەوە جیاوازە. لێرەدا، ئەم کەسە بە سێ قۆناخی یاخیبووندا تێدەپەڕێت؛ **ئاگایی** و **زنجیرشکاندن** و **ڕووکردن لە ڕووناکی**. ئەم سێ قۆناخە لەو سەرەتایەدا کۆدەبنەوە، کە بە یاخیبوون ناوزەدمان کرد.



هێشتا دیاریکردنی کەسە بە ئاگا و یاخیبووەکە بۆ زۆربەمان ساغ نەبۆتەوە. دەشێ هەر یەکێک لە ئێمە، کە کەسێکی بە ئاگا و ڕووناکبیرە و باوەڕی بە گۆڕان و بەرەو پێشەوەچوون هەیە، لە نەریت و بەها ڕەوشتییەکانی کۆمەڵەکەی ناڕاز و یاخی بێت، خۆی بەو مرۆڤە دابنێت ئەفلاتون ئەو ئەرکە مەزنەی پێدەبەخشێت. ئەم بۆچوونە تاکو ڕادەیەک دروستە و لە ڕاستییەوە دوور نیە. هەر تاکێک ئەرکی تێکشکانی دۆگمای بڕوا بگرێتە ئەستۆ دەبێت بەو قارەمانەی لە میتافۆری ئەشکەوتدا باسکراوە. بەڵام ئەفلاتون بە تێکشکانی دۆگمای بڕوا ڕاناوەستێت و دەیەوێت ئەو کەسە گەشتەکەی لەوێدا کۆتایی پێنەهێنێت و لەگەڵ دۆزینەوەی درەختە ڕاستەقینەکەی دەرەوەی ئەشکەوتەکە بە دوا قۆناخی زانین نەگات چونکە لە ژوور درەختەکەوە ڕاستی بەرزتر هەیە. گەشتەکە، بە ئاگایی لە ناوەڕۆکی سێبەرەکان دەستپێدەکات و لەگەڵ دۆزینەوەی بەرزترین ڕاستیدا دەگاتە دوا ترۆپکی پێشکەوتن. لەبەر ئەم هۆیەش  ئەرکی دۆزینەوەی بەرزترین ڕاستی بە هەموو کەسێک نەدراوە. هەموو تاکەکان تەوانای یاخیبوون لە دۆگمای بڕوا و دۆزینەوەی بەرزترین فۆرمی ڕاستییان نیە. زۆرینەی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بە ناسینی سێبەرەکان و بارودۆخی نێو ئەشکەوتەکە و دۆگمای بڕوا ڕازین و نایانەوێت خۆیان ڕزگار بکەن. بێگومان ئەم هەڵوێستەشیان وابەستە بە (نەزانین)یانەوە. ئەوان نازانن ڕاستی لە دەرەروەی ئەشکەوتەکەدا دەدۆزرێتەوە و سێبەرەکانیش بە

هەموو شتێک دادەنێن. کەوابوو، چەند کەسێک، نەک هەموو تاکەکانی کۆمەڵ یاخی دەبن و دەیانەوێت بە ڕاستی بگەن و بە دوای زانییندا دەگەڕێن. ئەفلاتون ئەم تاکانە بە (فەیلەسوف) ناوزەد دەکات.

فەیلەسوف ئەو کەسەیە بە ئاگاوە ڕەتی سێبەرەکان دەداتەوە و لە دۆگمای بڕوا یاخی دەبێت و خۆی بە بەرزترین فۆرمی ڕاستی دەگەیەنێت: لەپێشتر ئاماژەم بۆ ئەو خاڵەش کرد، کە (ئەشکەوت) واتای (شوێن)، وەکو ئەم ژوورە نابەخشێت و میتافۆرە. گەشتەکەی مرۆڤە یاخیبووەکەش یان فەیلەسوفەکە بڕینی نێوان دوو شوێنی دیاریکراو نیە و لەسەر گەشەکردن و پێشکەوتنی دەروون و زانینی تاکە کەسەکە ڕادەوەستێت؛ گۆڕانکارییەکی بەردەوامە لە جیهانی ناوەوەی کەسەکەدا و گواستنەوەیە لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی. لەم بارەوە ئەفلاتون دەڵێت؛

دەشێ بە هەڵەم دانەنێن ئەگەر بڵێم، گەشتی ئەو مرۆڤەی ڕزگاری دەبێت و دەگاتە جیهانی دەرەوە، لە جووڵەی ژوورکێشی دەروون بەرەو جیهانی هۆشەکی دەچێت. نازانم من ڕاست بۆ کێشەکە چووم یان نا بەڵام لە جیهانی زانراودا فۆرمی چاکە بەرزترینە و دوا فۆرمە ببینرێت و بە دژوارییەوە دەدۆزرێتەوە. ئەو کەسەی بتوانێت بیناسێت و بەو ئاکامە بگات، کە فۆرمی چاکە هۆی هەموو شتێکی دروست و جوانە و سەرچاوەی ڕووناکی و جیهانی هەستەکییە و لە جیهانی



هۆشەکیشدا سەرپەرشتی هەموو شتێک دەکات، تێگەیستن و ڕاستیش لەوەوە دەردەچن. لەبەر ئەوە پێویستە هەموو کەسێکی هۆشیار لە ژیانی تایبەتی و گشتیدا بیدۆزێتەوە.

منیش هەمان بۆچوونم هەیە.

وەرە لەسەر ئەم خاڵەش لە گەڵما ڕێکەوە: ئەوانەی بەم پلەیە دەگەن خۆیان بە کاروباری ڕواژانەی خەڵکیەوە ماندوو ناکەن.

ڕوو لە بەرزی دەکەن.

ئێمەش چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکەین.(82)

لێرەدا، جارێکی دیکە جەخت لەسەر ڕۆڵی زانین بۆ پێشخستنی بیرکردنەوەی مرۆڤ دەکرێت تاکو بە کێشە بەرزەکانەوە ماندووبین. ئەمەش دابڕانی ئەم کەسە لە داکەوت و ژیانی کۆمەڵایەتییەوە دیاری ناکات چونکە ئەو کەسەی خۆی بە فۆرمی چاکە دەگەیەنێت و دەبێت بە خاوەنی زانین بەرانبەر داکەوت و کۆمەڵەکەی بەرپرسە. مرۆڤە یاخیبووەکە جارێکی دیکە بۆ نێو ئەشکەوتەکە دەگەڕێتەوە و (ڕاستی) بە کەسانی نێو ئەشکەوتەکە دەناسێنێ و هەوڵی تێکشکانی دۆگمای بڕوا دەدات. بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نیە. ئەوانەی شوێن دۆگمای بڕوا کەوتوون و ڕووناکی دەرەوەی ئەشکەوتەکەیان نەدیوە دژی ڕادەوەستن و بەرەنگاری دەکەن. ئەوان دەیانەوێت دۆگمای بڕوا بەردەوام بێت و باوەڕ بە گۆڕان ناکەن. هەندێک جار بەرەنگارییەکە

(82) هەمان سەرچاوە. ل 230

ژیانی کەسە ڕاستی ناسەکە دەخاتە مەترسییەوە و بە مەرگی ئەو یان بە تراجیدیا کۆتایی دێت. مەرگی سوکرات نموونەی ئەم ئاکامە تراجیدییە یە لە بەرەنگارییەکەدا.(83)

تاکو ئەم قۆناخە لە توێژینەوەکەماندا باسی بڕوا و زانینمان کردوە. بڕوامان بە سێبەرەکانی سەر دیواری ئەشکەوتەکە و زانینیشمان بەو ڕاستییەوە بەستەوە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەدا هەیە و سەرچاوەی بوونی سێبەرەکانیشە. بڕوا و زانین، لە بیردۆزەی زانینی ئەفلاتوندا دوو سەری دوور و بە یەک نەگەیشتوی ئەستونێکن. بڕوا سەری خوارەوە و زانین سەری ژوورەوەی ئەستونەکەیە. یەکەمیان تاریک و ناڕاستە و دووەمیان ڕووناک و ڕاستە.

بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەکەی ئەفلاتون لەگەڵ دامەزراندن و جیاکردنەوەی ئەم دوو سەرەدا کۆتایی نایەت. ئەگەر بمانەوێت لە بڕواوە بەرەو زانین بڕۆین، دەبێت ناوەندیان ببڕین و لەم گەشتەدا توشی چەند بابەتێکی دیکە دەبین، کە تاکو ڕادەیەک لە بڕوامان دوور دەخەنەوە و لە زانینیش نزیکمان دەکەنەوە. گەشتەکەمان بەوشێوەیەی ئەفلاتون باسیدەکات جوڵانێکی ژوورکێشییە بەرەو جیهانی هۆشەکی؛ لە نزمترین پلەوە بۆ بەرزترینە یان لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی و دواتریش گەیشتنە بە سەرچاوەی ڕووناکییەکە.

(83) لە پەرتووکەکەمدا (نیتشە وپاش تازەگەری) باسی ئەم تراجیدیایەم کردووە و ئاماژەم بۆ دوو جۆر مردن بۆ فەیلەسوف یان ڕۆشنبیر کردووە. بڕوانە: د. محەمەد کەمال، نیتشەو پاش تازەگەری، چاپی دووەم، دەستگای سەردەم، سلێمانی،2009 ل 31- 35



ئەمەش لە مێتافۆری ئەشکەوتدا ئاشکرا باسکراوە. مرۆڤە یاخیبووەکە بە چەند قۆناخێکدا تێدەپەڕێت تاکو خۆر(سەرچاوەی ڕووناکی) لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە دەبینێت. لەسەرو دۆگمای بڕواوە یان سێبەرەکانی سەردیواری ئەشکەوتەکە بابەتە هەستەکییەکان دەدۆزینەوە، کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی زانینی هەستەکی یان هەستکردن. بەڵام ئەفلاتون هەستکردنیش بە زانین دانانێت. بێجگە لە دایەلۆگی کۆمار، ئەفلاتون ئەم خاڵەی بە درێژی لە دایەلۆگی (تیاتیتۆس)دا باسکردوە. بێگومان ئەم دایەلۆگە پاش (کۆمار) نوسراوە و بەردەوامی لە بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەکەی ئەفلاتوندا دەردەخات. لەم دایەلۆگەدا سوکرات لەگەڵ تیاتیتۆس، زانایەکی ماتماتیکی لاو لەسەر واتای زانین دەکەوێتە گفتوگۆ و لە تیاتیتۆس دەپرسێت، زانین چیە؟ تیاتیتۆس لە وەڵامەکەیدا پەیڕەوی بیروڕاکەی پرۆتاگۆراسی سەفسەتی دەکات و زانین بە هەستکردن دادەنێت؛

تۆ، تیاتیتۆس جارێکی دیکە بگەڕێرەوە سەر باسەکە و پێم بڵێ زانین چیە. بە هیچ شێوەیەکیش واخۆت دەرمەخە، کە ناتوانیت. ئەگەر خوا یار بێت و تۆش کەسێکی لێهاتوو بیت، دەتوانیت.

بە ڕاستی، سوکرات، پاش ئەم هاندانەی تۆ بڕواناکەم بتوانم خۆم لە باسەکە بدزمەوە و شتێکی لەسەر نەدوێم. بۆ من، ئەگەر کەسێک شتێک بزانێت ئەو زانینەی بە ڕێگەی

هەستکردنەوە دەست کەوتوە و بەو جۆرەشە، کە ئەو شتە زانراوە ئێستا دەردکەوێت. بەهەر حاڵ، من دەڵێم، زانین هەستکردنە.(84)

گەیشتن بەم پێناسەیە بۆ زانین قۆناخی دووەم و پلەیەک بەرزتر لە دۆگمای بڕوا لە ئەستونی ئەپستمۆلۆجی ئەفلاتوندا دیاریدەکات. سێبەری درەختەکە لەسەر دیواری ئەشکەوتەکە (ڕاستی) ئەو بوونە، کە درەختە دەرناخات. بۆ ئەوەی لە چییەتی بزانین درەخت تێبگەین دەبێت درەخت ببینین. ئەمەش جۆرێکە لە هەستکردن. بینین کەناڵێکی هەستکردنە و لە ڕێگەیەوە چەند خەسڵەتێکی هەستپێکراو نەک هەموو خەسڵەتەکان دەدۆزرێتنەوە. لە بینیندا قەوارەو ڕەنگی درەختەکە دەردەکەون، بەڵام تام و بۆنی، زبری و لوسی قەد و گەڵاکانی هەستیان پێ ناکرێت. هەریەکێک لە کەناڵەکانی هەستکردن، وەکو بینین، بیستن، تامکردن، بۆنکردن و هەستی دەستلێدان بە جیا بەکاری خۆیان هەڵدەستن و جێگەی یەکدی ناگرنەوە.

نەبوونی یەکێکیش لەم کەناڵانە کاردەکاتە سەر هەستکردن و ناسینی بابەتە دەرەکییەکە. لەسەرو ئەمەشەوە، هەستکردن هەمیشە پێویستی بە بابەتی هەستپێکراو هەیە. ئەم پەیوەندییە (زەرورییە) لەنێوان زانین و بووندا بەردەوام لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا جەختی لەسەر کراوە و بە بۆچوونی من پەیوەندی بە کاریگەرێتی پارمەنیدس بەسەر ئەفلاتونەوە

(84) Plato, "Theaetetus", in *Plato: Complete Works*,151d-e, p.168



هەیە. من لەپێشتر ڕوونمکردەوە، کە بۆ پارمەنیدس زانین و بوون یەک شتن. ئەوەی بیری لێدەکرێتەوە و دەتوانین باسی بکەین بوونە. ناکرێت باس لە نەبوون بکەین یان لەسەر شتێک بدوێین، کە نیە. سێبەرەکانی سەردیوارەکەی نێو ئەشکەوتەکەش جورێکن لە بوون. هەر شتێک لەبارەی سێبەرەکەوە بزانین، گرنگ نیە چ جۆرە ناوێکی بۆ دابنرێت، پەیوەندی بە بوونی سێبەرەکەوە هەیە. ئەگەر لەم قۆناخەشدا، لەگەڵ تیاتیتۆس هاوڕا بین و زانین بە هەستکردن دابنێین ئەوا هەستکردن بەبێ بابەتێکی دەرەکی لە دەرەوەی هەستکردن ڕوونادات. بۆ ئەوەی هەست بە درەختەکە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە بکەین پێویستە (درەخت)، وەکو بابەت هەبێت. لەم ڕووەوە، بوون دەبێتە سەرچاوەی زانین و ئۆنتۆلۆجیش بە بناخەی ئەپستمۆلۆجی. بێگومان ئەم شیکردنەوەیە لەگەڵ بۆچوونەکەی ئەفلاتوندا بە ڕادەیەک ناکۆکە چونکە ئەفلاتون دەیەوێت بە ڕێگەی جیاکردنەوەی قۆناخەکانی زانین ئاماژە بۆ بابەتەکان بکات. ئەمەش بەو ئاکامەمان دەگەیەنێت، کە ئەپسیتمۆلۆجی دەبێت بە بناخەی ئۆنتۆلۆجی. ئەم ئاکامەش نادروستە و ئێمە لەگەڵ ئەفلاتوندا لەسەر ئەم خاڵە ڕێک ناکەوین. بەڵام هێشتا پەیوەندییە پێویستەکەی نێوان ئۆنتۆلۆجی و ئەپستمۆلۆجی لەناوچێت. بوون و زانین، وەکو دوو لایەنی پێکەوە بەستراو دەمێننەوە. ناکۆکییەکەمان لەگەڵ ئەفلاتوندا لە پێشخستن و پاشخستنی یەکێک لەم لایەنانەدایە.

گەیشتن بە قۆناخی هەستەکی، وەکو ڕاچڵەکان لە خەو بە ئاگا هاتنەوەیە. سێبەرەکانیش بابەتەکانی نێو خەوبینین. ئێستا مرۆڤە خەوبینەرەکە بە ئاگایە و لە جیگەی سێبەری درەختی سەر دیوارەکە خۆی بە درەختەکە گەیاندوە. بەڵام درەختەکەش جۆرێکە لە بوون و لەسەرو ئەوەوە قۆناخی زانینی دیکە و بوونی بەرزتر هەیە. درەختەکە بابەتێکی هەستەکییە و بە ڕێگەی هەستکردن دەناسرێت. ئەگەر باوەڕ بە بوونی بەرزتر و زانینی جیاواتر نەکەین، کە لەژوور بابەتە هەستەکییەکانەوە هەن، ئەوا پەیڕەوی پرۆتاگۆراس و تیاتیتۆسی قارەمانی دایەلۆگەکەی ئەفلاتون دەکەین و هەستکردن بە زانین و دوا قۆناخی زانین دادەنێن. لێرەدا تێپەڕکردن و مانەوەمان لەم قۆناخەدا بۆ بۆچوونە ئۆنتۆلۆجییەکەمان دەگەڕێتەوە.

ئەفلاتون مانەوە لەم قۆناخەدا و دانانی زانین بە هەستکردن ڕەتدەداتەوە. ڕەتدانەوەکەش ئەوە ناگەیەنێت، کە (هەستکردن) نابێ هەبێت و مرۆڤیش بە دوای دۆزینەوەی خەسڵەتە هەستییەکاندا نەگەڕێت. ئەفلاتون نکۆڵی لەوە ناکات، کە درەختەکان و سەکۆکەی نێو حەوشەی ئەکادیمیا نین یان نایەوێ بزانێت ئە بابەتە هەستەکییانە چین. ئەو ناڵێت من بەبێ ئەوەی تامی هەنگوین بکەم دەتوانم باسی شیرینی ئەو بابەتە بکەم. ناڕازیبوونی لە هەستکردن ڕەتدانەوەی هەستکردن نیە، بەڵکو ڕەتدانەوەی دانانی هەستکردنە بە دوا قۆناخ و سەرچاوەی زانین. بۆ نموونە لەهەمان دایەلۆگدا دەڵێت؛



> باشە، تیاتیتۆس، تۆ دەتوانیت دڵنیابیت لەوەی ئەو بابەتەی کەسێکی دیکە هەستی پێدەکات و دەردەکەوێت بەو شێوەیەیە، کە تۆ هەستی پێدەکەیت و بۆ تۆ دەردەکەوێت؟ ئایا دەتوانیت بڵێیت هەمان بابەت لە دوو حاڵەتی جیاوازدا بە یەک شێوە تۆ هەستی پێدەکەیت؟
>
> ئەوەی تۆ باسیدەکەیت لەڕستییەوە نزیکە.
>
> کەوابوو، ئێستا با باسی قەوارە و گەرمی و ڕەنگی سپی بکەین، کە لە بابەتەکاندا هەن و ئێمەش هەستیان پێدەکەین. ئێمە ناڵێین بابەتەکە بە پەیوەندی بەستن لەگەڵ شتێکی دیکەدا جیاوازییەکەی خۆی دەردەخات بەبێ ئەوەی گۆڕانی تێدا ڕوویدات. لە لایەکی دیکەوە. ئەگەر تۆ بەو جۆرە بیریان لێبکەیتەوە و پەیوەندییان بە هەستکردنەوە هەبێت هێشتا ناکرێت جیاوازییەکەی بەو شتەوە ببەستینەوە، کە هاتۆتە لایەوە. لێرەدا دەبینیت دەتوانین زۆر لەخۆمان بکەین و بە سەرسوڕمانەوە شوێن گوتە نادروستەکەی پرۆتاگۆراس یان ئەوانەی باوەڕی پێدەکەن بکەوین. (85)

لەم پێگەیەوە و هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی گوتەکەی پرۆتاگۆراس؛ (مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە)، ئەفلاتون ڕەخنە لە زانینی هەستەکی دەگرێت. پرۆتاگۆراس لەو باوەڕەدایە بێجگە لە هەستکردن

(85) هەمان سەرچاوە. ل 171 – 172، 154 b-c.

و زانینی هەستەکی ڕێگەیەکی دیکە بۆ زانین نیە. لەبەر ئەوەی هەستکردنیش لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە و لە نێو کات و شوێنی جیاوازدا دەگۆڕێت ئەوا ئەو شتەی بۆ کەسێک ڕاستە دەشی بۆ کەسێکی دیکە ناڕاست بێت؛ یان هەمان شت لە دوو بارودۆخی جیاوازدا بۆ هەمان کەس ڕاست و ناڕاست بێت. ئەمەش هەر یەکێک لە تاکەکان دەکات بە پێوەری ڕاستی و ناڕاستی شتەکان. ئەو شتەی لە نزیکەوە گەورەیە لە دوورەوە بچوکە. تامی هەنگوین لە دەمی مندا شیرینە و لە دەمی کەسێکی نەخۆشدا تاڵە؛ یان هەنگوینەکە دوێنێ بۆ من شیرین بوو، بەڵام ئەمڕۆ نەخۆشم و تامەکەی لە دەممدا تاڵە. ئەمە نەک بە تەنیا ئاماژە بۆ گۆڕانی ئەو زانینە دەکات، کە تاکەکان سەبارەت تامی هەنگوین هەیانە، هەمان کاتیش ئەو زانینە بە هەستکردنی تاکە کەسەکان و بارودۆخی لەش یان هەستکردنی تاکەکانەوە دەبەستێتەوە و دەیکات بە ڕێژەیی. بابەتە هەستەکییەکان، هیراکلیتس گوتەنی، گۆڕینۆکن و یاسای خۆیەتی (ناسنامە)یان بەسەردا ساخنابێتەوە. هیچ بابەتێکی هەستەکی بۆ تاکە جیاوازەکان یەک جۆر ڕاستی دەرناخات. ڕاستی بەگوێرەی هەستکردنەکان دەگۆڕێت. گۆڕانکارییەکەش پەیوەندی بە خەسڵەتی نەوەستاوی بابەتەکەوە هەیە. ئەوەی ئەمڕۆ لە بارەی بابەتێکەوە دەیزانین و هەستی پێدەکەین سبەینێ دەگۆڕێت و بە ناڕاست دایدەنێین چونکە ئەو بابەتە بەردەوام لە گۆڕاندایە. ئەو بابەتەی



ئەمڕۆ جوانە سبەینێ ناشرینە یان بۆ کەسێک جوانە بۆ کەسێکی دیکە ناشرینە. لەم ڕووەوە، ناتوانین حوکم بەسەر(ڕاستی) و(ناڕاستی) بابەتەکەدا بدەین. بابەتەکە جوان و ناشرینە یان هەنگوینەکە شیرین و تاڵیشە. بە هەڵەدا ناچین ئەگەر هەنگوین بە تاڵ دابنێین. کەسیش ناتوانێت ئەم زانینەمان بە ناڕاست دابنێت یان بیسەلمێنێت، کە ئێمە ڕاستگۆ نین. هەروەها ئەگەر زانین هەستکردن بێت ئەوا لەو کاتەدا، کە هەست بە بابەتێک ناکریت، زانین لە بارەی بابەتەکەوە دروست نابێت. بە شێوەیەکی گشتی، ئەم بۆچوونە، کە ئەفلاتون بە ڕەخنە دژی زانینی هەستەکی و پرۆتاگۆراسی دادەنێت، دروستە. ئێمەش لەگەڵ ئەفلاتوندا هاوڕاین و پرۆتاگۆراسیش نکۆڵی لێناکات. من تاکو تامی هەنگوین نەکەم ناتوانم زانینم لەبارەی تامی هەنگوینەوە هەبێت. لێرەدا بوونی بابەتەکە(هەنگوین)و ئەزموونی هەستەکی من(تامکردن) مەرجن بۆ سەرهەڵدانی زانینی هەستەکیم سەبارەت تامی ئەو بابەتە. ڕەخنەکەی ئەفلاتون لەسەر ئەم خاڵە نیە؛ ئەو ڕوونیدەکاتەوە، کە ئەگەر زانین هەستکردن بێت و بەبێ هەستکردن زانین نەبێت، لەم حاڵەتەدا لەگەڵ ونبوونی بابەتەکە زانینەکەش لەناودەچێت. من درەختەکە دەبینم و دەزانم چەند گەورەیە و ڕەنگی گەڵاکان و قەدەکەی چۆنە و چ جۆرە میوەیەکیش دەگرێت. ئەم زانینە لە ئاکامی هەستکردنەکەم پەیدابووە. ئەگەر درەختەکە لابچێت یان من درەختەکە جێبهێڵم و نەیبینم ناتوانم

باسیکەم چونکە زانینم لە بارەیەوە نیە. مەبەستی ئەفلاتون لەم نموونەیەدا ئەوەیە، کە بەلاچوونی بابەتی هەستەکی لەبەردەم هەستیارەکەدا هەستکردن نامێنێت و زانین پەیدا نابێت. دەشێ ئەم ڕەخنەیە دروست بێت، بەڵام ئەفلاتون باسی ڕۆڵی بیرەوەری بۆ زانین نەکردوە. بێگومان، بە لاچوونی بابەتی هەستەکی لەبەردەم هەستیاردا هەستکردن بەرانبەر ئەو بابەتە نامێنێت. ئەمەش پەیوەندی بە مەرج بوونی بابەتی هەستەکی بۆ هەستکردن هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەستیار دەتوانێت زانینی پێشوی لەنێو بیرەوەریدا هەڵگرێت و کاتێکی دیکە بەکاری بهێنێت. من دوێنێ تامی هەنگوینم کرد و دۆزیمەوە، کە هەنگوین شیرینە. ئەمڕۆ بەبێ ئەوەی هەنگوین بخۆم و بەو ئەزموونە هەستەکییەدا بچمەوە، پەنا بۆ گەنجینەی بیرۆکە هەڵگیراوەکان لەنێو بیرەوەریمدا دەبەم و دەزانم هەنگوین شیرینە. ئەگەر مرۆڤ بیرەوەری نەبێت و ئەزموونەکانی پێشوی بە ئێستا و داهاتووەوە نەبەستێتەوە، ئەوا هەموو ساتێک بە نەزانینەوە ڕوو لەو بابەتە دەکات، کە چەند جارێک لەپێشتر هەستی پێکردووە و ناسیویەتی.

بەتێکڕا دەتوانین ڕەخنەکانی ئەفلاتون لەسەر دانانی زانین بە هەستکردن، لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە؛

**یەکەم**: هەستکردن تەنیا سەرچاوە و دوا قۆناخی زانین نیە. پرۆتاگۆراس لە دامەزراندنی ڕاڕەوی ڕێژەگەرییدا لەسەر ئەم



جۆرە زانینە دروست بۆ کێشەکە چووە. هەستکردن بە ڕێژە گەرایەتیمان دەگەیەنێت، بەڵام زانینی ڕاست هەستکردن نیە و دەبێت لە سەرچاوەیەکی دیکەوە پەیدا بکرێت.

**دووەم**: بابەتە هەستەکییەکان هەمیشە لە گۆڕاندان و لەنێو پرۆسەی پەیدابوون و لەناوچووندان و بوونێکی کاتییان هەیە. گۆڕان خەسڵەتی بوونی بابەتە هەستەکییەکانە. کەوابوو، ئەگەر بەدوای زانینی ڕاست و نەگۆڕدا بگەڕێین، ئەوا ناتوانین پشت بە بابەتە هەستەکییەکان ببەستین. زانینی نەگۆڕ لەسەر بوونێکی نەگۆڕ دادەمەزرێت.

**سێیەم**: زانینی هەستەکی لەژوور دۆگمای بڕواو سێبەرەکانەوەیە، بەڵام هێشتا ئەم جۆرە زانینەش، لە کەموکورتی بەدەر نیە و لە سیستەمی ئۆنتۆلۆجی ئەفلاتوندا دەستی بە (ڕاستی) ناگات. ڕاستی لە ئاستی زانینی هەستەکییدا نیە و لەو بەرزترە و لەسەر بناخەی زانینێکی هەمەکی و نەگۆڕ ڕادەوەستێت. بابەتە هەستەکی و هەندەکییەکان نابن بە بەردی ئەو بناخەیە.

زانینی هەستەکی بەم کەموکورتیانەوە ناتوانێت ببێت بە بناخەی ئەو زانینە ڕاست و نەگۆڕەی ئەفلاتون پیناسەی دەکات. بە دیدی ئەو، (زانین) ئەوە نیە بۆ هەموو کەسێک ڕاستە و ناڕاستە یان بەردەوام لە گۆڕاندایە و پشتی پێنەبەسترێت. ئەم کەموکورتی و خەسڵەتانەی زانینی هەستەکی، هەرچەندە نەرێن، دەبن بە هاندەریش بۆ سوربوون

لەسەر بڕیی ئەم قۆناخە و خۆگەیاندن بە زانینی نەگۆڕ. ئەفلاتون بۆ دەرچوون لەم قۆناخە و لەنێو ئەم جۆرە زانینەوە هەوڵیداوە سەرەتای قۆناخێکی بەرزتر دیاری بکات. بۆ ئەم مەبەستەش زانینی هەستەکی کردووە بە دوو بەشەوە؛

مەبەستم ئەوەیە، کە بابەتەکانی هەستکردن دوو جۆرن:

هەندێکیان پێویستیان بە بیرکردنەوە نیە و خودی هستکردن حوکم بەسەریاندا دەدات. لە حاڵەتی دووەمدا، ناتوانین پشت بە هەستکردن ببەستین و پێویستە زۆرتر لە بابەتەکان[دوای هەستکردن] بکۆڵینەوە.

تۆ ئاماژە بۆ ئەو بابەتانە دەکەیت دوورن و لەبەر خۆر یان تاریکی وێنەیان کێشراوە.

نا، من ئەو مەبەستەم نیە.

مەبەستت چیە؟

ئەوان پێویستیان بە تێگەیشتن نیە[تەنیا پشت بە هەستکردن دەبەستن] ئەو بابەتانەن دژوەستاویان نیە. دووری و نزیکی بابەتەکەش لە هەستکردنەوە گرنگ نیە. بۆ نموونە، بڕوانە سێ پەنجەی من: پەنجە بچوک و دووەم و پەنجەی ناوەڕاست.

باشە.

تۆ وابزانە زۆر نزیکن و منیش ئەم خاڵە زۆرتر ڕوون دەکەمەوە.

چۆن؟



لە کوێوە تەماشایان بکەیت ئەو پەنجانەش ڕەش و سپی، ئەستور و باریک بن، هەر پەنجەن و ناگۆڕێن؛ پەنجەن و نابن بە شتێکی دیکە. لێرەدا لە خۆمان ناپرسین پەنجە چییە؟ چونکە ئەو بابەتە[پەنجە]بیرکردنەوە ناوروژێنێت، تاکو نەزانێت ئەو شتە چییە و بەدوای واتاکەیدا بگەڕێت.

ڕاستە.

کەوابوو، لێرەدا ئەم هەستکردنە بۆ ناسینی بابەتەکەی پێویستی بە یارمەتی هۆش نیە. (86)

ئەو بابەتە هەستەکییانەی ڕاستەوخۆ واتاکەیان لە هەستکردندا دەردەکەوێت، وەکو پەنجەکانی سوکرات، کە لەم نموونەیەدا باسکراوە، پێویستیان بە لێکدانەوە نیە و واتاکەیان ئاشکرایە.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی لایەنێکی دژوەستاو بەرانبەر ئەو بابەتانە. ئێمە دژە پەنجەمان نیە؛ پەنجە پەنجەیە و نابێت بە شتێکی دیکە. بەڵام لە کاتێکدا حوکمێکی جیاواتر بەسەر پەنجەکەدا دەدەین و دەڵێین پەنجەی سوکرات ئەستورە، ئەم حوکمدان و ڕاستییەش، کە لە حوکمدانەکەدا خۆی دەردەخات داوای بیرکردنەوەمان سەبارەت واتای (ئەستور) لێدەکات. داواکردنەکەش لەسەر ئەو خاڵە ڕادەوەستێت، کە (ئەستوری) چەمکێکی دژوەستاوی، وەک (باریک) هەیە. بۆ ئەوەی لە واتای ئەستور تێبگەین پێویستە لەپێشتر لە

(86) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 236 – 237 .

واتای (باریک) تێگەیشتبین و بزانین چۆنە و جیاوازییەکەشی لەگەڵ (ئەستوری)دا چییە. بەهەمان شێوە، ئەگەر حوکمدانەکەمان گۆڕی یان بەپێچەوانەوە بوو، بڵێین پەنجەی سوکرات باریکە، ئەوا تێگەیشتنمان لە واتای (باریک) لەسەر تێگەیشتنمان لە واتای (ئەستوری) ڕادەوەستێت. لەم جۆرە هەستکردنەدا پەنا بۆ بیرکردنەوە یان (هۆش) دەبەین تاکو لە دەرخستنی لایەنە دژەکان و تێگەیشتن لە واتاکانیان ڕاستییەکە بدۆزینەوە.

ئەمە سەرەتای قۆناخێکی بەرزترە لە زانیندا، کە ژوور قۆناخەکانی دۆگمای بڕوا و هەستکردن دەکەوێت و هێندەش پشت بە بابەتە هەستەکییەکان نابەستێت. هەوڵدەدات لێیان دووربکەوێتەوە و بگاتە ئەو بابەتانەی پلە بە پلە لە فۆرمەکان نزیک دەبنەوە و لە کۆتاییدا مرۆڤ بە فۆرمەکان و لەسەرو هەموویانەوە فۆرمی چاکە دەگەیەنن. هێشتا ئەم بیرکردنەوەیە لەگەڵ سەرهەڵدانی لایەنە دژوەستاوەکاندا پەیوەندی خۆی بە هەستکردنەوە نەپچڕاندووە. بۆ ئەوەی بزانین پەنجەکانی سوکرات ئەستورن یان باریک دەبێت پەنجەکانی ببینین، دوای ئەمە لەگەڵ پەنجەی باریک یان ئەستوردا بەراوردیان بکەین. دەگونجێت بڵێین چەمکەکانی، وەکو ئەستوری یان باریکی هەستەکی نین چونکە ئەستوری، بۆ نموونە، بابەتێکی هەستەکی، وەکو پەنجە نیە تاکو هەستی پێبکریت. هەمان کات نکۆڵی لەوەش ناکرێت، کە ئەستوری بەبێ بابەتێکی ئەستور نادۆزرێتەوە. لەبەر ئەم هۆیەشە



ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە سەرەتای ئەم قۆناخەدا دانراوە و لە هەستکردنەوە نزیکە، بەڵام هەستکردنێکی ڕووت نیە و پەنا بۆ (هۆش) دەبات. لەلایەکەوە هەستەکی و لەلایەکی دیکەوە هۆشەکییە؛ یان هەردووکیانە و بوونێکی تێهەڵکێشراوی هەیە. مەبەستم لە بوونی تێهەڵکێشراو پەیوەندی ئەم چەمکانەیە بە هەستکردن و هۆشەوە.

ئەو پرسیارەی لێرەدا سەرهەڵدەدات سەبارەت پەیوەندی ئەم چەمکانەیە بە هۆشەوە؛ ئایا چۆن بە هۆشەوە بەستراون؟ من لەپێشتر تەنیا ئاماژەم بۆ ئەو خاڵەکرد، کە چەمکی ئەستوری بابەتێکی هەستەکی، وەکو پەنجە نیە. هەروەها، ئێمە دەزانین چەمکەکان خاوەنی فۆرمی خۆیانن و دەرەکین. لەنێو ئەندێشەی ئێمەدا ناژین. لەم ڕووەوە ئەستوری و باریکی یان گەورەیی و بچوکی دەبێت فۆرم بن و لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا هەبن. ئەفلاتون ئەم خاڵەی لە دایەلۆگی (تیمایۆس)دا باسکردووە و لەو باوەڕەدایە ئەم چەمکانە فۆرمن و سەپاندنیشیان بەسەر بابەتە هەستەکییەکاندا دەبێت بە بناخەی (ڕاڤەکردن)ی ئێمە بۆ ئافەریدبوونی جیهان.(87) لەگەڵ سەرهەڵدانی لایەنە دژوەستاوەکاندا لە ئاکامی هەستکردنەکانماندا بەراوردکردن و ڕاڤەکردن خۆی دەسەپێنێت. دەبێت بزانین چۆن پەنجەیەک لەوی دیکە ئەستورتر یان باریکترە و لە واتاکانیشین تێبگەین. لە جۆری یەکەمی هەستکردندا ئەم

(87) Plato, "Timaeus," in *Plato: Complete Works*, 34b-37c, pp. 1238- 40.

پێویستییە سەرهەڵنادات. مەگەر پرسیارمان لە بارەی چییەتی پەنجەوە لێبکرێت یان لە خۆمان بپرسین پەنجە چییە؟ گەیشتن بە قۆناخێکی بەرزتر و تێپەڕکردنی کەموکورتییەکانی زانینی هەستەکی داوای دۆزینەوەی بابەتێکمان لێدەکات، کە خەسڵەتەکانی بابەتی هەستەکی هەڵنەگرێت و زانینیش لەبارەیەوە جیاوازبێت؛ هەروەها گۆڕانکاری تێدا ڕوونەدات. لەم قۆناخەدا دەبێت بابەتێکی نەگۆڕ و چەقوەستاو بدۆزینەوە تاکو بتوانین زانینێکی نەگۆڕیش دابمەزرێنین و لەمەش زۆرتر توشی ناکۆکی نەبین. لە دوو قۆناخەکەی پێشودا ناکۆکییەکان، کە لە ئاکامی سەرهەڵدانی کەموکورتییەکانی بڕوا و هەستکردنەوە سەریانهەڵدا، بوون بە هاندەر بۆ گەڕان بە دوای سەرچاوەیەکی دیکەی زانیندا. گەشتە ئەپستمۆلۆجییەکەی ئەفلاتون لەگەڵ لەناوچوونی ناکۆکییەکاندا کۆتایی پێدێت. ئەمەش بە دۆزینەوەی بابەتێکی نەگۆڕ و هەمەکی دەگاتە ئەنجام، کە هێدی لێی نزیکدەبینەوە. لەگەڵ تێپەرکردنی بابەتە هەستەکییەکان و زانینی هەستەکییدا دەرگای دەستەڵاتی (هۆش) و زانینی هۆشەکی دەکەینەوە. دەستەڵاتی هۆشەکی مرۆڤیش لە سەرەتاوە پەیوەندی بە جۆرێک بەراوردکردن و تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی دیاردە هەستەکییەکانەوە هەیە، کە هەستکردن بە تەنیا و بەبێ یارمەتی هۆش ناتوانێت حوکم بەسەریاندا بدات. بەڵام دەستەڵاتی هۆش لێرەدا ناوەستێت و بە دوای بابەتی بەرزتردا دەگەڕێت؛ بابەتێک لە



کاریگەرێتی گۆڕان و بوونی ئەستوییەوە دوور بێت. ئەم جۆرە بابەتەش فۆرمە ژمێرییارییەکانە. لەگەڵ ئاوەڕدانەوەش لە ژمیریاری کاریگەرێتی فەلسەفەی پیتاگۆرسمان بەسەر بۆچوونەکانی ئەفلاتونەوە بۆ دەردەکەوێت. پیتاگۆراس لە پێش ئەفلاتوندا بایەخی بە ژمێریاری داوە و سیستەمی گەردوونی بە ژمارە و لەبەر ڕۆشنایی ژمێرییارییدا ڕوونکردۆتەوە.(88)

بەڵام تاکو ڕادەیەک مامەڵەکردنی ئەفلاتون لەگەڵ ئەم زانستەدا لە پیتاگۆراسەوە جیاوازە. ئەو نایەوێت، وەکو پیتاگۆراس، بنەڕەتی بوون بۆ ژمارەکان بگەڕێنێتەوە. بەڵکو لەو باوەڕەدایە فۆرمە ژمێرییارییەکان، بەپێچەوانەی بابەتە هەستەکییەکانەوە بوونێکی ئەستوییان نیە، هەندەکی نین و گۆڕانیان بەسەردا نایەت. ژمارە (1) بۆ نموونە فۆرمێکی ڕووتە؛ پەیوەندی بە هیچ بابەتێکی هەستەکییەوە نیە. ئێمە دەتوانین باسی بابەتێکی هەستەکی، وەکو درەختەکە بە ژمارە باسبکەین و بڵێین (یەک درەختە) بەڵام خودی ژمارە یەک درەخت نیە و بەسەر هەموو بابەتە تاکەکانی دیکەشدا دەچەسپێت و واتاکەی ناگۆڕێت. ئەفلاتون پەیڕەوی سیستەمی ژمێریاری کۆن دەکات. بۆ هەموو زانایانی ئەو سەردەمە ژمێریاری کۆن یان ژمێریاری ئەکلیدیس کێشە ژمێرییارییەکان نەگۆڕ و ڕەها بوون. دەستەواژەیەکی ژمێریاری، وەکو دوو لەگەڵ سێ دەکاتە پێنج هەمیشە نەگۆڕ و ڕەها بووە. لە

(88) N.K.C. Guthrie, *A History of Greek Philosophy* , vol.1, pp. 229-31.

هەموو کات و شوێنێکدا هەمان ئاکامی هەبووە و لە تاکیکەوە بۆ تاکێکی دیکەش ناگۆڕێت. لەبەر ئەم خەسڵەتانە، ئەفلاتون بۆ دۆزینەوەی بابەتێکی نەگۆڕ و ژوور زانینی هەستەکییەوە ئەوەندە ماندوو نابووە.(89)

ژمێریاری پەیوەندی بە دوو زانستی دیکەشەوە هەیە؛ ئەندازیاری و ئەستێرەناسی. بە دیدی ئەفلاتون، ئەم دوو زانستەش سەر بە بیرکردنەوە و دەستەڵاتی هۆشەکین و لە جیهانی هەستەکییەوە دوورن. بێگومان بۆ هەندێک بۆچوونەکەی ئەفلاتون سەبارەت بە زانستی ئەندازیاری و بوونی ئەستویی دروستە چونکە فۆرمە ئەندازیارییەکان، وەکو چوارگۆشە یان سێ گۆشە سەر بە هیچ هەبوویەکی هەستەکی نین وخەسڵەتی ژمارەیان هەیە.

بەڵام ئەم تێگەیشتنە لە ئەستێرەناسی توشی ناکۆکیمان دەکات. ئەمەش وابەستە بە سەرچاوەی ئەم جۆرە زانینەوە، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بوون و سوڕانەوەی ئەستێرەکان لە ئاسماندا هەیە. ئەم ڕەخنەیەش لە ڕوانگەی زانینی سەردەمەکەمانەوە دروستە، بەڵام ڕەوا نیە. پێویستە بزانین ئەفلاتون چۆن تەماشای ئاسمانی کردووە و بوونی ئەستێرەکانی باسکردووە، کە لە زانستی سەردەمەکەی خۆی و بۆچوونە ئەفساناوییەکانەوە نزیکە. لەو سەردەمەدا بوون و سوڕانەوەی ئەستێرەکان لەسەر فۆرمێکی هۆشەکی بەرز ڕاڤەکراون،

(89) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال. ل 241



کە بەرپرسە لەو تەنە ئاسماناوییە. زانینی ئەستێرەناسیش تەنیا ناڕوانێتە سوڕانەوە و جێگەی ئەو تەنە ئاسماناوییە، بەڵکو دەیەوێت ئەو فۆرمەش بناسێت، کە ئەو سوڕانەوەیە دەهێنێتە گەر. لەبەر ئەمە، ئەم سێ زانستە بیرکارییانە، بێجگە لە سودی (پراکتیکی) بۆ ژیانی کۆمەڵ بنەمای فێربوونی فەلسەفییانەشن. ئەمەش هانی ئەفلاتونی داوە زانستی ژمێریاری بە پێشمەرجێک بۆ خوێندنی فەلسەفە لە (ئەکادیمیا) دابنێت؛

ئەمڕۆ ئەوانەی خوێندکار فێری فەلسەفە و ئەستێرەناسی دەکەن بە چەواشەیی دەروون پەروەردە دەکەن. ڕووی دەروون بەرەو خوارەوە نەک سەرەوە دەبەن.

چۆن؟

بە بۆچوونی من، چەمکی"خوێندنی باڵا" بەکاردەهێنێت، ئەگەر سەربەرز بکاتەوە و بڕوانێتە نەخش و نیگای بنمیچەکە، لەوانەیە بڵێت، کە ئەو بەچاو تەماشا ناکات بەڵکو دەیەوێت تێبگات.

دەشێ تۆ ڕاست بیت و من گەمژە، بەڵام بۆ من ئەو زانینەی پەیوەندی بە بوون و جیهانی نەبینراوەوە هەیە دەروون بەرەوژوور پەلکێش دەکات. ئەگەر یەکێک هەوڵی ناسینی جیهانی هەستەکی بدات، گرنگ نیە تەماشای سەرەوە یان خوارەوە بکات، لەو باوەڕەدام فێر نابێت چونکە ئەو شتانەی تەماشایان دەکات بابەتی زانست نین. ئەو کەسە لەسەر پشت

ڕاکشابێت، لەسەر کەشتی بێت، دەروونی دەڕوانێتە شتەکانی خوارەوە نەک سەرەوە. (90)

(بابەتی) زانست و زانین، لەم بۆچوونەوە و لەم قۆناخەدا دەبن بە شتێکی بەرز و ژوور جیهانی هەستەکییەوە. ئەمەش تەنیا خەسڵەتی (زانین) نیە. زانین تەنیا ئەوە نیە بابەتەکەی لە جیهانی بەرزدا بێت و پەیوەندی بە هەستکردنەوە نەبێت بەڵکو دەبێت هەمان کات هەمەکی و نەگۆڕیش بێت. ئێمە باسی ئەو خاڵەمان کرد، کە لە قۆناخەکانی زانیندا، گرنگ نیە ئەو زانینە ڕاست یان ناڕاست بێت، بابەتەکە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا دەدۆزرێتەوە. هەر یەکێک لە جۆرەکانی زانین بابەتی خۆی هەیە. ئەمەش ئەفلاتون دەکات بە بیریارێکی ڕیالیست؛ یان باشترە بڵێین ئایدیالیستێکی ڕیالیست.

هەر چەندە ئایدیالیستانە بیردەکاتەوە و بنەڕەتی بوون بۆ ئایدیاکان (بیرەکان) یان فۆرمە بەرزەکان دەگەڕێنێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا لەو باوەڕەدایە بیرەکان دەرەکین و زەمینەی ئۆنتۆلۆجی خۆیان هەیە، وەکو بابەتەکانی نێو خەوبینین و ئەندێشەمان نین. لەم ڕوانگە ڕیالیستەوە، پاش دانانی زانستە ماتماتیکییەکان لەژوور زانینی هەستەکییەوە ئەفلاتون جەخت لەسەر بوونی ئۆنتۆلۆجی فۆرمە ماتماتیکییەکان لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا دەکات. ئەریستۆش هەمان بۆچوونی هەیە. لە پەرتووکی (میتافیزیک)دا ڕوونیدەکاتەوە، کە بە

(90) هەمان سەرچاوە .ل 244.



دابەشکردنی هێڵی دیالیکتیکی زانین و دەستنیشانکردنی قۆناخی زانینی ماتماتیکی لەنێوان هەستکردن و ناسینی فۆرمە بەرزەکاندا، ئەفلاتون بوونی سەربەخۆی فۆرمە ماتماتیکییەکان دیاریدەکات. (91)

ئەگەر ئەم تێگەیشتنەمان دروست بێت، ئەوا ژمارەکان دەبن بە خاوەنی بوونی سەربەخۆی خۆیان و پەیوەندییان بە یەکدییەوە نابێت. ژمارە چوار لە ئاکامی لێکدانی دووجار دوو یان کۆکردنەوەی سێ و یەک نایەتە کایەوە و بوونی سەربەخۆ و جیاوازی هەیە. بوونە سەربەخۆکەشی لە شێوازی (فۆرم)دا دەبێتە بابەتی زانین. لەژوور زانینی ماتماتیکییەوە و لە جیهانی بەرزدا فۆرمە هەمەکییەکان هەن. ناسینی ئەم فۆرمانە بەرزترین قۆناخە لە جوڵانە ژوورکێشییەکەی دەرووندا. زانینی تەواو لەگەڵ ناسینی ئەم فۆرمانەدا پەیدا دەبێت. دەتوانین ئاماژە بۆ لایەنی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤی بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەکەی ئەفلاتون بکەین. لە ئاستی دۆگمای بڕوا و هەستکردندا ڕەتدانەوە و لایەنێکی نێگەتیڤانەیە. لەگەڵ گەیشتن بە فۆرمە ماتماتیکییەکان و فۆرمە بەرزەکانیشدا هەڵوێستی نێگەتیڤانە دەگۆڕێ و دەبێت بە پۆزەتیڤ. لەم ڕووەوە لەسەر هێڵە ژوورکێشییە ئەپستمۆلۆجییەکە، کە بە دیالێکتیک ناوزەد دەکرێت دوو بەش دیاریدەکەین: نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ. هەر یەکێک لەم بەشانە دەبێت بە دوو بەشی وردترەوە؛ لە خوارەوە یان لە بەشە نزمەکەدا، بڕوا و

(91) ئەریستۆ، میتافیزیک، بەشی ئەلفا، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2008، ل 32.

هەستکردن و لە بەشی سەرەوە زانینی ماتماتیکی و زانینی تەواو ڕیزدەکەین. هەریەکێکیش لەم بەشانە پەیوەندی بە بابەتی خۆیانەوە هەیە. زانین لە بارەی سێبەرەکانەوە، کە دەبێت بە بڕوا یان بۆچوون هەروەها زانینی هەستەکی بە زانین دانانرێن. زانین لەگەڵ فۆرمە ماتماتیکییەکاندا دەست پێدەکات و بە ناسینی فۆرمە بەرزەکان کۆتایی دێت. ئەگەر لە کەسێک بپرسین؛ جوانی چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا باسی شتێکی جوانمان بۆ بکات یان پەنجە بۆ شتێکی جوان درێژ بکات، بە دیدی ئەفلاتون ئەو کەسە نەزانە و جوانی نەناسیوە. شتێکی جوان جوانی تێدایە، بەڵام (خودی جوانی) نیە. لە لایەکی دیکەوە، شتە جوانەکە دەگۆڕێت. ئەمڕۆ جوانە و سبەینێ ناشرین یان لە چاوی ئەو کەسەدا جوان و لە چاوی کەسێکی دیکەدا ناشرینە. حوکمدانی کەسەکەش بەسەر جوانی ئەو شتەدا (زانین) نیە و تەنیا بۆچوونی ئەوە. بە بۆچوونی ئەو یان بڕوای ئەو شتەکە جوانە. (زانین) لەسەر بڕوای تاکە کەسێک و خەسڵەتی بابەتێکی هەستەکی گۆڕینۆک دانامەزرێت. ئایا کێ دەتوانێت لەنێو جوڵانە ژوورکێشە دیالێکتیکەکەدا خۆی بە فۆرمە بەرزەکان بگەیەنێت؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەڕێمەوە بۆ مێتافۆری ئەشکەوتەکە و باسی ئەو مرۆڤە دەکەم لە دۆگمای ئەشکەوتەکە یاخی دەبێت و خۆی ڕزگار دەکات و لە ئەشکەوتەکە دەچێتە دەرەوە. خۆ ڕزگارکردنی ئەم مرۆڤە جوڵانە ژوورکێشیە دیالێکتیکییەکەیە. فۆرمە بەرزەکانیش لە دەرەوەی



ئەشکەوتەکەدان، لەبەر ئەمە گەیشتنی ئەم مرۆڤە بە فۆرمە بەرزەکان لە ئاکامی پرۆسەی خۆ ڕزگارکردنەکەدا کارێکی حەتمییە. هەر کەسێک خۆی لە دۆگمای ئەشکەوت ڕزگار بکات و بەو (ڕاستی)یە بگات، کە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەدایە، کەسێکە خاوەنی (زانین)و ڕاستی ناسە. ئەوەی خاوەنی زانین و ڕاستی ناس بێت (فەیلەسوفە). کەوابوو، (زانین) لای مرۆڤێکی ئازاد و فەیلەسوف پەیدادەبێت نەک لای کۆیلەیەکی نێو دۆگمای ئەشکەوت. فەیلەسوف فۆرمە بەرزەکان دەدۆزێتەوە و دەزانێت دادوەری، چاکە، جوانی، ئازایەتی، بەختەوەری...هتد چین. ئەو لە پێناسەکردنی جوانیدا ئاماژە بۆ فۆرمی جوانی نەک شتێکی هەستەکی جوان دەکات، کە نەگۆڕ و هەمەکییە.

# بەشی پێنجەم

## بوونی مرۆڤ: دەروون و لەش

ئاوڕدانەوەیەک لە بیریارانی پێش سەردەمی ئەفلاتون ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات، کە ئەفلاتون یەکەم بیریار نیە باسی (دەروون)ی کردبێت. (92) هەندێک لەو بیریارانە دەروونیان بە توخمێکی ئەستویی، وەکو ئاو، هەوا، یان ئاگر داناوە. لە سەرو هەموویانەوە پیتاگۆراس و شوێنکەوتوانی فێرگەکەی بە ئاشکرا باسی دەروونیان کردووە و هەوڵیانداوە بوونی بە ئەستو یان توخمە ئەستوییەکانەوە نەبەستنەوە. لە هەمان کاتدا، پیتاگۆراس باوەڕی بە (لاشە گۆڕین) هەبووە. گوایە، دەروونی مرۆڤ، کە لە سەرچاوەیەکی پیرۆزەوە دەرچووە و بە تێکەڵبوونی لەگەڵ ئەستودا توشی گەندەڵی بووە. بۆ ئەوەی بە پاکیش بۆ سەرچاوەکەی بگەڕێتەوە دەبێت چەند جارێک لە دایک ببێتەوە و هەرجارە بەگوێرەی کردەوەکانی لە ژیانییدا لاشەی جیاواز وەرگرێت.

(92) من چەمکی (دەروون)م بەرانبەر (سایکی)لە زمانی یۆنانییدا داناوە. بێجگە لە دەروون چەمکی دیکەش بۆ (سایکی)، وەکو هۆش یان گیان بەکارهێنراون. بە بۆچوونی من، لەبەر ئەوەی (هۆش) لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا بەشێکە لە دەروون و گیانیش لەنێو ئایینەکاندا بە زۆری بەکاردێت، چەمکی (دەروون) زۆرتر لە واتاکەی ئەفلاتونەوە بۆ ئەم جۆرە بوونە نزیکە. لە دایەلۆگی (تیمایۆس)دا دەڵێت، ئەو شتەی خاوەنی هۆش بێت دەروونە. لەم ڕووەوە، هۆش بەشێکە لە دەروون، نەک خودی دەروون. بڕوانە:

Plato, “Timaeus”, in *Plato: Complete Works*, 46d 5-7.



بێگومان، ئەم ڕاڕەوە ئایینییە لەنێو هیندۆسییەکاندا لە کۆنەوە باو بووە و تاکو ئەمڕۆش ماوەتەوە و یەکێکە لە کۆڵەکەکانی بیروباوەڕی هیندۆسییەکان و بودییەکان. تەنانەت هەندێک دەستە و تاقمی ئیسلامیش پەیڕوییان کردوە.

ئەریستۆش لە پەرتووکەکەیدا لەسەر دەروون پەیوەندی پیتاگۆراسی بە ڕاڕەوی لاشەگۆڕینەوە باسکردووە. (93) دیۆجنیسیش لەسەر زاری زینافۆن دیگێڕێتەوە؛ ڕۆژێک پیتاگۆراس پیاوێک دەبینێت لە سەگەکەی دەدات. پیتاگۆراس داوا لە پیاوەکە دەکات لەوە زۆرتر لە سەگەکە نەدات چونکە ئەو دەروونەی لەنێو لەشی سەگەکەدایە هاوڕێیەکی پیتاگۆراسە و پیتاگۆراس دەیناسێتەوە. (94) وەرگرتنی لەشێکی نوێ لەگەڵ مردنی کەسێکدا دەکەوێتە سەر چۆنیەتی ژیانی ئەو کەسە و کردەوەکانی. مەرج نیە ئەو کەسە لە لەشی مرۆڤێکدا جارێکی دیکە بۆ سەر ئەم ئەستێرەیە بگەڕێتەوە. دەشێ لەشی ئاژەڵێک وەرگرێت. لەم نموونەیەی سەرەوەدا، کە دیۆجنس باسیدەکات، هاوڕێکەی پیتاگۆراس لەشی سەگی وەرگرتوە. ئەگەر کەسێک نەتوانێت دەروونی پاک بکاتەوە ئەوا جارێکی دیکەش لە لەشی زیندەوەرێکی دیکەدا، کە لەوانەیە لە پلەی بوونی سەگ نزمتریش بێت بۆ (ئێرە) دەگەڕێتەوە. لەم ڕووەوە، دەبینین پیتاگۆراس

(93) بڕوانە: Aristotle, “De Anima,” in *The Complete Works of Aristotle*, 407b 20, pp. 649-50.

(94) Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, 8, 27-29, p. 345

و ئەوانەی باوەڕیان بە لاشەگۆڕین هەیە، تێگەیشتنی جیاوازیان بۆ مردن هەیە. بۆ ئەوان، مردن تراجیدیا نیە چونکە کۆتایی بە بوونی ئەو کەسە ناهێنێت. ژیان لە فۆرمێکی دیکە و دەروونیش لەنێو لەشێکی دیکەدا بەردەوام دەمێنێتەوە. گەڕانەوە بۆ سەرچاوە پیرۆزەکەش نەگەڕانەوەیە بۆ (سەر ئەم ئەستێرەیە) و دیسانەوە بەردەوامی بوونی تاکە کەسەکەیە لەنێو سەرچاوە پیرۆزەکەدا. ئەم تێگەیشتنە لە بوونی دەروون و توانەوەی لەنێو سەرچاوەکەدا لە بۆچوونی ئەو سۆفییانەوە نزیکە، کە بانگەشەی گەڕانەوە بۆ خوا و یەکگرتن لەگەڵ خوادا دەکەن. هەموو سۆفییە موسوڵمانەکان باوەڕیان بە گەڕانەوە لە ڕێگەی پاککردنەوەی دەروونەوە هەیە، بەڵام جیاوازی نێوانیان لەسەر چۆنیەتی پێکەوە ژیان لەگەڵ خوادا دروست دەبێت. هەندێکیان، وەکو بیستامی و حەلاج و ڕۆمی و زۆری تریش دەیانەوێت لەگەڵ خوادا یەک بگرن و لەنێویا بتوێنەوە. ئەم قۆناخەش (فناء في الله) بە دوا قۆناخی گەشتە ڕوحانییەکە دادەنێن. چەند سۆفییەکی دیکەش، وەکو ئیمام غەزالی و شێخ ئەحمەدی سەرهەندی، کە توانەوە لە بوونی خوادا ڕەتدەدەنەوە و بە نزیک بوونەوە لە خوا ڕازی دەبن. بەڵام مەبەستی هەموو ئەم سۆفییە موسوڵمانانە لەگەڵ مەبەستی پیتاگۆراسدا هاوتەراز ڕادەوەستێت و پەیوەندی بە گەڕانەوەی دەروونە تاکەکان بۆسەرچاوە هەیە. ئێمە دڵنیاین لەوەی ئەفلاتون ئاگای لە بۆچوونەکانی پیتاگۆراس بووە و لەگەڵ چەند



بیریارێکی فێرگەی پیتاگۆراسیشدا هاوڕێ بووە. پەیوەندی نێوان ئەفلاتون و ئەم بیریارانەمان لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا باسکردووە. بێجگە لە پیتاگۆراس، سوکراتیش یەکێکە لەو بیریارانەی باوەڕی بە بوونی دەروون هەبووە و ڕاستەوخۆش کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی ئەفلاتون. لە دایەلۆگی (ئەپۆلۆجی) سوکرات ڕوو لە تاوانبارکەرەکانی دەکات و دەڵێت:

> من دەمەوێت گەورە و بچوکتان بهێنمە سەر ئەو باوەڕەی
> بایەخ بە لەش و سامانتان نەدەن و بیر لە
> چاکی دەروونتان بکەنەوە.
> سامان شکۆدارتان ناکات، بەڵکو شکۆداری سامان و
> هەموو شتێکی دیکە بۆ تاکەکان و کۆمەڵ چاک دەکات.(95)

ئەو خاڵەی دەمەوێت بیسەلمێنم ئەوەیە، کە بیرکردنەوە لە بوونی مرۆڤ دووەلیستانە و ئاماژەکردن بۆ لایەنێکی ئەم بوونە، وەکو شتێکی لە ئەستو بەدەر بۆ ئەفلاتون نوێ نیە. ئەوەی ئەفلاتونیش باوەڕی پێدەکات لە بۆچوونی پیتاگۆراس و سوکراتەوە جیاواز نیە، بەڵام بەپێچەوانەی پیتاگۆراس و سوکراتەوە دەیەوێت ئەم باوەڕە لەسەر زەمینەیەکی فەلسەفی دامەزرێنێت و بە بەڵگەوە باسی دەروون بکات و خەسڵەتەکانی دەربخات. لێرەدا، ئەفلاتون بە یەکەم بیریار دادەنرێت، که لەم بوارەدا فەلسەفییانە نەک لەسەر بنەمای بڕوای

(95) Plato, “Apology”, in *Plato: Complete Works*, 30b, p. 28.

ئایینی لە بوونی دەروون دەدوێت. لەبەر ڕۆشنایی هەڵوێستی دووەلیستانە و باوەڕکردن بە دوو لایەنی جیاواز لە بوونی مرۆڤدا مرۆڤ بە (لەش) دانانرێت بەڵکو لەشی هەیە. کاتێک دەڵێم (من لەشم) جیاوازییەکانی نێوان دەروون و لەش ڕەتدەدەمەوە و هەردووکییان بە یەک جۆر ڕاستەقینە دادەنێم. دەروون بە هەموو خەسڵەتەکانییەوە دەبێت بە دیاردەی لەش و لەگەڵ تێکشکانی لەشدا لەناودەچێت. هیچ بوارێک بۆ باوەڕ بە مانەوەی دەروون پاش مردن نامێنیت. ژیانی مرۆڤ و بەردەوامی ئەو ژیانە بە لەشەوە گرێدەدرێت.

دەستەواژەی (من لەشم هەیە) ڕەتدانەوەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەیە بەرانبەر بوونی مرۆڤ. جەختکردنە لەسەر دوو لایەنی جیاواز لەم بوونەدا و دامەزراندنی پەیوەندییەکی ناپێویستە لە نێوان دەروون و لەشدا. مەبەست لە پەیوەندی ناپێویست گرێنەدانی بوونی ئەم دوو لایەنەیە بە یەکدییەوە. لە پەیوەندی پێویستدا، وەکو پەیوەندی نێوان هۆ و هۆکردەکەی، ئەم دوو لایەنە بە بێ یەکدی نابن. ئەگەر ئاگر هەبێت گەرماییش دەبێت. ئێمە ئاگر بە بێ گەرمایی نادۆزینەوە. پەیوەندی نێوان ئاگر (هۆ) و گەرمایی (هۆکرد) پێویستە.

دەستەواژەی (من لەشم هەیە) ئەو واتایە دەبەخشێت، کە من (لەش) نیم، بەڵکو لەشم هەیە یان خاوەنی لەشم. خاوەنێتی پەیوەندییەکی ناپێویستە لە نێوان خاوەن و بابەتەکەدا. ئێمە دەڵێین ئەو مرۆڤە خاوەنی زەوییە یان زەویدارە، بەڵام ئەو زەوییەکە نیە و بە بێ



زەوییەکەش بوونی تێک ناشکێت. ئەم ڕوونکردنەوەیە بەو خاڵەمان دەگەیەنێت، کە ئەفلاتون لە تێگەیشتنەکەیدا بۆ دەروون مرۆڤ بە لەش دانانێت و بە هەبوویەکی جیاوازتری دەبینێت. کەوابوو، مرۆڤ هەموو کاتێک پێویستی بە لەش نیە. ئەو لەشی، وەکو ئامێرێک یان پارچە زەوییەکە بەکاردەهێنێت. دەتوانێت لەناویا بمێنێتەوە و هەمان کات لێوەی دەرچێت چونکە مرۆڤ دەروونە و لەنێو لەشدا دانراوە. لەش دەرەکی و دەروون لایەنی ناوەکی مرۆڤە.(96)

بە بۆچوونی من، تاکو ئەم ڕادەیە و دانانی دەروونیش بە لایەنێکی نەمری بوونی مرۆڤ لەگەڵ باوەڕی نێو ئەفسانە و ئایینە کۆنەکانی یۆنان جیاواز نیە. لە ئەفسانەی یۆنانیشدا باسی نەمری و مانەوەی دەروون کراوە.

ئەرکی ئەفلاتون دووبارە کردنەوەی ئەم باوەڕە نیە، بەڵکو دامەزراندنێتی لەسەر زەمینەیەکی فەلسەفی، کە لە زەمینەی ئەفسانە و ئایینەوە جیاوازە. ئەفسانە و ئایین پەنا بۆ سەلماندن و بەڵگەهێنانەوە بۆ دۆگماکانیان نابەن. ئەگەر ئەفسانە و ئایین بە بەڵگەوە دۆگماکانیان بسەلمێنن دەبن بە توێژینەوەی فەلسەفییانە و لەم حاڵەتەدا بیردەکەنەوە پرسیار دروستدەکات؛ گومان و سەرسوڕمان تیایدا سەرهەڵدەدات و بەردەوام بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت. بنەماکانی پێشوی خۆی دەخاتە بەر نەشتەری ڕەخنەکاری

(96) Plato, “Phaedrus”, 269b, and in *Plato:Complete Works*,
هەروەها بڕوانە دایەلۆگی: “Timaens”, 46d,

و هەڵسەنگاندن. ئەمەش کۆتایی بە ئەفسانە و ئایین دەهێنێت. بیرکردنەوە و پرسیارکردن و ڕەخنەکاری ئەفسانە و ئایین لە ناودەبەن. هەمان کات، بۆ فەلسەفە هێزی داهێنان و گەڕانی بەردەوام بە دوای ڕاستییدا پێویستە. ئەفلاتون، وەکو فەیلەسوفێک دەیەوێت لە بوونی مرۆڤ بکۆڵێتەوە و بۆچوونەکەی لەسەر زەمینەیەکی فەلسەفی دامەزرێنێت. دەشێ ئێمە لەگەڵ هەوڵدانە فەلسەفییەکەیدا کۆک نەبین و بۆچوونەکەشی پەسەند نەکەین، بەڵام نابێت چاومان لە ئاستی ئەو ڕاستییەدا بگرین، کە ئەفلاتون هەوڵیداوە لۆجیکمەندانە بیریکاتەوە و کوێرانەش شوێن دۆگمای نێو ئەفسانە و ئایین نەکەوێت. با بزانین ئەم بیریارە چۆن هەوڵیداوە لە ڕوانگەی فەلسەفەوە بڕوانێتە بوونی مرۆڤ و بەرگری لە هەڵوێستە دووەلیستییەکەی بکات.

ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە بوونی مرۆڤ لە دەروون و لەش پێکهاتوە. دەرونیش نەک تەنیا لایەنێکی جیاوازە و خەسڵەتەکانی لەشی هەڵنەگرتووە، لەگەڵ ئەم جیاوازییەشدا لە لەش لەپێشتر و بەرزترە. ئەم تێگەیشتنە پەیوەندی بە سیستەمی مێتافیزیکی ئەفلاتون و بیردۆزەی جیهانی بەرزی فۆرمە هەمەکییەکانەوە هەیە.

هەروەها ئێمە دەتوانین پەیوەندییەکەی بە بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەکەی ئەفلاتونیشەوە ببەستینەوە، کە زانینی بە بیرکەوتنەوە داناوە. گوایە مرۆڤ پێش هاتنی یان فڕێدانی بۆ نێو جیهانی هەستەکی لە جیهانی بەرزدا، وەکو فۆرمێکی هەمەکی لە



ئەستو بەدەر ژیاوە. پەیدابوونی لەم جیهانەدا و بوون بە خاوەنی (لەش) ڕوودواوە. ڕوودانیش لەنێو کات و شوێندا دێتەکایەوە. سەرهەڵدانی مرۆڤ لەنێو ئەم جیهانەدا بە لەشەوە ڕووداوێکی کاتییە، بەڵام بوونی مرۆڤ، وەکو فۆرمێکی هەمەکی یان دەروون هەمیشەیی و نەمرە.

بێگومان، ئەفلاتون وردتر لە کێشەی نەمری دەروون دەدوێت، کە لە دواییدا ڕوونیدەکەمەوە. مەبەستی من لێرەدا ئەوەندەیە، کە خوێنەر تێبگات بیرۆکەی (نەمری) دەروون پەیوەندی بە سیستەمی مێتافیزیکی و فۆرمە بەرزەکانەوە هەیە.

بۆچوونەکەی ئەفلاتونیش ئەوە دەگەیەنێت، کە دەروونی مرۆڤ، وەکو فۆرمی بەرز، لە جیهانی بەرزدا خاوەنی زانین بووە. ڕوودانی لەش وەرگرتن و لە دایکبوونی ئەو زانینە لەنێو مێشکدا ناسڕێتەوە و دەمێنێتەوە، بەڵام بیرچۆتەوە. مرۆڤ بەردەوام لەگەڵ ڕووبەڕوو بوونەوەی لە شتەکان و ناسینیان زانینەکەی پێشوی لە بارەیانەوە بیردەکەوێتەوە و هیچ کاتێک یەکەم جاری نیە شتێکی تازە ببینێ و بیناسێت. ئەمە واتای (لەپێشتر) لە بوونی دەرووندا ڕووندەکاتەوە. خەسڵەتی بەرزێتی دەروونیش لە لایەکەوە پەیوەندی بە بوونی فۆرمە بەرزکانەوە و لە لاکەی دیکەوە بە کاریگەرێتی دەروون بەسەر لەشەوە هەیە. مەبەستیش ئەوە نیە، کە لەش کار ناکاتە سەر دەروون.

لە دایەلۆگی (تیمایۆس)دا چۆنیەتی پەروەردەکردنی لەش بە خراپی و کارتێکردنی بۆ سەر بارودۆخی دەروون باسکراوە.(97) هەروەها، یەم کاریگەرێتییە لە دایەلۆگی (یاساکان) و(فیدرۆس)یشدا ئاماژەی بۆ کراوە.(98)

کاریگەرێتییەکە لە هەردوو سەرەوە درەستە. دەروون و لەش کاردەکەنە سەر یەکدی.

ئازاری لەش مرۆڤ توشی ئەشکەنجەی دەروونییش دەکات. بەڵام، بەگوێرەی لێکدانەوەکەی ئەفلاتون مادامەکی دەروون لەپێشتر و بەرزترە کاریگەرێتی دەروون بەسەر لەشەوە زۆرترە.

لەش بە بێ دەروون ناتوانێت کارەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت و ناتوانیت بجوڵێت. لەشێکی لە دەروون بەدەر، وەکو لاشەیەکی مردوو یان مێزەکەی بەردەمم تەواناى جوڵانی نیە و پێویستی بە هۆیەکی دەرەکی بێجگە لە بوونی خۆیەتی. کاریگەرێتی نێوان دەروون و لەش لە هەردوو سەرەوە نایەکسانیش دەردەکەوێت.

سەنگی کارتێکردنەکە زۆرتر بە لای دەرووندا دادەشکێت و گران دەبێت. حەزدەکەم ئەو خاڵەش ڕوونبکەمەوە، کە بۆچوونە دووەلیستییەکەی ئەفلاتون لە سەردەمی تازەگەریدا کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی دێکارت. ئەم بیریارەش لە بوونی مرۆڤدا دوو جەوهەری

Plato, “Timaeus”, in *Plato: Complete Works*, 86b, p.1285. (97)

Plato, “Laws”, 775b, p. 1448. (98)

“Phaedrus”, in *Plato: Complete Works*, 247c, p. 524.



جیاوازی دەستنیشان کردووە و پەیوەندی کاریگەرێتی لە نێوانیاندا هەڵبەستوە.(99) لە پەیوەندییەکەدا وا دەردەکەوێت دەروون هۆ بێت بۆ جوڵانی لەش؛چونکە باسی ئەوەمان کرد، کە لاشەیەکی لە دەروون بەدەر تەواناى جوڵانی نیە. بەڵام ئەم هۆیە لەبەر گیرخواردوو بوونی لەنێو لەشدا لە دەرەوەی لەشەوە کاریگەرێتییەکەی ناخاتە گەر هەرچەندە بوونێکی جیاواز و سەربەخۆی هەیە، هێشتا لەناوەوە نەک لە دەرەوە کاردەکاتە سەر لەش. لەبەر ئەمەشە وەکو هۆیەکی ناوەکی دەبینرێت. گیرخواردوبوونەکە ئەوە ناگەیەنێت دەروون بە بێ لەش نەتوانێت هەبێت یان وزەیەکی جەستەیی بێت و بە هیچ جۆرێک لە لەش جیانەبێتەوە. بوونی دەروون لەنێو لەشدا، بۆ ئەفلاتون، ڕووداوێکی تاڵ و نالەبارە و دابەزینە لە بەرزێتیەوە بۆ نزمی؛ لە بوونی هەمەکی و لە ئەستو بەدەرەوە بۆ بوونێکی هەندەکی و بەستراو بە ئەستووەوە. ئێمە لەنێو ئەم جیهانەدا چەند هەوڵبدەین دەروون لەو پەیوەندییە دووربخەینەوە یان ژیانێکی چاکمان هەبێت، ئەوەندەی ئەو بوونە و ژیانە بەرزو پاکە نیە، کە بە فۆرمە هەمەکییەکان دادەنرێت. بەختەوەری مرۆڤ لەوەدا نیە خۆی بە خاوەنی دەروونێکی پاک و لەشێکی ساخ دابنێت، لە گەڕانەوەی بۆ سەرچاوەکەی و گۆڕانە بنەڕەتییەکەیدایە لە گەشتە ژوورکێشییەکەیدا.

René Descartes, “Meditations on First Philosophy”, in *The Philosophical Writings of Descartes*, vol. 2, translated by John Cottingham, Robert Stoothff and Dugald Murdoch, Cambridge: Cambridge University Press, 1999. Pp. 58-9. (99)

ئەم گەشتە بە نەمانی دەروونی تاک و هەندەکی کۆتایی دێت و بە یەکگرتنی لەگەڵ فۆرمە هەمەکییەکەدا بوونێکی هەمیشەیی و پڕ و تەواو بە خۆی دەبەخشێت.(100) مادامەکی دەروون لە سەرچاوەیەکی بەرزەوە هەڵقوڵاوە و بوونێکی جیاوازی لە (ئەستو)ەوە هەیە، ئەو پرسیارەی بەرەوڕوومان دەبێتەوە و لە پێش وەختا بە بێ ئەوەی مامەڵە لەگەڵ ڕەوشتدا بکەین، سەبارەت بوونی خراپە سەرهەڵدەدات. ئایا دەروون چۆن خراپ دەبێت؟ لەبەر ڕۆشنایی سیستەمە مێتافیزیکییەکەی ئەفلاتوندا، دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە دژوار نیە. بە بێ ئەوەی ئەفلاتون وەڵامەکەمان بداتەوە بەو ئاکامە دەگەین، کەپەلکێشکردنی دەروون لەلایەن هێزە گەندەڵەکانەوە بەرەو خۆشی و چێژوەرگرتنی نێو جیهانی هەستەکی ئاسانە. لەبەر ئەمە، (خراپە) خەسڵەتێکی ئۆنتۆلۆجی دەروون نیە و ڕووداوە.

(100) ئەم خاڵە، پەیوەندی بە توانەوەی بوونە هەندەکییەکان یان دەروونە تاکەکان لەنێو فۆرمە هەمەکییەکەی مرۆڤدا هەیە. بە دیدی من، سەرچاوەی بۆچوونی ئەو سۆفییانەیە، کە لە گەشتە ڕۆحانییەکەیاندا دەیانەوێ لەنێو بوونی خوادا بتوێنەوە یان لەگەڵ (العقل الفعال)دا یەک بگرن. یەکگرتنی سۆفی لەگەڵ خوادا، وەکو لە فەلسەفەی ئەفلاتونیشدا لە گەشتە ژوورکێشیەکەدا دەردەکەوێت، بە خوا بوونی سۆفی نیە، بەڵکو توانەوەی سۆفییە لە بوونی خوادا. سۆفی بە گەیشتن بە دوا قۆناخی بوونی، خوا ناخاتە سەر بوونی خۆی، بەڵکو بوونی خۆی دەخاتە سەر بوونی خوا. من لە نوسراوێکمدا ئەم پەیوەندییەی نێوان دەروونی هەندەکی و خۆام بە درێژی باسکردووە. بڕوانە:

Muhammad Kamal, "The Self and the Other in Sufi Thonght", published in the *Journal of Religion East and West*, No.6, October, Berkeley, California, 2006. Pp. 29-31.



دەروون لە بنەڕەتەوە خراپ نیە و بە خراپی پەیدانابێت. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (یاساکان)دا جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردووە و دەڵێت؛

بێجگە لەمە، نابێت لە کاتێکدا لەشی پیاو لە بارودۆخێکی نالەبار و مەستیدایە منداڵ دروست بکرێت. پێویستە منداڵ بەرێک وپێکی دروست بکرێت و پلانی بۆ دابنرێت. گەورە بوونیشی[لەنێو منداڵداندا]نەشێوێت. پیاوی سەرخۆش شپرزەیە و بە لادا دەکەوێت و خۆی لە شتەکان دەدات. هەڵچونی سۆز و توڕەبوونی لەش و دەروونی داگیردەکەن؛ وەکو کەسێک کە تۆو دەچێنێت نارێک و ناتەواوە و منداڵی نارێکیشی دەبێت، کە جێگەی باوەڕپێکردن نین و خراپ دەردەچن تەنانەت بە لەشیش کەموکورت دەبن.(101)

هەروەها لە دایەلۆگی (تیمایۆس) دا دەڵێت؛

هیچ کەسێک لە بنەڕەتەوە خراپ نیە؛ کەسێک خراپ دەبێت چونکە خویەکی خراپ لە ڕێگەی لەشەوە وەردەگرێت یان پەروەردەکردنەکەی خراپە. ئەمانە ئەو خراپانەن چاوەڕوان ناکرێن و مرۆڤ هەڵیان نابژێرێت.(102)

مەبەستی ئەم دەقانە خراپ بوونی دەروونە نەک خراپی دەروون. دەروون سەرچاوەیەکی پاک و چاکی هەیە. خراپ بوونی، وەکو ڕووداو

(101) Plato, "Laws", in *Plato:Complete Works,* Book vi,775b, pp.1448-49.

(102) Plato, "Timaens", in *Plato:Complete Works*, 86e, p.1286.

پەیوەندی بە هاوڕێبوونی بە لەش و کاریگەرێتی لەش بەسەر دەروونەوە و پەروەردەکردنی دەروونەوە هەیە. ئەم بۆچوونەش بووە بە هاندەریک بۆ ئەفلاتون، تاکو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی دادوەردا بە جیدی ئاوەڕ لە فێرکردن و پەروەردەکردنی هاووڵاتیان بداتەوە و بەرنامەیەکی فەلسەفی بۆ دابمەزرێنێت. ئامانجی فێربوون و پەروەردەش دەبێت بەپێشخستن و چاک ڕاگرتنی دەروون و پاراستنی لە گەندەڵی. ئەگەر بەرنامەیەکی فێربوون و پەروەردە نەتوانێت هاووڵاتی چاک دروست بکات، ئەوا دەبێت هەوڵی گۆڕینی بدرێت.

جارێکی دیکە دێمەوە سەر پەیوەندی هۆکاری نێوان دەروون و لەش. بێگومان، دەزانین هیچ کام لەم دوو لایەنەی بوونی مرۆڤ نابن بە هۆ و بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ یەکدی. دەروون و لەش بنەڕەتی جیاوازیان هەیە و تەنیا پاش گرێدانیان کاردەکەنە سەر یەکدی. باسی ئەو خاڵەشمان کرد، کە دەروون هۆیە بۆ جوڵانی لەش. بەڵگەش بۆ ئەم خاڵە و سەلماندنی لەوێدا بوو، کە گوتمان لاشەیەکی لە دەروون بەدەر تەوانای جوڵانی نیە. ئەی چ هۆیەک دەروون دەجوڵێنێت؟ بۆ ئەفلاتون دەروون پێویستی بە هێزێکی دەرەکی بۆ جوڵان نیە و خۆی دەجوڵێت؛ خاوەنی هێزێکی ناوەکییە، کە دەبێتە سەرچاوەی جوڵانی و تەوانای دەروونیش بۆ جوڵانی لەش؛

**هاووڵاتی ئەسینا:** باشە، چۆن پێناسەی ئەو شتە دەکەیت، کە بە (دەروون) ناوزەدمان کرد؟ ئێمە دەتوانین فۆرمەکەی پێشو،



کە گوتمان، جوڵان دەتوانێت خۆی بجوڵێنێت، بەکاربهێنین.

**کلینیاس:** ئایا مەبەستی تۆ ئەوەیە، کە ئەو شتەی بە دەروونمان دانا هەمان شتە، کە پێناسەی (خۆ جوڵێن)مان بۆ کرد؟

**هاووڵاتی ئەسینا:**بەڵێ. ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت ئێمە ڕازی دەبین؟ ئایا ئەوەشمان نەسەلماند، کە دەروون سەرچاوەی گۆڕان و جوڵانی شتە پێکهاتووەکانی ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو، هەروەها دژەکانیشیانە؟ ئیمە ڕوونمانکردەوە، کە هۆی گۆڕان و جوڵانە.(103)

دەروون هۆی جوڵانی لەشە نەک بوونی لەش. هەروەها جوڵانی دەروون سەربەخودی دەروونە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (فیدۆرس)یشدا باسی کێشەی جوڵان و دەروون دەکات و بۆ سەلماندنی نەمری دەروون بە بەڵگەیەکی دادەنێت، کە لە دواییدا باسیدەکەم. بە دڵنیاییەوە، لەش کاردەکاتە سەر دەروون بەڵام ناتوانێت دەروون بجوڵێنێت. جوڵانی دەروون لەژێر کاریگەرێتی لەشدا دەبێت لە خودی دەروونەوە بکەوێتەگەر. ئەگەر دەروون ئارەزووی جوڵان نەکات کارتێکردنەکە پوچەڵ دەبێتەوە و دەوری نامێنێت. جوڵانی دەروونیش لەژێر کاریگەرێتییەکەی لەشدا دەکەوێتە سەر ڕووبەڕووبوونەوەی یەکێک لە بەشەکانی دەروون. ئاشکراکردنی ڕووبەڕووبوونەوەکەش، لەبەر ڕۆشنایی بەشەکانی دەروون لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە و لە

(103) Plato, "Laws", in *Plato: Complete Works*, Book x, 896b, pp.1552- 53.

کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت. مرۆڤ لە هەموو قۆناخەکانی تەمەنیدا یەک جۆر هەڵوێستی بەرانبەر ئارەزووی سێکس نیە؛ هەروەها ئەم هەڵوێستە لە کەسێکی زاناوە بۆ نەزانێکیش گۆڕانی بەسەردا دێت. با بزانین ئەم بەشانە چین و ئەفلاتون چۆن باسیان دەکات.

ئەفلاتون لە سێ دایەلۆگدا (کۆمار) و (تیمایۆس) و (فیدرۆس)دا باسی بەشەکانی دەروونی کردووە. شیشیرۆ لەو باوەڕەدایە ئەفلاتون دابەشکردنی دەروونی لە پیتاگۆراسییەکانەوە وەرگرتوە.(104) هەروەها، ئەم بیریارە دەروون لەلای ئەفلاتون دەکات بە دوو بەشەوە: بەشی هۆشەکی و بەشی ناهۆشەکی. دواجاریش بەشی ناهۆشەکی دەکات بە دوو بەشی دیکەوە، کە تێکڕا سێ بەشی دەروون دیاریدەکەن. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (کۆمار)دا دەروون بەم شێوەیەی خوارەوە دەکات بە سێ بەشەوە:

کەوابوو، کەسێکی دادوەر و شارێکی پڕ دادوەری لە رووی دادوەرییەوە وەکو یەکن.

بەڵێ، وەکو یەکن.

بەڵام دادوەری شارەکە لەسەر پیشەی گونجاوی هەر یەکێک لەو سێ چینە ڕادەوەستێت، کە باسمانکردن و بەمامناوەنەی و ئازا و زانامان دانان.

(104) Frederick Copleston, *A History of Plilosophy*, vol.1, New York: Image Books, 1993. P. 208.



ئەوە ڕاستە.

ئەگەر تاکێک ئەو سێ بەشەی لە دەروونیدا هەبێت هەمان ناوی بۆ دادەنێین.

پێویستە.

لێرەدا ئەو پرسیارەی دەمانەوێت بیکەین ئاسانە: ئایا دەروون ئەو سێ بەشەی هەیە یان نا؟ (105)

ئەفلاتون بەگوێرەی سێ چینی جیاوازی کۆمەڵ (فەرمانڕەوا و پاسەوان و کرێکار) سێ بەشی دەروون دیاریدەکات. دەتوانین ئەم بۆچوونە هەڵگەڕێنینەوە و بڵێین، دیاریکردنی سێ چینی کۆمەڵ لە کۆماردا لەسەر دابەشکردنی دەروون دامەزراوە. ئێمە لەبەشێکی دیکەی ئەم نوسراوەدا مامەڵە لەگەڵ چینەکانی کۆمەڵ و پەیوەندییان بە بەشەکانی دەروونەوە دەکەین. ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە، دەستنیشان کردنی بەشەکانی دەروون و ڕۆڵی هەر یەکێک لەم بەشانەیە لە ژیانی مرۆڤدا.

دابەشکردنی دەروون لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا بۆ دوو بەشی سەرەکی لەلایەن شیشرۆوە دروستە. ئێمە لەدواییدا بەهەمان شێوە دابەشکردنەکە بەسەر دوو لایەندا لەسەر بناخەیەکی دیکەش باسدەکەین کە شیشیرۆ ئاماژەی بۆ نەکردووە. بەڵام دابەشکردنەکەی ئێمە بە دوانی دەمێنێتەوە و هیچ لایەنێکیان لەوە زۆرتر دابەش

(105) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی چوارەم، وەرگێڕانی د.محەمەد کەمال، ل 139 – 140.

نابێتەوە. بەشی هۆشەکی دەروون تەنیا لە هۆش پێکهاتوە و بەشی ناهۆشەکیش بەسەر گیان و ئارەزوودا دابەش دەبێت. هەر یەکێک لەم بەشانە کارو ئەرکی تایبەتی بۆ دیاریکراوە و کەسیان بە کارو ئەرکی بەشەکەی دیکە هەڵناسێت. ئەگەر کاری هۆش بیرکردنەوە بێت و کاری ئارەزووش پەیداکردن و وەرگرتنی چێژە هەستەکییەکان، ئەوا کاری هۆش نیە بە شوێن چێژی هەستەکییدا بگەڕێت و ئارەزووش بیرناکاتەوە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (تیمایۆس) دا، کە پاش دایەلۆگی (کۆمار) نوسیویەتی، جاریکی دیکە باسی بەشەکانی دەروونی کردووە. هەر یەکێک لەم بەشانەشی لەنێو خانەیەکی لەشی مرۆڤدا داناوە؛ لەسەرو هەموویانەوە و لەنێو سەردا هۆش و لەنێو سنگدا گیان و لەنێو سکیشدا ئارەزوو جێگەی پێدراوە؛

> ئەو بەشەی ڕوو لە مردنە لەنێو سنگدا دادەنرێت. لایەنێکی ئەم بەشەش بە سروشت لە لایەنەکەی دیکەوە بەرزترە، وەکو شوێنی دانیشتنی ژنان و پیاوان جیادەکرێنەوە و پەردەی ژێرسییەکان دەکەوێتە نێوانیانەوە. ئەو لایەنەی سەرچاوەی ئازایەتی و گیانە لە (سەر)ەوە نزیکە، تاکو گوێ ڕایەڵی هۆش بکات و سەرپەرشتی ئارەزووش بکات. دڵ، کەوابوو، پاش بەستنەوەی دەمارەکانی نێو لەش و ناردنی خوێن بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش دەبێت بە پاسەوانگا. لەکاتێکدا گیان توشی هەڵچون دەبێت و لە دەرەوە کاریکی خراپ ڕوویتێدەکات،



> هەموو ئەندامەکانی لەش هەستیارو ناسک دەبنەوە، باشترە چاکترین بەشی دەروون فەرمانڕەوایی بکات. (106)

لەم بۆچوونەوە سێ بەشەکەی دەروون لەسەر دابەشکردنێکی دیکە دیاریدەکەین؛ بەشێکی نەمر و بەشێکی دیکەش ڕوو لە مردن دەکات. ئەم بۆچوونە بە دوو ئاکاممان دەگەیەنێت؛

یەکەم، ئەفلاتون باوەڕی بە نەمری و مانەوەی دەروون پاش مردن یان ژیانی پاش مردن هەیە. دووەمیش تەنیا بەشێکی دەروون نەمرە و بەشەکەی دیکەی ڕوو لە مردنە و لەگەڵ تێکشکانی (لەش)دا ئەویش لەناودەچێت. بەگوێرەی دابەشکردنەکەی شیشیرۆ تەنیا بەشی هۆشەکی نەمرە و بەشی ناهۆشەکی ڕوو لە مردنە. هەروەها لە بەشی ناهۆشەکی یان ڕوو لە مردندا دوو لایەن هەن، کە بە گیان و ئارەزوو ناوزەدمانکردن. ئەم دوو لایەنە نەمر نین و لەناودەچن. تەنیا (هۆش) بە تێکشکانی لەش لەناوناچێت و پاش مردنیش بەردەوام دەمێنێتەوە؛

> دەروونی نەمریان لەنێو سەردا داناوە و لەشیان بۆ کردوە بە گالیستگەیەک تاکو تیایدا بجوڵێت. بەشێکی ڕوو لە مردنیش لە نێو دەرووندا هەیە، کە تیایدا شتە پڕ مەترسییەکان، وەکو چێژ و هەروەها فێڵی گەورەی خراپە؛ ئەو شتەی لە چاکەمان دوور دەخاتەوە و ئازایەتی و ترس؛ ڕاوێژکردنی گەمژانە و دوایش تورەبوونیان تیادا کۆدەبێتەوە. ئەمانە بە هەستکردنی

(106) Plato, "Timaeus",in *Plato: Complete Works*,70b, p.1271.

ناهۆشەکی و ئارەزووەوە بەستراونەتەوە. بەشی ڕوو لە مردنیان پێکهێناوە.(107) هۆش ئەو بەشەیە بەردەوامی بەبوونی مرۆڤ دەدات. گیان و ئارەزوو، کە هەمان کات پەیوەندییان بە هەستکردن و جیهانی هەستەکییەوە هەیە، نزمن و بوونیان بەلەشەوە بەستراوە. ئەمەش تاکو ڕادەیەک پێناسەکەی ئەفلاتون بۆ دەروون لە دایەلۆگی (فیدۆ)دا، وەکو هەبوویەکی سادە هەڵدەوەشێنێتەوە. ئایا چۆن دەروون سادەیە لە کاتێکدا سێ بەشی جیاوازی (هۆش و گیان و ئارەزوو) بۆ قوتدەکەینەوە؟ تەنیا ڕێگەیەک لەم ناکۆکییە ئەفلاتون ڕزگاربکات ئەوەیە، کە پێناسەکەی بۆ دەروون، وەکو هەبوویەکی سادە (هۆش) یش بگرێتەوە. ئەفلاتون هۆش یان بەشی نەمری دەروون بە سادە دادەنێت، نەک کۆی هەموو بەشەکانی. بەڵام دڵنیانین لەوەی لەگەڵ ئێمەدا هاوڕادەبێت یان نا. ئەگەر هاوڕاش نەبێت، ئەوا بەم ناکۆکییەوە دەمێنێتەوە. لەلایەکی دیکەوە دانانی بەشی دووەمی دەروون بە هەبوویەکی ڕوو لە مردن جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان هۆش و گیان و ئارەزوودا دیاریدەکات. ئەم جیاوازییەش لەوێدا بەرجەستە دەبێت، کە یەکێکیان نەمر و دووانەکەی دیکە ڕوو لە مردنن. ئەمەش ڕێگرە لە ئاستی دامەزراندنی یەکێتی لە نێوانیاندا و دانانی دەروون، بە هەموو بەشەکانیەوە، بە هەبوویەکی سادە و دابەشنەکراو.

لە دایەلۆگی (فیدرۆس)دا دەروون بە گالیسکەیەک شوبهێنراوە، کە

(107) هەمان سەرچاوە.



گالیسکەوانەکە هۆش و دوو ئەسپەکەش ڕایەکێشن گیان و ئارەزوون. هۆش، لەسەر گالیسکەکە جڵەوی دوو ئەسپەکەی گرتوە و دەیەوێت هاوسەنگ ڕایانگرێت و ڕێگەنەدات هەریەکێک لەو ئەسپانە گالیسکەکە بەرەو لای خۆیان ڕاکێشێ و هاوسەنگییەکە تیک بدات.

> ئەوەندە سەبارەت نەمری دەروون بەسە. ئێستا باسی بونیادی دەکەین. تەنیا خواش دەتوانێت بە درێژی لێیبکۆڵێتەوە و کارەکانی بژمێرێت؛ بەڵام دۆزینەوەی لێکچونی دەروون لەگەڵ شتێکی دیکەدا کارێکی ئاسانە و مرۆڤ دەتوانێت بیکات و کاتی زۆری ناوێت. با ئێمە ئەم کارەیان بکەین. ئێمە دەروون بەو گالیسکەیە دادەنێین دوو ئەسپی بالدار ڕایەکێشن. خواکان گالیسکەوان و ئەسپیان هەیە، کە چاکن وتوخمە کەشیان چاکە؛ ئەوانی دیکە تێکەڵەن. لە سەرەتاوە دەڵێن، گالیسکەوانەکە جڵەوی گرتوە و گالیسکەکە بەڕێوەدەبات. ئینجا یەکێک لە ئەسپەکان جوان و چاکە، توخمەکەشی چاکە. ئەسپەکەی دیکە بەپێچەوانەوەیە و توخمەکەشی جیاوازە. ئەمەش بەڕێوەچوونی گالیسکەکە دەکات بە کارێکی دژوار و ماندووکەر.(108)

ئەم شوبهاندنەی دەروون لە سەرێکەوە بونیادی دەروون و سەرەکەی دیکەوە کێشەیەکی ڕەوشتی ڕووندەکاتەوە. ئێمە لەپێشتر باسمانکرد

(108) Plato, "Phaedrus", in *Plato :Complete Works*, 246b, p. 524.

چۆن مێتافیزیکی ئەفلاتون دەبێت بە بناخەی بیردۆزە ئەپستمۆلۆجییەکەی و دوایش بۆچوونە سایکۆلۆجییەکەی سەبارەت بوونی مرۆڤ و دابەشکردنی ئەم بوونە بەسەر دەروون و لەشدا. ئێستاش سایکۆلۆجی بە ڕەوشتەوە گرێدەدات و دواجاریش دەیکات بە بنەمایەک بۆ بیردۆزە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکەی. لەم شوبهاندنەدا هۆش جڵەوەی ئەسپی باڵداری گیان و ئارەزووی گرتوە، بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نیە، لە کاتێکدا یەکێک لەو ئەسپانە جوان و چاکە و ئەوی دی ناشرین و خراپ. هەروەها ئەم ئەسپانە دەتوانن سەرکێشی بکەن. ئەگەر هۆش نەتوانێت جڵەویان بگرێت و هاوسەنگی دروستبکات ئەوا هارمۆنی لە بوونی ئەو دەروونەدا دەشێوێت و مرۆڤەکە توشی خراپە و نەخۆشی دەروونی دەبێت. جوانی ئەسپی یەکەمیان دەکەوێتە سەر واتای چاکە بۆ ئەم بەشەی دەروون. گیان، کە دەکەوێتە نێو سنگی مرۆڤەوە و سەرچاوەی سۆزە، خاوەنی چاکەی ئازایەتییە. ئارەزووش سەرچاوەی حەز و چێژوەرگرتنی هەستەکی و ژیانی هیدۆنیستانەیە. چاکەکەشی چێژوەرگرتنە. بۆ ئەفلاتون چێژوەرگرتنی هەستەکی خراپە و نزمترین هەڵوێستی مرۆڤانەیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت مرۆڤ دەبێت لەنێو ناخۆشی و ئازاردا بژی، بەڵکو چەند خۆی لە ئارەزووە هەستییەکانی دووربخاتەوە و خەمی وەرگرتنی چێژی هەستەکی نەبێت، شوێن حەزەکانی لەش و خۆشی لەشی نەکەوێت، زۆرتر بەختەوەر دەبێت چونکە چرای هۆشی



دادەگیرسێنێت و بە دوای شتێکی بەرزتردا دەگەڕێت. خەم بۆ خۆشی ئەم ژیانە بڕاوەیە و ساختەیە ناخوات و دەیەوێت بە بەختەوەرییەکی هەمیشەیی و ڕاستی بگات، کە پەیوەندی بە جیهانی هەستەکییەوە نیە و ئە بەختەوەرییە لەنێو خۆشی و چێژوەرگرتن لە بابەتە هەستەکییەکانی ئەم جیهانەدا پەیدا ناکات. ئەو خاڵەش لە دایەلۆگی (تیمایۆس)دا ڕوونکراوەتەوە، کە بەشی نەمری دەروون سەرچاوەیەکی پیرۆزی هەیە و هەمیشەییە. بەشەکەی دیکەی لە کاتی دروستکردنی لەشدا دروستکراوە و خراوەتە نێو لەشەوە. لەبەر ئەمە هەمیشەیی نیە و لەگەڵ تێکشکانی لەشدا لەناودەچێت. چەند بەڵگەیەکیشی بۆ سەلماندنی نەمری دەروون لە دایەلۆگی (فیدۆ)دا دانراون و من لێرەدا بەم جۆرەی خوارەوە ڕیزیان دەکەم.

**بەڵگەی یەکەم**: ئەم بەڵگەیە لەگەڵ پەیوەندی نێوان لایەنە دژوەستاوەکاندا سەرهەڵدەدات و هاوکات بەو میتۆدە نێگەتیڤییەوە بەستراوە لەپێشتر بۆ ناسینی خەسڵەتی فۆرمە هەمەکییەکان باسم کرد. ئەگەر من خەسڵەتی بابەتێک بزانم و بابەتەکە دژوەستاوێکیشی هەبێت، بەبێ ئەوەی من دژوەستاوەکەی بناسم یان بزانم چییە دەتوانم باسی خەسڵەتەکەی بکەم چونکە دژوەستاوی ئەو بابەتەیە، کە من دەیناسم. ئەگەر بابەتێک جوان بێت دژوەستاوەکەی ناشرینە، گەرم بێت دژوەستاوەکەی ساردە. لەم بەستێنەوە دەزانین، کە ژیان و مردن دژوەستاوی یەکن و لە یەکدییەوە دەردەچن. ئەگەر ژیان هەبێت

مردنیش هەیە و مردنیش هەبێت ژیان هەیە. کەوابوو، پاش مردن ژیان هەیە.(109) لاوازی ئەم بەڵگەیە لە کۆتایی نەهاتن بە سوڕانەوەی نێوان دژەکانە. ئێمە بەهەمان شێوە دەڵێین، مادام ژیانی پاش مردن هەیە، مردنی پاش ژیانیش هەیە و بەم جۆرە ئەم کێشەیە؛ لە ژیانەوە بۆ مردن و لە مردنەوە بۆ ژیان...هتد. سوڕانەوەیەکی لە کۆتایی بەدەرە. هیچ هۆیەک نادۆزینەوە لە قۆناخێکی سوڕانەوەکەدا ئێمە ڕابگرێت و لەوە زۆرتر ڕێگەنەدات سوڕانەوەکە بەردەوام بێت.

**بەڵگەی دووەم**: بەڵگەی دووەم لەسەر ئەو بۆچوونەی ئەفلاتون ڕادەوەستێت، کە گوایە زانین بیرکەوتنەوەیە. ئێمە جۆرە زانینێکمان هەیە، کە هەمەکی و ڕەهایە، بەڵام زانین هەمەکی و ڕەها لەنێو جیهانی هەستەکی و بابەتە هەندەکییەکاندا پەیدا ناکرێت و هەستکردن بە ئێمەی نەگەیاندووە؛

سیبیس گوتی؛ بەڵێ بە دڵنیاییەوە ڕاستە و ئێمەش بە هەڵەدا ناچین ئەگەر لەو باوەڕەدابین؛ گەڕانەوە بۆ ژیان ڕاستەو مرۆڤ پاش مردن بۆژیان دەگەڕێتەوە و مردووەکانیش دەروونیان هەیە.
سوکرات هەڵیدایە و گوتی؛ ئەو بیردۆزەش ڕاستە، کە زانین بە بیرکەوتنەوە دادەنێت. بەگوێرەی ئەمە، ئێمە لەپێشتر ئەوەی ئێستا باسیدەکەین زانیومانە. ئەمەش تەنیا لەو حاڵەتەدا

(109) Plato, “Phaedo”, in *Plato: Complete Works*, 70d, p. 61.



ڕوودەدات؛ کە دەروون پێش ئەوەی لەنێو لەشدا دابنرێت، لە شوێنێکی دیکەدا هەبووە.
کەوابوو، دەروون نەمرە.(110)

بیردۆزەی بیرکەوتنەوە، کە ئەفلاتون بە درێژی لەدایەلۆگی (مینۆ)دا باسیدەکات و منیش لەپێشتر ئاماژەم بۆ کردووە، جەخت لەسەر بوونی دەروون پێش هاتنی بۆ نێو جیهانی هەستەکی و لەش پێ بەخشینی دەکات.

**بەڵگەی سێیەم**: لە سەرەتای بیرکردنەوەی فەلسەفییانەوە بیریاران لەو باوەڕەدابوون هەرشتێک سادە بێت و لە بەشەکان پێکنەهاتبێت هەمیشە، وەکو خۆی دەمێنێتەوە و لەناوناچێت.

ئەم بۆچوونەش بە درێژایی مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی، بیریارانی سەر بە ڕاڕەوی بڕوای بەو ئاکامە گەیاندووە، کە هۆی یەکەم بۆ جیهان دەبێت هەمیشەیی و نەمر بێت و لەناونەچێت و پێویستە ئەو هۆیە سادە بێت. لەم ڕوانگەیەشەوە بوونی خوا بە سادە دادەنێن و لە فرەلایەنی و پێکهاتە دوور دەیپارێزن.(111)

(110) هەمان سەرچاوە.

(111) ئەمە کێشەیەکی گەورەی فەلسەفی و(کەلامی)یشە لەلای بیریارە موسوڵمانەکان. شوێنکەتوانی فێرگەی موعتەزیلە، بۆ نموونە، بۆ پاراستنی یەکێتی و سادەیی بوونی خوا، بەپێچەوانەی حەنبەلییەکانەوە، خەسڵەتەکانی خوایان ڕەتدایەوە و بە ڕاستەقینە و هەمیشەیی ناوزەدیان نەکرد. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون سوربوون لەسەر بوونی خەسڵەتەکانی خوا بە ڕاڕەوی فرەجۆری هەمیشەییمان دەگەیەنێت. ئەمەش لەگەڵ باوەڕی یەک خوایی ئایینی ئیسلامدا ناکۆکە. پیویستە (وەحدانییەت)ی خوا بپارێزرێت.

ئەفلاتون، بەهەمان شێوە، جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە هەموو ئەو شتانەی پێکهاتەن لەناودەچن و بوونێکی کاتییان هەیە. بۆنموونە، ئاو لە دوو توخمی جیاواز پێکهاتوە. بە جیاکردنەوەی توخمەکان ئاویش لەناو دەچێت. ئەوەی دەمێنێتەوە و لەناوناچێت دوو توخمە جیاوازەکانە نەک ئاو. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە توخمەکانی ئاو سادەن و لە بەشەکان پێکنەهاتوون. لەم نموونەیەی ئێمەوە، دەتوانین بڵێین یان لەگەڵ ئەفلاتوندا لەسەر ئەو خاڵە هاوڕا بین، ئەگەر دەروون سادە بێت و لە هیچ پێک نەهاتبێت، ئەوا لەناوناچێت و نەمرە. بەڵام ئێمە لەگەڵ سادەیی دەرووندا کێشەمان هەبوو. دیارە لێرەشدا ئەفلاتون تەنیا باسی بەشێکی دەروون دەکات. کە (هۆش)ە، چونکە دوو بەشەکانی دیکە بە بوونی لەشەوە دەبەستێتەوە و بە نەمر دایان نانێت.

**بەڵگەی چوارەم**: لە دایەلۆگی (فیدرۆس) دا ئەفلاتون ئاماژە بۆ دوو جۆر جوڵان دەکات؛ یەکەم، جۆرە جوڵانێک، کە هۆیەکی دەرەکی هەیە و دووەمیش، ئەو جوڵانەیە خودی بابەتە جوڵاوەکە دروستی دەکات و پێویستی بە هۆیەکی دەرەکی نیە. ئەم دوو جۆرە جوڵانەش خەسڵەتی جیاوازی خۆیان هەیە. جوڵانی بابەتە هەستەکییەکان سەر بە جۆری یەکەم و دەروونیش سەر بە جۆری دووەمە؛

ئێستا پێویستە لە ڕاستی سروشتی دەروون و خوا لە ڕێگەی کارکردنی هەر یەکێک لەمانەوە تێبگەین. ئەمەش بەڵگەکەمانە:

> دەروون نەمرە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە هەرشتێک بەردەوام لە جوڵاندا بێت نەمرە؛ ئەوەی دەجوڵێ و جوڵانەکەشی پێدراوە لەگەڵ وەستانی جوڵانەکەیدا دەمرێت. کەوابوو، ئەوەی خۆی دەجوڵێنێت جوڵانەکەی بەردەوامە چونکە نابێت بە شتێکی جیاوازتر لە خۆی. ئەم خۆجوڵێنەرە هۆی جوڵانە لە شتە جوڵاوەکانی دیکەدا و ئەم سەرچاوەیەش لە سەرەتا بەدەرە.(112)



ئێمە دەتوانین بەڵگەکەی ئەفلاتون بەم شێوەیە دابنێین و بڵێین، هەموو خۆجوڵێنەرێک لە سەرەتا بەدەرە و نەمرە. دەروونیش خۆجوڵێنەرە، کەوابوو، دەروون لە سەرەتا بەدەر و نەمرە. ئەم بەڵگەیەی لەسەر ئەو باوەڕەش ڕادەوەستێت، کە خۆجوڵێنەر دەبێت هەمیشە هەبووبێت تاکو خۆی جوڵانەکە بخاتەگەڕ یان لە پێش ئەو جوڵانەدا هەبێت، ئەگینا جوڵانەکە دروست نابێت. لەم بۆچوونەوە بەو خاڵە دەگەین، کە دەروون سەرەتای نیە، هەرشتێکیش سەرەتای نەبێت کۆتاییشی نیە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی (یاساکان)یشدا باسی چۆنیەتی جوڵانی دەروونی کردووە و بە خۆجوڵێنەر دایناوە، کە لەپێشتر ئێمەش باسمانکرد.

**بەڵگەی پێنجەم**: ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە بابەتێک لەناودەچێت و نامێنێت، کە لەنێوخۆیدا و بە سروشت خراپییەکی هەڵگرتبێت و ئەو

(112) Plato, "Phaedrus", in *Plato: Complete Works*, 245e, pp. 523-4

خراپییە دەبێت بە هۆی لەناوچوونی. ئەگەر بڵێین دەروون ڕوو لە مردنە و لەناودەچێت، دەبێت لەگەڵ خۆیدا تۆوی مردنی هەڵگرتبێت، ئەگینا هێزێکی دەرەکی یان خراپەیەک لە دەرەوەی سروشتیدا ڕوویدات لەناوی نابات. ئەم بەڵگەیەش بۆ نەمری دەروون لە دایەلۆگی (کۆمار) دا بەم شێوەیە باسکراوە؛

> گلاوکۆن ئەوە بزانە، ئێمە ناڵێین خواردنی خراپ، خواردنێک بۆگەنی کردبێت یان هەر شتێک بێت لەش لەناودەبات، بەڵام ئەگەر خواردنێکی خراپ ببێتە هۆی سەرهەڵدانی خراپ بوونی لەش دەڵێین ئەو کەسە بە نەخۆشی مرد. لەبەرئەوەی لەش و خواردن دوو شتی جیاوازن، تاکو خواردنە بۆگەنەکە بە لایەنی خراپی لەش نەگات بە خراپ دانانرێت.
>
> ئەوە ڕاستە.
>
> کەوابوو، دووڕێگەمان لەبەرە. یەکەم، ڕەتدانەوەی بەڵگەکەمان دووەم، پەیڕەویکردنی و گەیشتن بەو باوەڕەی دەروون بە گەرمەتا، نەخۆشی و کوشتن، تەنانەت بە بڕینی لەش لەناوناچێت هەرشتێکیش، وەکو دەروون خراپەیەکی سروشتی لە ناوی نەبات، خراپەیەکی دەرەکی ناتوانێت کاری تێبکات.(113)

بەم بەڵگانە، ئەفلاتون هەوڵی سەلماندنی نەمری دەروونی داوە و

(113) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی دەیەم، وەرگێڕانی د.محەمەد کەمال، ل 339.



باوەڕی بە لەناوچوونی دەروون نیە. لەلایەکەوە دەروون بە هەبوویەکی لە سەرەتا بەدەر دادەنێت، کە لەپێشتر هەبووە و تەنیا پەیوەندییەکەی بە لەشەوە، وەکو ڕووداو لەنێو کاتدایە. لەلایەکی دیکەوە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە و هەوڵدەدات لە ڕێگەی (زانین)ەوە خۆی لە ڕووداوی کەوتنە نێو لەشەوە ڕزگار بکات و بە فۆرمە هەمەکییە بەرزەکەی بگات. بێگومان، ئەفلاتون بۆ باوەڕ بە نەمری دەروون سودی لە ئەفسانەی یۆنانییش وەرگرتوە. لە کۆتایی کۆمارەکەیدا چیرۆکی (ئێر) ئەو قارەمانە دەگێڕێتەوە، کە لە مردن گەڕاوەتەوە. ئێر لە جەنگێکدا دەکوژرێت، بەڵام لاشەکەی پاش دە ڕۆژ زیندو دەبێتەوە و دەیگێڕێتەوە، چۆن گیانی لەگەڵ گیانی مردووەکانی دیکەدا، بەتایبەتی ئەوانەی لە ژیاندا کاری چاکەیان کردوە چۆتە شوێنێکی خۆش و هەروەها چۆن گیانی مرۆڤە خراپەکانیش سزا دراوە.(114) ئەفلاتون سودی لە ئەدەبی یۆنانییش وەرگرتوە. لە دایەلۆگی (جۆرجیاس)دا لەسەر زاری یورپیدس دەڵێت، ( ژیان مردنە و مردنیش ژیانە.)(115) ئەمە گوتەکەی (حەلاج کوڕی مەنسور) مان بیردەخاتەوە، کە پێش هەڵواسینی هاواری دەکرد؛ "بمکوژن لە مردنا ژیان دەبینم". لەبەر ڕۆشنایی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا واتای مردن و تراجیدیای مەرگ بە تەواوی دەگۆڕێت. مردن نابێت بە لەناوچون و تێکشکان، بەڵکو گۆڕانی دەروون لە بارودۆخێکی بوونەوە بۆ

(114) هەمان سەرچاوە،ل 343 .

(115) Plato, "Georgias", in *Plato:Complete Works*, 492e, p. 836

بارودۆخێکی دیکه. ڕزگاربوونه له قەید و سنورداریێتی به هۆی کەوتنه نێو لەشەوه. ئەگەر دەروون، بەو شێوەیەی ئەفلاتون باسیدەکات، بتوانێت خۆی له ئەشکەوتی (لەش) یان جیهانی هەستەکی ڕزگار بکات و به هۆی زانینەوه ڕاستی بدۆزێتەوه، ئەوا پێویستی به گەڕانەوه بۆ نێو لەش و گەشتێکی دیکه نیه و به بەرزێتی دەگات و لەگەڵ دەروونی هەمەکیدا یەک دەگرێت. سایکۆلۆجی نێو سیستەمی ئەفلاتون زانستێکی سەربەخۆ نیه و پەیوەندییەکی بنەڕەتی به مێتافیزیک و ڕەوشت و دواجاریش بیردۆزه ڕامیارییەکەیەوه هەیه. ئێمه پەیوەندی سایکۆلۆجیمان به میتافیزیکەوه له چەند شوێنێکی ئەم بەشەدا باسکردووه و له بەشی داهاتوودا باسی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ڕەوشت و ڕامیاریدا دەکەین. ڕوونیدەکەینەوه چۆن ئەفلاتون بەشەکانی دەروون به چاکه و چینەکانی کۆمەڵەوه دەبەستێتەوه و چۆن لەبەر ڕۆشنایی (چاکه) بۆ هەر یەکێک لەو بەشانه فەرمانڕەوا بۆ ئەو دەوڵەته هەڵدەبژێرێت، که نیازی دامەزراندنی هەیه.



# بەشی شەشەم

## دەوڵەت و دادوەری

لەم بەشەدا مامەڵه لەگەڵ فەلسەفەی ڕامیاری ئەفلاتوندا دەکەین. له سەرەتاوه پێویسته ئەو خاڵەمان لەبیر نەچێت، که ئەفلاتون یەکەم بیریاره لەسەر فەلسەفەی ڕامیاری بنوسێت و له سیستەمەکەیدا باسی یۆتۆپیایەکمان بۆ بکات، به دامەزراندنی مرۆڤ بتوانێت بەختەوەربێت و کۆمەڵگایەکی دادوەر بهێنێتەکایەوه. مەبەستی من لەم خاڵەش هاوبیری و کۆک بوونمان لەگەڵ ئەفلاتوندا نیه. پێش ئەم بیریاره هیچ فەیلەسوفێک نادۆزینەوه یۆتۆپیایەکی ڕامیاری دامەزراندبێت و سیستەمێکی سەرتاپاگیری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی باسکردبێت. هەمان کات ئەم یۆتۆپیایه پەیوەندییەکی بنەڕەتیی به سیستەمه مێتافیزیکییەکەوه هەیه. کێشەی دادوەری به بەشەکانی دەروون و چاکەی هەریەکێک لەم بەشانەوه گرێدراوه. ئێمه بێ ڕوونکردنەوەی میتافیزیک و سایکۆلۆجی و بۆچوونه ڕەوشتییەکانی ئەفلاتون دژواره له فەلسەفه ڕامیارییەکەشی تێبگەین. لەبەر ئەم هۆیەشه توێژینەوەکەمان لەسەر دەوڵەت و دادوەری لەم بەشەدا داناوه و ئێستا ڕۆشنایی دەخەینەسەر.

فەیلەسوفێک خۆی به کێشەی بەختەوەری مرۆڤەوه ماندووبکات و هەوڵی دۆزینەوەی ژیانێکی چاکی بۆ بدات، گرنگه له هەمان کاتدا لەو

بارودۆخە گشتییانە بکۆڵیتەوە، کە زەمینە بۆ بەختەوەری و ژیانی پڕ چاکە بۆ مرۆڤ خۆش دەکەن. یەکێکیش لەو بارودۆخانە دەوڵەتە، کە مرۆڤ لەژێر سایە و دەستەڵاتیدا دەژی. پێویستە هاوتەرازییەک لەنێوان دەوڵەت و تاکەکانی کۆمەڵدا دروست بێت، کە هیچ لایەنێکیان نەبێت بە قوربانی لایەنەکەی دیکە.

ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵ بەتێکڕا خراپ بن یان بە سروشت خراپ بن ئەوا ناتوانین دەوڵەتێکی چاک دامەزرێنین، بەهەمان شێوەش، خراپی دەوڵەت هاووڵاتیان بەختەوەر ناکات، هەرچەند ئەو هاووڵاتییانە بە سروشت چاک بن و ئارەزووی خراپە کردنیشان نەبێت. کەوابوو، دەبێت بەدوای دەوڵەتێکی چاک و هاووڵاتیانی چاکدا بگەڕێین. ئەمەش بەو خاڵەمان دەگەیەنێت، کە واتای چاکە لای هاووڵاتیان و دەوڵەت ناگۆڕێ. ئەوەی بۆ هاووڵاتیان چاکە بۆ دەوڵەتیش هەمان واتای هەیە. لەبەر ئەمە دەوڵەت دەزگایەکی ڕووتکراوەی ژوور خواست و دەستەڵاتی هاووڵاتیان نیە، و پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە بەختەوەری چاکەکردن بۆ هاووڵاتیانەوە هەیە. لەم ڕووەوە دەوڵەت سەر بە بنەمایەکی ڕووتی ڕامیاری و بەرژەوەندی ڕامیاری و گەمە ڕامیارییەکان نیە، بەڵکو بنەما و لێپرسینەوەی ڕەوشتییشی هەیە. پێویستیمان بە دەوڵەتێکە بەختەوەری هاووڵاتیان مسۆگەر بکات. بۆ ئەم کارەش یاسادانان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. یاسادانانیش نابێ بدرێتە دەست کەسانی نەزان و خۆویست یان ئەوانەی بیر لە



دەستەڵات و بەرژەوەندی خۆیان دەکەنەوە. لێرەدا، کێشەی سەرکردە و فەرمانڕەوایانی دەوڵەتەکە سەرهەڵدەدات. دەبێت ئەو جێگەو دەستەڵاتە بە کەسانێک بدرێت خاوەنی (زانین)و دەستەڵاتی هۆشەکی بن و بۆ بەرژەوەندی هاووڵاتیان نەک خۆیان کاربکەن. ئەفلاتون ئەم لێپرسینەوەیە بە فەیلەسوفەکان دەدات چونکە ڕامیاری دەستەڵاتبازی نیە و زانستێکە هەوڵی سەقامگیرکردنی یاسا و دامەزراندنی ژیانێکی چاک و پڕ بەختەوەری بۆ هاووڵاتیان دەدات.(116)

مسۆگەرکردنی بەختەوەری هاووڵاتیان بە پێویستییەکانی ژیانەوە بەستراوە و لە ڕێگەی پەیداکردنیانەوە دابین دەکرێت. مرۆڤ بە تەنیا و بەبێ کۆمەڵ ناتوانێت پێویستییەکانی دابین بکات. جوتیارێک بۆ کێڵانی زەوییەکەی گاسن بەکاردەهێنێت، گاسنیش ئاسنگەر دروستی دەکات. ئەو نانەی ئاسنگەرەکەش دەیخوات گەنمە و جوتیارەکە دەیهێنێتە بەرهەم. ئەم پەیوەندییە و پشت بەستن بە یەکدی ئاماژە بۆ پێکەوەژیان لە شوێنێکی تایبەتدا دەکات، کە ئەفلاتون ناوی دەنێت (شار). لە شاردا دەستەو تاقمی جیاواز بەگوێرەی پیشەکانیان دەژین و پەیوەندی ئابووری لەگەڵ یەکدا دروست دەکەن.

لێرەدا، دابەشکردنی کارو سەرهەڵدانی چینەکانی کۆمەڵ دێنەکایەوە. بە دیدی، ئەفلاتونیش، دابەشکردنی کار دەبێتە هۆی پێشخستنی پسپۆڕی و زۆرکردنی بەرهەم. ئەمەش بە ڕای من، لەگەڵ

(116) Plato, "Statesman", in *Plato:Complete Works*, 305e, p. 35

بۆچوونەکەی مارکسدا کۆکە، بەڵام جیاوازی نێوان ئەفلاتون و مارکس لە ناجۆری سیستەمی چینایەتیدایە، کە لە دواییدا باسی دەکەم. هەروەها، بۆ ئەفلاتون چینایەتی لەسەر دابەشکردنی (دەروون) ڕادەوەستێت و بنەڕەتێکی لەپێشتر و نەگۆڕی هەیە. مرۆڤێک بە سروشت کرێکارە نەک بە ڕووداو. ئەمەش زۆرتر لە فەلسەفەی (ڤێدەنتا)وە نزیکە و مارکس بەتەواوی ڕەتی دەداتەوە. لەم بۆچوونەوە ئەفلاتون کۆمەڵ بەسەر سێ چیندا دابەش دەکات و چینێکیان بۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژێرێت. بەڵام مادام دەوڵەتەکەمان دەبێت سەرپەرشتی دابین کردنی پێویستییەکانی کۆمەڵ بکات و هاووڵاتیان بەرەو چاکەکردن بەرێت، دەبێت بەرنامەی تایبەت بۆ فێربوون و پەروەردەکردن دابنێت و تەنانەت سەرپەرشتی جووتبوون و منداڵبوون و منداڵ بەخێوکردن و جۆری زانین و هونەر بۆ پەروەردەکردنیان بکات. مادام زۆربوونی دانیشتوانی شارەکە پێویستی بە زەوی و سنورفراوانی هەیە، ئەگەری داگیرکردنی خاک و جەنگ لەگەڵ دراوسێکاندا پەیدادەبێت. ئەمەش داوای دەستەوتاقمێکی جەنگاوەر دەکات، کە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکە پەروەردەکراون و قوربانی دەدەن و ئازایانە سنوور دەپارێزن.
دامەزراندنی دەوڵەتێک، کە تیایدا هاووڵاتیان چاک و بەختەوەر بن، پێویستی بە دادوەری هەیە. دادوەری پێش مەرجە بۆ دابینکردنی بەختەوەری چاکەی هاووڵاتیان. ئەمەش کارێکی ئاسان نیە، دەشێ



ئەو ڕەخنەیەمان لێبگرن و بڵێین، کە هەندێک جار ناجۆری و نادادوەری دەبێتە هۆی بەختەوەری. دەگونجێت سەرۆکێکی دیکتاتۆر و خوێن ڕێژ خۆی بە بەختەوەردابنێت و لە ڕێگەی ستەم و زۆردارییەوە هەموو پێویستییەکانی ژیانی دابین کردبێت. ئەگەر لە دەرەوەدا تەماشای ژیانی ئەو کەسە بکرێت و بەختەوەریش بە پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەوە ببەستینەوە ئەم ڕەخنەیە تاکو ڕادەیەک دروستە. بەڵام بۆ ئەفلاتون بەختەوەری و چاکە لە یەکدی دانابڕێن. هەرچەندە پێویستییەکانی ژیانی سەرکردەیەکی زۆردار و گەندەڵ مسۆگەر بن هێشتا کەسێکی بەختەوەر نیە.
دادوەری بنەمای ئەو دەوڵەتەیە ئەفلاتون نەخشە و پلانەکەیمان بۆ دادەنێت. ئێمە ناتوانین لەو دەوڵەت و ڕژێمە ڕامیارییەی دەمانەوێت هاووڵاتیان بەختەوەربکات بدوێین ئەگەر مامەڵە لەگەڵ کێشەی دادوەری و واتای دادوەرییدا نەکەین. بۆ ئەم مەبەستە دایەلۆگی (کۆمار) بە مشتومڕ لەسەر واتای دادوەری لەنێوان سوکرات و کەسانی بەرامبەرییدا دەست پێدەکات. بێگومان، ئەفلاتون لەم دایەلۆگەدا لەسەر زاری سوکرات، کە پاڵەوانی دایەلۆگەکەیەتی بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕێت و فەلسەفە ڕامیارییەکەی ڕووندەکاتەوە. بەشی یەکەمی کۆماریش، کە لەسەر واتای دادوەرییە لە قۆناخی یەکەمی بیرکردنەوە و نوسینی ئەفلاتوندایە و سەر بە گروپی ئەو دایەلۆگانەیە دەکەونە قۆناخی سەرەتاییەوە و نۆ

بەشەکەی دیکەی لە قۆناخی ناوەڕاستدا نوسراون. لە سەرەتای مشتومڕەکەوە سوکرات بە جۆرێک خۆی نیشان بەرانبەرەکەی دەدات، کە هیچ لە بارەی دادوەرییەوە نازانێت. ئەمەش، لەپێشتر بە (گاڵتەجاڕی)ی سوکرات ناوزەدمان کرد. مەبەستی سوکرات لەم هەڵوێستە هاندانی بەرانبەرەکەیەتی بۆ گەڕان بە دوای واتا و پیناسەی ئەو چەمکەی لەژێر لێکۆڵێنەوەدایە. پاش ئەوەی بەرانبەرەکەی پێناسەیەکی چەمکەکە دەخاتە ڕوو، سوکرات ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت و کەموکورتییەکانی ئەو پێناسەیە دەدۆزێتەوە، ڕەتی دەداتەوە و داوا لە بەرانبەرەکەی دەکات پێناسەیەکی چاکتر ئامادەبکات. ئەم پرۆسەیە بۆ دۆزینەوەی دوا پیناسە لە زۆربەی دایەلۆگەکاندا توشی نائومیدیمان دەکات. سوکرات پاش ڕەخنەگرتن لە بەرانبەرەکەی و هەڵوەشاندنەوەی بۆچوونەکانی پێناسەیەکی چاکترمان بۆ ئامادە ناکات. بەڵام لە دایەلۆگی (کۆمار)دا توشی ئەم نائومیدییە نابین و لەبەردەم فەلسەفەیەکی ڕامیاری پۆزەتیڤدا خۆمان دەبینین. ئەفلاتون پێناسەی بۆ دادوەری بۆ داناوین و دەیەوێت لە کۆمارەکەیدا پەیڕەوەی بکات. پێش ئاماژەکردن بۆ پێناسەکەی ئەفلاتون دەمەوێت ئەو پێناسە جیاوازانە باسبکەم، کە کەسانی بەرانبەر سوکرات، وەکو گلاوکۆن و ئەدیمەنتۆس (هەردووکیان برای ئەفلاتونن)و سیفالۆس و پۆلێماکۆس و تراسیماکۆس بۆ دادوەری دادەنێن. بەتێکڕا ئەم پێناسانە دەکەونە بەر نەشتەری ڕەخنەکاری و



هەڵوەشاندنەوەی سوکرات. سوکرات هەوڵدەدات ڕوونی بکاتەوە، کە پیناسەکان لەبەر ئەوەی سەرتاپاگیر یان گشتگیر نین کورت دەهێنن و بۆ دەوڵەتێک نابن بە بنەما، کە ئارەزوومەندی بەختەوەری و ژیانێکی چاکە بۆ هەموو هاووڵاتیان.

دەیڤد ساکس لە نوسراوەکەیدا بەناوی (هەڵەی نێو کۆماری ئەفلاتون) ئەم جۆرە پیناسانەی بە (بازاڕیی)یان (ساکار) ناوزەدکردووە، کە بناخەیەکی لۆجیکی بەهێزیان نیە و بەئاسانی هەڵدەوەشێنەوە.(117)

بە دیدی من، دانانی ئەم پێناسانە بە بازاڕیی و ساکار جۆرێکە لە نادادوەری لەگەڵ ئەوانەی ئامادەی دەکەن و باوەڕی پێدەهێنن. هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەم پێناسانەش لەلایەن ئەفلاتونەوە و لەسەر زاری سوکرات پەیوەندی بە بۆچوونی مێتافیزیکی ئەم بیریارەوە هەیە. هەمان کات ناکۆکی نێوان زانینی هۆشەکی و هەستەکی و فەلسەفەی ئەفلاتون و سەفسەتییەکان دەردەخات. بۆ ئەفلاتون هەرچ پێناسەیەک پەیوەندی بەڕووداوە هەندەکییەکان و زانینی هەستەکییەوە هەبێت ناخی (ڕاستی) ناپێکێت چونکە ڕاستی هەمەکی و نەگۆڕە. پێناسەکە، لێرەدا، دەبێت بە ڕێژەیی نەک بازاڕیی؛ بۆ کەسێک دروست و کەسێکی دیکە نادروست دەردەچێت.

یەکەم پێناسەی دادوەری لە (کۆمار) دا سیفالۆس ئامادەی دەکات و

(117) David Sachs, "A Fallacy in Plato's Republic", in *Plato: Critical Assessment*, (ed.,) Nicholas D. Smith, vol.3, London: Routledge, 1998. P. 207.

سوکراتیش لەسەر ئەو بناخەیەی کە ڕێژەگەرییە، نەک بازاڕی ڕەتی دەداتەوە. مشتومڕەکەی نێوان سوکرات و سیفالۆس بەم شێوەیەیە،

ئەی سیفالۆس هەستێکی جوانت هەیە، بەڵام باسی دادەوەریت کرد. ئایا دادوەری ئەوەیە، کە قەرزەکانت بەبێ مەرج بدەیتەوە بە خاوەنەکەی؟ یان ئەم کارە هەندێکجار ڕەوایە و جاری دیکەش ڕەوا نیە؟ مەبەستم لەو کارە، بۆ نموونە، ئەوەیە، ئەگەر مرۆڤێک چەکێکی لای هاوڕێکەی دانابێت و ئێستا ئەو مرۆڤە شێت بێت، بچێت داوای چەکەکەی لە هاوڕێکەی بکاتەوە، ئەگەر هاوڕێکەی چەکەکەی نەداتێ کارێکی ناڕەوای کردوە و نابێت کەسیش حوکم بەسەر باری هۆشەکی کەسێکی دیکەدا بدات.

بەڵێ وایە.

کەوابوو، پێناسەی دادوەری گوتنی ڕاستی و قەرزدانەوە نیە (118)

هەروەها، سوکرات لەگەڵ پۆلیمارکوسدا بەم جۆرە لە مشتومڕەکەیدا بەردەوام دەبێت و ڕەخنە لە بۆچوونەکانی دەگرێت،

بەڕای من ئەم شێوە دەربڕینە باشترە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، پۆلێمارکۆس، کە ئەو کەسانەی بە هەڵە حوکم بەسەر هاوڕێیەکدا دەدەن و زیانی پێدەگەیەنن یان دوژمنێک بە

(118) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی یەکەم، وەرگێڕانی د.محەمەد کەمال، ل16-17.



هاوڕێ دادەنێن و دەبن بە سودبەخش. کارێکی دادوەرانە دەکەن. ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی سیمۆندیسەوەیە.

بەڵێ وایە.

بەڵام با پێناسەکەمان بگۆڕین چونکە واتای هاوڕێی و دوژمنمان بەتەواوی ڕووننەکردەوە.

چۆن پێناسەیان بگۆڕین؟

ئێمە گوتمان، هاوڕێ کەسێکی سوودبەخشە.

ئێستا چۆن ئەم پێناسەیە بگۆڕین؟

کەسێک سوودبەخش بووبێت و ئێستاش سود بگەیەنێت بە هاوڕێ دادەنرێت. کەسێکیش سوودبەخش بووبێت و ئێستا سوودبەخش نەبێت، هاوڕێ نیە. بەم جۆرەش وا بیر لە دوژمن دەکرێتەوە.

بەگوێرەی ئەم پێناسەیە، کەسێکی چاک هاوڕێ و خراپیش دوژمنە.

بەڵێ.(119)

دەبینین کەموکورتی ئەم پێناسانە بەستراوە بە چۆنیەتی و بەستنەوەیان بە داکەوتی هەستەکی و ڕوودانی هەندەکییەوە. وەکو ئەوە وایە کەسێک پێناسی باران بکات و بڵێت، ئەو ئاوەیە لەسەرەوە بەرەوخوارەوە دێت. بێگومان ئەمە جۆرە زانیارییەک سەبارەت باران

(119) هەمان سەرچاوە.ل 21.

بەدەستەوە دەدات بەڵام دەتوانین بە ئاسانی هەڵیوەشێنینەوە. تاڤگەش ئاوە لەسەرەوە بەرەوخوارەوە دێت و بارانیش نیە. لێرەدا پێناسەکەمان خەسڵەتی بنەڕەتی بارانی دەرنەخستوە. بێجگە لەمە، ئەفلاتون دەیەوێت ئەو خەسڵەتە بنەڕەتییە نەگۆڕو هەمەکی بێت. خەسڵەتێک بێت لابردنی گۆڕان لە بوونی ئەو شتەشدا، کە پێناسکراوە دروست بکات. ئەگەر بڵێم باران ئاوە، خەسڵەتێکی بنەڕەتی باران باسدەکەم، کە بە لابردن و ڕەتدانەوەی بوونی بارانیش گۆڕانی بەسەردا دێت. من ناتوانم بڵێم باران ئاو نیە. هەروەها، بە تەنیا باران ئاو نیە؛ کانی، چەم، ڕووبار و دەریاکانیش لە ئاو پێکهاتوون و باران نین. کەوابوو، پیناسەکەمان بۆ باران هەرچەندە خەسڵەتێکی بنەڕەتی ئەم بوونە دەردەخات ناتەواوە. بەمجۆرە، ئەفلاتون دەیەوێت پێناسەیەکی هەمەکی و نەگۆڕ بۆ دادوەری دەروست بکات. بەڵام ئەو گرفتەی ڕوومان تێدەکات و دەبێت بە پرسیار لەلامان سەبارەت بە سەپاندن و ساخ کردنەوەی پێناسەکەی ئەفلاتونە بەسەر هەموو ڕووداوە هەندەکییەکاندا. ئایا ئەفلاتون توانیویەتی پێناسەیەکی نەگۆڕ و هەمەکی بۆ (دادوەری) بکات؟ وەڵامدانەوەیەکی نەرێی ئەم پرسیارەیە، بیریارانی وەکو فۆستەر و دەیڤد ساکسی گەیاندۆتە ئەو باوەڕەی، کە بەڵگەکەی ئەفلاتون بۆ بەستنەوەی دادوەری بە چاکەوە و پێناسەکەی جۆرە هەڵەیەکی تێدایە. مابۆت، بیریارێکی دیکەیە، پشتگیری ئەفلاتون دەکات و گوایە



ئەفلاتون هەوڵیداوە پێناسەی خودی دادوەری بکات نەک دادوەری بە ئاکامەکەیەوە ببەستێتەوە.(120) فۆستەر جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە پێناسەکەی ئەفلاتون بۆ دادوەری پەیوەندی بە ئاکامی دادوەرییەوە هەیە.(121) ئەمەش لەسەر ئەوە ڕادەوەستێت، کە ئەفلاتون لە کۆماردا دەڵێت، "شتی باش تەندروستی چاک دەهێنێتە کایەوە، خراپیش نەخۆشی."(122) پێناسکردنی کردەوەیەک لە ڕێی ئاکامەکەیەوە، کە بنەمای بۆچوونی فەلسەفی ئەنجامگەرانەیە، پەنا بۆ ناوەڕۆکی خودی کردەوەکە نابات. مشتومڕی فۆستەر و مابۆت دواجاریش دەیڤد ساکس لەسەر ئەم خاڵەیە. ئەگەر ئەفلاتون بیەوێت پیناسی خودی دادوەری بکات، واتاکەی لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامەکانیدا ڕوونەکاتەوە، دەبێت خودی دادوەرییمان پێبناسێنێت. لە کاتێکدا ئاماژە بۆ ئامانجەکانی دەکەین توشی هەمان هەڵە دەبین، کە لە پێناسە بازاڕییەکاندا، ساکس گوتەنی، تووشی بووین. ئەنجامگەری بەرەو ڕێژەگەریمان دەبات. یەک کردەوە لە شوێن و کاتی جۆراوجۆردا و بەپێی تاکە کەسەکانیش ئەنجامی جیاوازی لێدەبێتەوە. مادامەکی، لە ئەنجامگەرییدا چاکە و خراپەی کردەوەیەکیش دەکەوێتە سەر

(120) J. D. Mabbot, “Is Plato’s Republic Utilitarian?” in *Mind*, NSXLV1, 1937. Pp. 469-70.

(121) M. B. Foster, “A Mistake of Plato’s in the Republic,” in *Mind*, NSXLV1, 1937. Pp. 386-93.

(122) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی چوارەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 150.

ئەنجامەکەی، ئەگەر کارێکی نا دادوەرانە ئەنجامێکی چاکی هەبێت نادادوەرییەکەش بە چاک لە قەڵەم دەدرێت. ئەگەر کوشتنی کەسێک ئەنجامێکی چاکی لە دوابێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا کوشتنی ئەو کەسە بە کارێکی چاک دادەنرێت. لەبەر ئەمە دانانی کوشتن بە خراپ لەنێو هەموو بارودۆخێکدا دەبێت بە گرفتێکی ڕەوشتی. بەهەمان شێوە، ستانلی ڕۆزن لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەسەر کۆماری ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە هەوڵدانەکانی ئەفلاتون لە پێناسەکردنی دادوەرییدا خۆی بە بۆچوونێکی (یوتالیتێرییەنیزم) وە بەستۆتەوە و ئێمەش دەزانین، کە ئەم جۆرە فەلسەفەیە مامەڵەیەکی ئەنجامگەرانە لەگەڵ بەها و کردەوە ڕەوشتییەکاندا دەکات.(123)

ئەفلاتون لە پێناسەکردنی دادوەرییدا ئاماژەی بۆ دوو خاڵ کردووە: یەکەم دادوەری بە ئامانجەکەیەوە گرێداوە. دووەمیش بۆ دامەزراندنی دادوەری لە شارەکەیدا لێکچون یان ئەنەلۆجی لە نێون دەروونی مرۆڤ و دەوڵەتدا بەکارهێناوە.(124) لە خاڵی یەکەمدا، ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە دادوەری هەمیشە چاکەی لەدوایە و مرۆڤێکی دادوەریش چاک و چاکەکەرە. ئێمە لەسەرەوە باسی ئەم خاڵەمان کرد.

---

(123) Stanly Rosen, *Plato's Republic:A Study*, New Haven and London:Yale University Press, 2005. P. 33.

(124) ئەنەلۆجی یان شوبهاندن جۆرێکە لە بەڵگە، کە لەڕاستیدا بوونی هیچ شتێک ناسەلمێنێت، بەڵکو لە ڕێگەی لێکچونی نێوان دوو بابەت یان چەمکەوە چەمکێکی نەناسراو یان شتێکی نەزانراو دەدۆزینەوە. لەنێو ئایینەکاندا ئەنەلۆجی زۆربەکاردێت. بۆ نموونە کاتێک دەڵێین خوا باوکێکی مەزنە، شوبهاندن لەنێوان خوا و باوکدا، کە دوو بوونی جیاوازن دادەمەزرێنن.



لە خاڵی دووەمیشدا لێکچون لە نێوان دەروون و دەوڵەتدا دەردەخات. لەو باوەڕەدایە ئەگەر ئێمە مرۆڤێکی چاک و دادوەر پەروەردە بکەین، دەتوانین دەوڵەتێکی دادوەریش دابمەزرێنین. بێگومان جەختکردن لەسەر لێکچون لەنێوان دەروون و دەوڵەتدا لەسەر بەڵگە ڕانەوەستاوە و ئەفلاتونیش ئەم خاڵەی نەسەلماندوە. بێجگە لەمە مرۆڤ دەتوانێت چاک و دادوەرانە بژی بەبێ ئەوەی لەنێو دەوڵەتێکی چاک و دادوەرانەدا بێت. هەموو ئەوانەی لەژێر دەستەڵاتی دەوڵەتێکی نادادوەردا دەژین خراپ و نادادوەر نین. پەیوەندی نێوان دەوڵەتی دادوەر و مرۆڤی چاک (پێویست) دەرناکەوێت.

بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت دەوڵەتێکی دادوەر مرۆڤی چاک دروست ناکات، بەڵکو دەگونجێت مرۆڤی چاک لەنێو دەوڵەتی نادادوەر و خراپیشدا هەبێت. ئایا دادوەری دەروونی مرۆڤ چییە؟ یان مرۆڤی چاک چۆن پێناس دەکرێت؟ ئەفلاتون لەگەڵ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا دەروون و دەوڵەت پێکەوە دەبەستێتەوە و لێکچونیان دیاریدەکات. لەپێشتر باسمانکرد، کە دەروونی مرۆڤ سێ خانەی هەیە و هەر یەکێکێش لەو خانانە بە کاری خۆی هەڵدەستێت. خانەکانی دەروونیش؛ هۆش و گیان و ئارەزوو بوون. هەندێک لەوانەی لەسەر فەلسەفەی ئەفلاتونیان نوسیوە ئەم بۆچوونەی ئەفلاتون لەگەڵ سایکۆلۆجی شیکاری فرۆید بەراورد دەکەن. نیکۆلاس پاپاس، بۆ نموونە بەرانبەر ئەم سێ بەشەی دەروون (خۆی بەرز)، (خۆ) و

ئارەزوو (ئید)ی فرۆید دادەنێت.(125) بە ڕادەیەک ئەم بەراوردکردنە ڕەوایە و کارێکی دروستە، بەڵام جیاوازییەکی گەورە لەنێوان هۆش و خۆی بەرزدا هەیە و ئەفلاتونیش وەکو فەیلەسوفێک نەک دەروونناس مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا دەکات و لەئاستی دابەشکردنەکەدا نەوەستاوە. لەوێوە بەرەو فەلسەفەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی دەڕوات و لە دەوڵەتی دادوەر دەدوێت. فرۆید ئەم زیادەڕۆیییەی نەکردووە و بەشەکانی دەروونی بە چین و دەستەی کۆمەڵەوە نەبەستۆتەوە. بە دیدی من، بۆچوونەکەی ئەفلاتون لە فەلسەفەی ڤێدەنتاوە نزیکە نەک سایکۆلۆجی شیکاری فرۆید. هەرچەندە ئێمە نازانین ئەفلاتون شارەزایی لە فەلسەفەی ڤێدەنتا هەبووە یان نا چونکە لەهیچ نوسراوێکیدا باسی ئەم جۆرە فەلسەفەیە و شارستانیەتی هیند ناکات. بەڵام، وەکو هیندییەکان چینەکانی کۆمەڵ بۆ دەروون دەگەڕێنێتەوە، کەلەم بەشەدا ڕوونی دەکەمەوە.(126)

(125) Nicolas Pappas, *Plato and the Republic*, second edition, London, Routledge, 2003. P. 85.

(126) لە فەلسەفەی ڤێدەنتادا دەروونی تاکەکان، وەکو ئەتۆمی گیانەکی بچوک لە خواوە دەرچوون. ئەم دەروونە ئەتۆمییانە پاش دەرچوونیان بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێکی دابەشکراو بەسەر جۆری جیاوازی دەروونددا. ئەو ئەتۆمانەی لەسەر سنگ و سک و پێی خواوە دەرچوون چینی جیاوازیان دروستکردوە. بۆ نموونە، بەرزترین چینی کۆمەڵ ئەو دەروونانەن لەسەری خواوە دەرچوون و لەنێو کۆمەڵدا بوون بە (براهمەن)و نزمترین چینی کۆمەڵیش لەو دەروونانە پێکهاتوە لە پێی خواوە دەرچوون و بە (شودراس) ناوزەد دەکرێن. لەنێوان ئەم دوو چینە بەرزو نزمەدا دوو چینی دیکەش هەن، سەر بەو دەروونانەن لە سنگ و سکی خواوە دەرچوون.



بەشەکانی دەروون تەوانایی و کاری خۆیان پێدراوە. هۆش بیردەکاتەوە و گیان سەرچاوەی سۆزە و ئارەزووش ڕوو لە تێرکردنی برسێتی و تینوێتی و سێکس دەکات. ئەم بەشانەی دەروون بە کاری یەکدی هەڵناسن. ئارەزوو ناتوانێت لە جێگەی دەروون بیربکاتەوە و گیانیش ناتوانێت کەسێکی برسی تێر بکات یان هەڵچونی سێکسی دابمرکێنێتەوە. ئەگەر بەشەکانی دەروون پەیڕەوی (دابەشکردنی کار) لەنێوان خۆیاندا نەکەن، شیرازەی کەسایەتی مرۆڤ دەشێوێت. لە هەمانکاتدا هەر یەکێک لەم بەشانە زیادەڕۆیی بکات و بەشەکانی دیکە بەزۆر بە لای خۆیدا ڕاکێشێت هاوئاوازی نێوانیان تێکدەچێت. ئەو کەسە توشی نەخۆشی دەروونی دەبێت و دەبێت بە ناتەندروست. هەر یەکێک لەم بەشانە خاوەنی جۆرێکە لە چاکە. بە هاوسەنگکردنیان کەسایەتییەکی تەندروست و دادوەر دروست دەبێت؛

> لە ڕاستیدا دادوەری بەم جۆرەیە. بەهەرحاڵ، پەیوەندی بە ناخی کەسەکانەوە هەیە. بەوەی، کە ئەو کەسە خۆیەتی و خاوەنی ئەو شتەیە، کە بە (سروشت)پێی دراوە. دادوەر ڕێگە نادات بەشێکی (بوونی) کاروباری بەشێکی دیکە بەڕێوە بەرێت یان کار و ئیشی بەشەکان تێکەڵاو بن. ئەوەی بۆ ئەو دانراوە ڕێکی دەخات و سەرپەرشتی دەکات. خۆی ڕێک دەخات و هەرسێ بەشەکانی دەروونی، وەکو سێ جۆری نۆتەی مۆسیقا

بەرز و نزم و مامناوەندی بەگوێرەی پێوەرەکە هاودەنگ ڕیزدەکات.
بەم جۆرە کارەکانی بە ئاکام دەگەیەنێت. لە هەموو کارەکاندا؛ بازرگانی، بایەخدان بە لەش، کاری ڕامیاری، یان پیشە تایبەتییەکان خۆی دادوەرانە هەڵسوکەوت دەکات و بە زانیارییەکی تەواوەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.
لەو باوەڕەدایە ئەو کارانەی هاوئاهەنگییەکە دەشێوێنێت نا دادوەرانەیە. ئەو زانینەی پشتگیری (نادادوەرییەکەش) دەکات نەزانینە.(127)

دادوەری لە ژیانی تاکە کەسدا هاوئاهەنگییە لەنێوان بەشەکانی دەرووندا. مرۆڤی چاکیش ئەو کەسەیە لەم هاوئاهەنگییەدا ڕوو لە چاکەی هەر یەکێک لە بەشەکانی دەروونی دەکات. لە ڕوانگەی ئەم شیکردنەوەیەوە و تێگەیشتن لە دادوەری تاکە کەسەوە ئەفلاتون فەلسەفە ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکەی دادەمەزرێنێت و نەخشەی دەوڵەتێکی دادوەرمان دەخاتە بەردەست، کە بە بیروڕای ئەو مرۆڤ لەژێر سایەیدا بەختەوەرانە دەژی و مافەکانی مسۆگەر دەکات.
لە لێکچونی نێوان دەروون و دەوڵەتیشەوە بەو ئاکامە دەگەین، کە سێ چین لەنێو کۆمەڵدا هەن چونکە دەروون خاوەنی سێ بەشە.

(127) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی چوارەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال. ل 149.



چینەکانی کۆمەڵیش لەنێو دەوڵەتەکەدا کاری تایبەتیان پێدەدرێتێ یان کارکردن بەگوێرەی تەوانایی خۆیان، کە بەسروشت پێیان بەخشراوە، بەرسەیاندا دابەشدەکرێت.
لێرەدا ئەفلاتون وەکو مارکس سەرهەڵدانی چینایەتی بە دابەشکردنی کارەوە دەبەستێتەوە. بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان هەردووکیاندا لەم بۆچوونەدا هەیە. بۆ ئەفلاتون دابەشکردنی کار دەبێتە هۆی زۆرکردن و چاککردنی بەرهەمهێنان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دادوەرانە. بۆ مارکس، هەرچەندە دابەشکردنی کار بەرهەم زۆردەکات هەمان کات بناخەی سەرهەڵدانی کۆمەڵێکی چینایەتییە و دەبێت بە سەرچاوەی چەوساندنەوەی چینایەتی و دواجاریش سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی نادادوەر.(128)
هەروەها مارکس لە پەرتووکی (سەرمایە)دا ڕەخنە لە ئەفلاتون بۆ بەستنەوەی دابەشکردنی دەروون بە چینەکانی کۆمەڵەوە دەگرێت و لەو باوەڕەدایە دەروون یان سایکۆلۆجی نابێت بە بنەمای سەرهەڵدانی چینە ئابوورییەکانی کۆمەڵ. هەروەها، بۆچوونەکانی ئەفلاتون بۆ دابەشکردنی کۆمەڵ بەسەر چینەکانەوە بەکاریگەرێتی شارستانییەتی میسر دادەنێت، کە لەو کاتەدا میسر لە ڕووی ئابووری و پیشەسازییەوە پێشکەوتوو بووە و یۆنانییەکان بە نموونەیەکی

(128) Karl Marx, *Capital*, vol.1, Moscow: Progress Pulisher, 1986. P. 339

بەرزیان داناوە.(129) ئەگەر ئێمە کۆمەڵ لەسەر نموونەی بەشەکانی دەروون بەسەر چینەکاندا دابەش بکەین و هەریەکیک لەم بەشانە کاری تایبەتی خۆی بە سروشت پێدرابێت ئەوا ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکاری لەنێوانیاندا دروست نابێت. ئەمەش دەبێتە بنەمایەک بۆ لەناچارەکی و بەستنەوەی سەربەستی تاکەکان لەبەردەم وازهێنان لە چینەکەی خۆیان و هەڵبژاردنی چینێکی دیکە. ڕووبەڕووی ڕاڕەوی ناچارەکی دەبینەوە. ناچارەکییەک، کە مارکسیش دژی ڕادەوەستێت. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاڕەوە ناچارەکییەدا لەناوچوونی کۆمەڵگای چینایەتی مەحاڵە و هەرگیز بەو کۆمەڵگایە لە داهاتوودا ناگەین، کە مارکس بە دادوەر و لە چین بەدەری دادەنێت و بەختەوەری مرۆڤی تێدا مسۆگەر دەکات. مارکس سەبارەت کۆمەڵگای لە چین بەدەر یان کۆمۆنیزمەوە دەڵێت، "ئەم کۆمەنیزمە سروشتگەرییەکی پێشکەوتووە و لەگەڵ مرۆڤایەتیدا یەکسان ڕادەوەستێت؛ چارەسەرکردنێکی ڕەسەنی ناکۆکییەکانە لەنێوان مرۆڤ و سروشت و مرۆڤ و مرۆڤدا، چارەسەرکردنێکی ڕەسەنە بۆ دژایەتی نێوان بوون و ناوەڕۆک و بابەت بوونی دەروون و سەربەستی و پێویستیدا و لەنێوان تاک و جۆرەکەیدا.

(129) ئەگەر ئێمە (پیشەسازی) بە قۆناخی تازەگەری و سەرهەڵدانی زانستەکانەوە لە ڕۆژئاوا ببەستینەوە ئەوا بەکارهێنانی ئەم چەمکە بۆ شارستانییەتی کۆنی میسرییەکان دەشێ گونجاو نەبێت، بەڵام مارکس خۆی چەمکی (پیشەسازی) لە نوسراوەکەیدا بۆ میسرییە کۆنەکان داناوە و من بەکارم نەهێناوە. بروانە:هەمان سەرچاوە،ل 345 – 46.



کۆمۆنیزم مەتەڵێکی ئاشکرابووی مێژووە و خۆی بە ڕێگەچارە دادەنێت."(130) بە پێچەوانەی فەلسەفەی ڕامیاری مارکسەوە، لە کۆماری ئەفلاتوندا جیاوازی چینایەتی بنەمای پێشکەوتنی ئابووری و دادوەرییە. تاکەکانیش لەنێو چینەکاندا پەیدادەبن و دەمرن، بەبێ ئەوەی بتوانن گۆڕانکاری لەو شێوازی بوونەیاندا دروست بکەن. لە فەلسەفەی ڤێدەنتاشدا تاکەکانی نێو  کۆمەڵ لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە ئاڵوگۆڕ ناکرێن. کەسێک لەنێو خێزانێکی براهیمدا لە دایک بێت بۆ هەمیشە براهیمی دەبێت و منداڵی خێزانی شودراسیش بە شودراسی دەمێنێتەوە. ئەمەش بەو سروشتە یان تەوانا زکماکییەوە بەستراوە ئەفلاتون و هیندییەکان لە بۆچوونە سایکۆلۆجییە مێتافیزیکییەکەیاندا ئاماژەیان بۆ کردووە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم بۆچوونە دەستەڵاتێکی نەگۆڕو لەبن نەهاتوو بەچینێکی کۆمەڵ بە فەرمانڕەوا دەبەخشێت، کە دەبێتە سەرچاوەی دامەزراندنی دەستەڵاتێکی ڕامیاری سەرکوتکەر، لەلایەن ئەو چینەوە و ڕێگەنەدان بە چینەکانی دیکە بۆ بەشداری کردنیان لە دەستەڵات و دەستگاکانی دەوڵەتدا. لەم ڕووەوە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئەفلاتون و مارکسدا نابینین. هەردووکیان دەستەڵاتی ڕامیاری بە چینێکی کۆمەڵ دەدەن. بەڵام جیاوازی نێوانیان لەگەڵ بنەمای سەرهەڵدانی چینایەتییدا سەرهەڵدەدات. مارکس، بە پێچەوانەی ئەفلاتونەوە،

(130) Karl Marx, *Economic and philosophical Manuscripts of 1844*, Moscow: Forig Language Publishing House, 1956. P. 102.

بنەمایەکی مێتافیزیکی سایکۆلۆجی بۆ چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ دانانێت و ڕێگەی گواستنەوەی تاکەکان لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە ناگرێت و هەوڵیش بۆ لەناوبردنی جیاوازی چینایەتی دەدات. مارکس تاکە بیریار نیە ڕەخنەی لەم لایەنەی فەلسەفەی ڕامیاری ئەفلاتون گرتبێت. بیریارە لیبراڵەکانیش لە ئاستی ئەفلاتوندا توشی کێشەبوون و ناڕەزایی خۆیان دەربڕیوە. کارڵ پۆپەر لەو باوەڕەدایە (کۆمار)ەکەی ئەفلاتون بە(تۆتەلیتار) ناوزەد دەکات، کە تیایدا سەربەستی تاکەکان داگیر دەکرێت و دەستەڵات لەژوور مافەکانیانەوە دادەنرێت.(131)

ئەوەی شایەنی باسە و پێویستە ئاوەڕی لێبدرێتەوە، هەڵوێستی ئەفلاتونە لە ئاستی دابەشکردنی کار بەسەر ژن و پیاودا. ئێمە دەزانین دابەشکردنی کار بەسەر ژن و پیاودا بووە بە بناخەی دەستگای خێزان و چەوساندنەوەی ژن. تەوانایی بوونی ژنی بە کاری ناوماڵ و منداڵ دروستکردن و بەخێوکردنەوە بەستۆتەوە. ئەو بوارە تەسکە ڕێگەی پێنەداوە لە دەرەوەی سنوری خێزان پرۆژەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت. ئەمەش بۆتە هۆی کەمکردنەوەی دەستەڵاتی ژن و تەوانای هەڵسوڕانی کارەکانی لە دەرەوەی سنوری خێزان. ئەفلاتون باوەڕی بە دابەشکردنی کار لەنێوان ژن و پیاودا نیە. هەموو بەڵگە کۆمەڵایەتی و بایۆلۆجییەکان بۆ کەمکردنەوەی تەوانا و دەستەڵاتی

(131) Karl R. Popper, *The Open Society and its Enemies*, vol.1, London: Routledge and Kegan Paul, 1977. P. 87.



ژن لەنێو کۆمەڵدا ڕەتدەداتەوە. بانگەشەی یەکجۆری فێربوون و پەروەردە بۆ هەردوو توخمە(جنسە)کە دەکات. هیچ ڕێگرێکی سروشتی لەبەردەم ژندا بۆ فێربوونی ئەو زانستانەی پیاو دەیخوێنن یان کاری ڕامیاری و مەشقی سەبازی دانانێت. دابەشکردنی کار لەنێوان ژن و پیاودا کەلتوورییە نەک سروشتی. کۆمەڵ دابەشکردنەکەی هێناوەتەکایەوە وجۆرە کارێکی بە ژن سپاردووە، کە بۆتە هۆی کەمکردنەوەی تەواناو دەستەڵاتی. ئەم بۆچوونەی ئەفلاتون وابەستە بە بیردۆزە سایکۆلۆجییەکەی و دابەشکردنی دەروون. لەپێشتر باسمانکرد، کە چینەکانی کۆمەڵ یان دابەشکردنی کار لەسەر ئەم بیردۆزە سایکۆلۆجییە ڕادەوەستێت. بەڵام ئەفلاتون دوو جۆر سایکۆلۆجی(بۆ ژن و پیاو) بە جیا دانەناوە. دابەشکردنی دەروون بەسەر(هۆش و گیان و ئارەزوو)دا بوونی ژن و پیاو بە یەکسانی دەگرێتەوە. ئەمەش جیاوازی هۆشەکی، گیانەکی یان ئارەزوو لەنێوان ژن و پیاودا دەسڕێتەوە. پیاو لە ژن تێگەیشتوتر یان ئازاتر دانانێت. هەردووکیان بە سروشت خاوەنی ئەم بەشانەی دەرونن. ئەگەر پیاو بتوانێت ببێت بە فەیلەسوف و فەرمانڕەوایەکی دادوەر یان سەربازێکی جەنگاوەری لێدەرچێت ژنیش بەهەمان شێوە ئەم جۆرە تەواناییانەی تێدایە و دەتوانێت فەرمانڕەوایی بکات یان بۆ پاراستنی وڵاتەکەی فێری مەشقی سەربازی ببێت و لە جەنگدا بەشداری بکات. ئەفلاتون پێشنیاری ئەوەش دەکات (زمان) گۆڕانی بەسەردا بێت و خۆی لەژێر

کاریگەرێتی باوک سالارییدا ڕزگار بکات؛ دوو شێوازی ڕێزمان بۆ مێینە و نێرینە بەکار نەیەت و شێوازێکی بێ لایەن بێتەکایەوە.(132) باشترین نموونەی بەردەست بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە زمانی عەرەبییە، کە یەکێکە لەو زمانانەی کەلتووری باوک سالاری تیایدا باڵادەستە.

لەم زمانەدا ئەو کاتەی کەسێک لەگەڵ کۆمەڵێک ژندا دەدوێت و لەنێویاندا پیاوێک هەیە، شێوازی ڕێزمانی نێرینە بۆ دەربڕینەکەی بەکاردەهێنێت و بە جۆرێک دەدوێت، کە ئەوانەی بەرانبەری هەموو پیاوبن و بوونی ژنەکان ناخوێنێتەوە. ئەگەر ئێمە لەوێدا ئامادە نەبین یان تەنیا گوێمان لە دەنگی بێت، واهەست دەکەین بەرانبەر کۆمەڵێک پیاو دەدوێت و جێگە بۆ ژن ناکاتەوە. ئەمەش بێگومان پەیوەندی بە کەلتووری باوک سالاری عەرەبەوە هەیە و من نامەوێ لێرەدا بە درێژی لەسەری بکۆڵمەوە. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە هەڵوێستی ڕەتدانەوەی ئەفلاتونە بەرانبەر ئەم شێوە زمانە.(133) ئاوەڕدانەوەمان لە ژیانی کۆمەڵایەتی یۆنانییەکان لە سەردەمی ئەفلاتوندا و بەتایبەتی شاری ئەسینا بۆمان دەردەکەوێت ژن لەو شارەدا بە هاووڵاتی پلەی دوو دانراوە. لە تەمەنێکی زۆر بچوکدا بە مێرد دراوە، مێردەکەشی زۆربەی

(132) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 256.

(133) زمان دەستکردی کەلتوورە و لەنێو بۆشاییدا پەیدا نابێت. پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە جۆری بیرکردنەوە و ژیانی ئەو کۆمەڵەوە هەیە کە بەکاریدەهێنن. باوک سالاریش، یەکێکە لە دەستەڵاتە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرێتی بەسەر زمانەوە هەیە. ئەم کاریگەرێتییە لەو زمانانەدا، کە جیاوازی گوتن لەنێوان مێینە و نێرینەدا دادەنێن، باشتر دەردەکەوێت.



کات سێ تا چوار جار لەخۆی بە تەمەن گەورەتر بووە. بێجگە لە منداڵ دروستکردن و کاری ناوماڵ ژیانی چی دیکەی نەبووە. تەنانەت بە تەنیا و بەبێ پیاو نەیتوانیوە خاوەنی موڵک و سامان بێت. ئەفلاتون بە هاوتەراز کردنی تەوانای سروشتی و پلەی کۆمەڵایەتی نێوان ژن و پیاو سەردەمەکەی خۆی ڕەتدەکات و لەنێو سیستەمە ڕامیارییە دادوەرییەکەیدا تەوانا و ڕۆڵی ژنی لە پەراوێزدا دانەناوە و بایەخی پێداوە. دادوەری لە دەروونی تاکە کەسێکدا دەکەوێتە سەر هاوئاهەنگی نێوان بەشەکان و هەر یەکێکیش لە بەشەکان چاکەی خۆی هەیە. چاکەی هۆش لە تێگەیشتن، گیان لە ئازایەتی و ئارەزووش لە خۆڕاگرتندایە. هەر یەکێکیش لە بەشەکانی دەروون پەیوەندی بەچینێکی کۆمەڵەوە هەیە. بەو جۆرەی بەشەکانی دەروون دەبنە هۆی سەرهەڵدانی چینەکانی کۆمەڵ، چاکەکانی ئەم بەشانەش دەبن بە چاکە بۆ چینەکان. بەم شێوەیە پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەنێوان فەلسەفەی ڕامیاری و ڕەوشتدا دادەمەزرێت. ڕامیاری بەبێ ڕەوشت و بەها ڕەوشتییەکان لە کۆمارەکەدا نادۆزرێتەوە. ڕەوشت دەبێت بە پێوەرێک بۆ ڕامیاری و هەڵسەنگاندنی چۆنیەتی فەرمانڕەواییکردن. ئەمەش لە خۆیدا یەکێتییەک لە بیرکردنەوەی ئەفلاتوندا دەردەخات. ئێمە لەپێشتر ئەو خاڵەمان ڕوونکردەوە، کە مێتافیزیک و سایکۆلۆجی لەم سیستەمەدا لە یەکدی جیانابنەوە و ئێستاش پاش بەستنەوەی ئەم دوولایەنە بە یەکدییەوە، ڕامیاری و

رەوشت پێکەوە گرێدەدەین. ئەمانیش بۆ میتافیزیک و سایکۆلۆجی دەگەڕێنینەوە. بۆ ئەوەی لە فەلسەفەی ڕەوشتی ئەفلاتون تێبگەین، دەبێت بۆ فەلسەفەی ڕامیاری و لەوێوە بۆ سایکۆلۆجی و مێتافیزیکەکەی بگەڕێینەوە. ئەم پەیوەندییە لەنێوان ئەم لایەنانەدا دەستنیشانی سیستەمێکی سەرتاپاگیری فەلسەفیمان بۆ دەکات، کە ئەم بیرە دایمەزراندوە. پاش ڕوونکردنەوەی واتای دادوەری و چاکە لە ژیانی تاکە کەسدا، دێینە سەر دادوەری و چاکە لە ڕژێمی ڕامیاری کۆماردا. لەو باوەڕەوە، کە دامەزراندنی دادوەری و چاکە لە ژیانی تاکە کەسێکدا کارێکی گونجاوە، بەو ئاکامە دەگەین، کە دەتوانرێت بیر لە دەوڵەتێک یان ڕژێمێکی ڕامیاری دادوەر بکرێتەوە و هاووڵاتیان بەختەوەرانە تیایدا بژین. لەم پێگەیەشەوە سێ چین بەرانبەر بەشەکانی دەروون لەنێو کۆمەڵدا دادەنێرت؛ بەرانبەر هۆش فەرمانڕەواکان، گیان سەربازەکان و ئارەزووش بەرهەمهێنەرەکان (جوتیار، کرێکار و هەموو ئەوانەی پیشەی دەستییان هەیە) ڕیزدەکرێن. لە دەروونی مرۆڤیشدا هۆش لەنێو سەردایە، کە بەرزترین ئەندامی لەشە و گیان لەنێو سنگ و ئارەزووش لەنێو سک یان بەشی خوار سنگەوەیە و نزمترینە. بەگوێرەی ئەمەش چینە کۆمەڵایەتییەکان لە پلەی بەرز، ناوەڕاست و نزمدا دادەنرێن. ئەو مرۆڤانەی لە ژیانیاندا هۆش دەستەڵاتمەدارە و پەیڕەوی هۆش دەکەن چینی بەرزن. ئەوانەی سۆز و ئازایەتی داگیری کردوون چینی ناوەڕاست و ئەوانەی



ژێردەستەی ئارەزووەکانیان چینی نزم پێکدەهێنن. بۆ ناسینەوەی ئەم مرۆڤانە لە بەشی حەوتەمی (کۆمار)دا، ئەفلاتون لە میتافۆری ئەشکەوتەکەیەوە توێژینەوەکەی دەخاتە گەڕ. لە سەرەتاوە دەیەوێت ئەو مرۆڤانەمان پێبناسێنێت، کە چینی بەرزی کۆمەڵ دروستدەکەن و لە سەقامگیرکردنی دادوەری و مسۆگەر کردنی بەختەوەری بۆ هاوڵاتیان بەرپرس دەبن. ئەم مرۆڤانە خاوەنی دەستەڵاتی هۆشەکین و لەنێو دۆگمای ئەشکەوت خۆیان ڕزگاردەکەن. ڕوو لە ڕووناکی و ڕاستی دەکەن. ئەو فەیلەسوفە ڕاستی ناسانەن، کە شیاوی فەرمانڕەوایین، دەبێت دەستەڵاتی ڕامیاری بگرنە دەست و کۆمارەکە بەڕێوە بەرن. ئەفلاتون لەم بارەیەوە دەڵێت؛

> کەوابوو، گلاوکۆن، تەماشاکە. ئێمە خراپەمان بەرانبەر فەیلەسوفەکانمان نەکردووە. دەمانەوێت ئەوان ئاگایان لە هەموو کەسێک بێت، ئەمەش دادوەرییە. ئێمە دەڵێین: لە شارەکانی دیکەدا فەیلەسوفەکان زۆریان لێناکرێت کاری ڕامیاری بکەن. ئەمە دروستە، چونکە ئەوان خۆیان پێدەگەیەنن و دەوڵەت بایەخیان پێنادات. ئەوەی خۆی پێدەگەیەنێت ڕێز لەو کەلتوورە ناگرێت، کە تیایدا بێگانەیە. ئیمە ئەم فەیلەسوفانەمان هێناوەتەکایەوە و پەروەردەمان کردوون بۆ بەڕێوەبردنی[شار] ئامادەکراون.(134)

(134) ئەفلاتون ، کۆمار، بەشی حەوتەم، وەرگێڕانی د. محەممەد کەمال، ل 233.

هەروەها دەڵێت؛

تاکو فەیلەسوفەکان، وەکو پاشا فەرمانڕەوایی نەکەن یان فەرمانڕەواکان خەریکی فەلەسەفەکاری نەبن، فەلسەفە و دەستەڵاتی ڕامیاری یەک نەگرن، گلاوکۆن، شارەکان و ڕەگەزی مرۆڤیش لە خراپە ناپارێزین.(135)

هەرچەندە ئەم چینە فەرمانرەوایە بە سروشت خاوەنی ئەو تەوانایەن فەرمانڕەوایی بکەن و ڕاستی ناسن و خاوەنی زانینن، کە تاریکی و ڕووناکی، چاکە و خراپەی پێ جیادەکەنەوە، هێشتا پێویستیمان بە بەرنامەیەک هەیە تاکو باشتر پەروەردە بکرێن و بۆ فەرمانڕەوایی ئامادە بن. بەرنامەکەش دەبێت بە جۆرێک دابنرێت ئەم مرۆڤانە بە ڕاستی بناسێنێ و بیان کات بە کەسانی چاکیش. بەرنامەی فێربوون بەبێ گۆرانکاری لە کەسایەتی تاکەکاندا و گەشەکردنیان بەرەو چاکە بێ سودە. زانین تەنیا ناسینەوەی دیاردەیەک یان ڕاستییەک و بەراوردکردنی لەگەڵ ناڕاستیدا نیە. لەگەڵ پرۆسەی فێربوون و زانییندا تاک دەبێت بەردەوام بگۆڕێ و ببێت بە کەسێکی چاکتر.

ئەفلاتون لە دایەلۆگی(کۆمار)دا بەگوێرەی تەمەن بەرنامەی پەروەردەی بۆ منداڵان داناوە. بەرنامەکە بە خوێندنی ماتماتیک و ئەدەب و وەرزش دەست پێدەکات. بەڵام لە قۆناخی سەرەتاییدا بایەخی زۆرتری بە وەرزش و پەروەردەی لەش داوە

(135) هەمان سەرچاوە، ل 182.



تاکو منداڵان لەفێربوون بێزار نەبن.

پاش دوو یان سێ ساڵ ئەو منداڵانە هەڵدەبژێرێت، کە خولیای ماتماتیک یان زانستە بیرکارییەکانن و تاکو تەمەنی بیست ساڵان دەخرێنە بەر بەرنامەی فێربوون و خوێندنی ئەم زانستانە. لە تەمەنی سی ساڵیشدا جارێکی دیکە ئەو خوێندکارانە لەوانی دیکە جیادەکرێنەوە، کە بوون بە خاوەنی ڕوانینێکی گشتگرانە و ڕێگەی بیرکردنەوەی دیالێکتیان گرتۆتە بەر و(هۆش) لە ژیانیاندا دەستەباڵایە؛

بیر لەم خاڵەش بکەوە؛ ئەوانەی خاوەنی ئەم ڕوانینە گشتگیرەن بەردەوام فێردەبن. واز لە خوێندن ناهێنن. لە کاری سەبازی و ئەرکەکانی دیکەدا لێهاتون و تەمەنیان سی ساڵانە. لەنێو دەستەکەی خۆیاندا هەڵیان دەبژێن و ڕێزی زۆرتریان لێدەنێین. تۆش بە ڕێگەی دیالێکتیکەوە تاقیان دەکەیتەوە. هەوڵدەدەیت بزانیت کێ لە ئەوان دەتوانێت گوێ نەداتە هەستەکانی و بەبێ هەستەکانی ڕاستی بدۆزێتەوە.(136)

خوێندنی فەلسەفە لە تەمەنی لاوێتییەوە دەست پێدەکات. ئەمەش پەیوەندی بە تەوانایی مرۆڤ بۆ فێربوون و گەڕان بە دوای دۆزینەوەی ڕاستی لەو تەمەنەدا هەیە. هەروەها مرۆڤ لە تەمەنی لاوێتیدا خولیای گەڕانی زۆرترە و دەیەوێت لە هەموو شتێک تێبگات. ئەفلاتون ئەم

(136) هەمان سەرچاوە، ل 252.

هەڵوێستەی لاوانی بۆ فێربوون لەگەڵ ئەو توتەڵە سەگانە بەراوردکردووە، کە (حەزدەکەن پەلاماری هەموو شتێک بدەن و بە دان بیدڕن).(137) بۆ ئەوەی لاوانیش توشی هەڵە نەبن پێویستە بەردەوام سەرپەرشتی بەرنامەی فێربوون و پەروەردەکردنیان بکرێت.

پاش تەواوکردنی خوێندنی فەلسەفە، کە پێنج ساڵی بۆ دانراوە، ئەم لاوانە بۆ ناو کۆمەڵ دەگەڕێنەوە و ڕۆڵی مێژوویی خۆیان دەبینن. بەڵام لەم تەمەنەدا، کە لەنێوان سی و پێنج و چل ساڵیدان شیاوی ئەوە نین دەستەڵات بگرنە دەست. دەبێت بۆ چەند ساڵێک چاوەڕوان بن و لە تاقیکردنەوەیەکی دیکەشدا، کە بۆیان دادەنرێت سەرکەوتوو بن. دوای تەواوکردنی خوێندنەکە دەبێت بۆ نێو ئەشکەوتەکە بگەڕێنەوە. کاروباری نێو ئەشکەوتەکە و جەنگ بگرنە دەست. لەم رووەوە لە ئەزموندا لەوانی دیکە کەمتر نابن. بەڵام بۆ ئەم کارەش دەبێت تاقی بکرێنەوە. پێویستە بزانین تاکو چ ڕادەیەک خاوەنی تەواناییین.(138)

لە ڕاستیدا نازانین لەم قۆناخەدا و پاش تەواوکردنی خوێندنی فەلسەفە و گەڕانەوە بۆ ناو کۆمەڵ چ جۆرە تاقیکردنەوەیەک بۆ لاوەکان دادەنرێت. ئەفلاتون ئەم خاڵەی ڕوون نەکردۆتەوە. بەڵام دەیەوێت ئاماژە بەوە بدات، کە کەسێک لەو تەمەنەدا بەبێ هەڵسەنگاندنی زانین و ئەزمونەکانی نابێ دەستەڵاتی فەرمانڕەوایی

(137) هەمان سەرجاوە، ل 255.

(138) هەمان سەرچاوە.



پێبدرێت. دەستەڵات پێویستی بە کەسێکی زانا و خاوەن ئەزمونی بە تەمەنە. ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەوەیە، ئایا لە چ تەمەنێکدا فەیلەسوفە پەروەردەکراوەکان دەتوانن ببن بە خاوەن دەستەڵات و لە کۆمارەکەدا فەرمانڕەوایی بکەن؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەگەڕێمەوە بۆ دایەلۆگی کۆمار و ئەفلاتون لەسەر زاری سوکرات دەڵێت؛

**ئەم کارە چەند دەخایەنێ؟**

**پانزە. لەم حاڵەتەدا ئەوانەی لە تاقی کردنەوەکاندا سەردەکەون تەمەنیان پەنجا ساڵە و لە ژیانی کردەکی و بیرکردنەوەدا سەرکەوتوون. دەبێت تیشکی دەروونیان بە دەرەوە بگەیەنن. پاش ناسینی چاکە پێویستە لەسەریان شارەکە و هاووڵاتیان بەڕێوەبەرن. هەر یەکێک لەوان زۆربەی ژیانی بە فەلسەفەوە خەریک دەکات. کاتێک سەرەی هات دەبێت دەست بداتە کاروباری ڕامیاری و فەرمانڕەواییکردنی شارەکە.**(139)

ئەرکی فەرمانڕەوایی تەنیا بە فەیلەسوفە پیاوەکان نادرێت. ئەم لاوانەی بۆ فەرمانڕەوایی پەروەردە دەکرێن و دەبن بە فەیلەسوف ژن و پیاون. ئەفلاتون باوەڕی بە جیاوازی نێوان ژن و پیاو بۆ فێربوون و فەرمانڕەوایی نیە؛

(139) هەمان سەرچاوە.

سوکرات تۆ پەیکەرێکی بێگەردو جوانت بۆ پیاوە فەرمانڕەواکان داتاشیوە.

ئەمە بۆ ژنانی فەرمانڕەواش دەکەین. واتێنەگەیت، کە من ئەو مافە تەنیا بە پیاو دەدەم و بە ژنی نادەم.

ڕاستە، ئەگەر لەگەڵ پیاودا یەکسان بن بەو جۆرەی باسی دەکەیت هەمان مافیان دەدرێتێ.(140)

ئەفلاتون لەو سەردەمەدا، ئەم بیرکردنەوە گەش و پێشکەوتنخوازەی بەرانبەر یەکسانی ژن و پیاو هەبووە. لە کۆمارەکەیدا جیاوازی نێوانیانی لە بوارە فەلسەفەی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکاندا سڕیوەتەوە و ژنی بە هاووڵاتی پلەی یەکەم داناوە. ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەریستۆوەیە سەبارەت بوونی ژن. ئەریستۆ خوێندکاری ئەفلاتون بووە و پاش ئەفلاتون گەشەی بە فێرگە فەلسەفییەکەی خۆی داوە، بەڵام دەردەکەوێت کاریگەرێتی ئەفلاتون بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم خوێندکارەوە زۆرکەم بێت. لەم نموونەیەدا، ئەریستۆ یەکسانی نێوان ژن و پیاو ڕەتدەداتەوە و

(140) هەمان سەرچاوە ،ل 256 . هەروەها بڕوانە بەشی پێنجەمی هەمان سەرچاوە. حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەم، کە (ناسینی چاکە) بۆ ئەفلاتون ناسینی بەرزترین ڕاستییە و سەرچاوەیەکی مێتافیزیکی هەموو فۆرمەکانی نێو ئەم جیهانەیە. فەیلەسوفی فەرمانڕەوا لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤێکی (خوا)ناسەو بەو ڕاستییە گیشتوە. ئەمەش فەیلەسوف دەخاتە ڕیزی پێغەمبەرانەوە. فارابی لە نوسراوەکەیدا (مبادی آراء آهل المدینة...) جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردوە. لەو باوەڕەدایە فەرمانڕەوا دەبێت خاوەنی زانینی پیرۆز بێت. ئەم بیریارە موسوڵمانە لەژێر کاریگەرێتی ئەفلاتون و نەریتی فەلسەفی ئەفلاتونییەتی نوێدا پەرتووکەکەی نوسیوە.



لەوباوەڕەشدایە ژن لە ڕووی دەستەڵاتی هۆشەکی و بیرکردنەوەی هۆشەکییەوە لە پیاو کەمترە و بە سروشت ئەم دەستەڵاتەی پێنەدراوە.(141)

لەبەر ئەم هۆیە، بە دیدی ئەریستۆ، ژن بۆ هەڵسوڕانی کاروباری ڕامیاری یان فەرمانڕەوایی لەبار نیە. حەزدەکەم ئەوەش بڵێم، کە بۆچوونی پێشکەوتنخوازانەی ئەفلاتون لە کۆماردا لەگەڵ بۆچوونی دایەلۆگی (تیمایۆس)دا نەکۆکە. لەم دایەلۆگەدا ژن بە کەمتر لە پیاو دانراوە و گوایە ئەو پیاوانەی لە ژیاندا ترسنۆکانە دەژین پاش مردن جارێکی دیکە بە ژنی دەگەڕێنەوە ژیان یان دەبن بە ژن.(142)

ئەفلاتون بلیمەتترین فەیلەسوف لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا لەنێو فەیلەسوفەکانی دیکەدا بۆ فەرمانڕەوایی کۆمارەکەی هەڵدەبژێرێت. ئەم فەیلەسوفە دەبێت بە سەرۆکی ئەنجومەنی فەیلەسوفەکان، کە هەموویان پێکەوە دەوڵەتەکە بەڕێوە دەبەن.

ئێمە چۆن بزانین فەیلەسوفە فەرمانڕەواکان توشی گەندەڵی نابن و

(141) ئەریستۆ لە پەرتووکی (ڕامیاری)دا بانگەشەی ئەو بیروباوەڕە باوک سالارییە دەکات، کە ژن و پیاو بە سروشت لە یەکدی جیادەکاتەوە. بەڵگەکەی لەسەر جیاوازی و بەرزی و نزمی نێوان دەروون و لەش و هۆش و سۆز دادەمەزرێنێت. پیاو بە دەروون و هۆش و ژنیش بە لەش و سۆز دادەنێت. هەروەها دەڵێت، (پیاو بە سروشت لە ژن بەرزترە و ژنیش بە سروشت لە پیاو کەمترە.) نابێت لایەنێکی کەمتر دەستەڵاتی زۆرتری هەبێت و فەرمانڕەوایی لایەنە بەرزەکە بکات. پیاو هەمیشە فەرمانڕەواکەر و ژنیش فەرمانڕەواکراوە و دەبێت ژێردەستەی پیاو بێت. بڕوانە:

Aristotle, “Politics”, Book 1, 12546, 10-20, in *The Complete Works of Aristorle*, vol. 2, 1990.

(142) Plato, “Timaeus”, 91b, in *Plato*: *Complete Works*, p.1289.

دەستەڵاتی ڕامیاری بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکارناهێنن؟ بێگومان، کەسێک بەنێو پرۆسەی بەرنامەی فێربوون و خوێندنی فەلسەفە و زانستە بیرکارییەکاندا ڕۆیشتبێت و بەو قۆناخە گەیشتبێت، کە ڕاستی بناسێت و بووبێت بە کەسێکی چاک بیر لەوە ناکەینەوە دەستەڵات بە خراپی بەکاربهێنێت. بەڵام ئەمە گریمانەیە یان خواستێکی رووتی ئێمەیە و ناتوانین دڵنیابین. بۆ لەناوبردنی ئەم گومانە و دڵنیابوون لەوەی بەرنامەی فێربوون و پەروەردە ئاکامێکی چاکی لەدوایە و ئەو فەیلەسوفەمان بۆ دروست دەکات دەوڵەتەکەمان دادوەرانە بەرێوە بەرێت، ئەفلاتون چەند مەرجێکی دیکە دەخاتە سەر بەرنامەکەو رێگەنادات فەرمانڕەواکان یان فەیلەسوفەکان خاوەنی موڵک و خێزان بن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەفلاتون (خاوەنێتی) بە بنەمایەکی گەندەڵ دادەنێت و فەرمانڕەواکان توشی خراپە دەکات. سەقامگیرکردنی دادوەری تەنیا بە بەرنامەی فێربوون و خوێندن مسۆگەر ناکرێت پێویستە چەند هەنگاوێکی پراکتیکیشی بۆ بنرێت.

ئەفلاتون یەکەم فەیلەسوفە خاوەنێتی بە سەرچاوەی گەندەڵی ڕامیاری دادەنێت و لەناوبردنیشی بە کارێکی گرنگ و پێویست دەبینێت. ئەمەش بە کۆمۆنیزمی ئەفلاتونی دادەنرێت و لەو باوەڕەدام مارکس سودی لێوەرگرتوە چونکە بۆچوونەکانیان لە یەکدییەوە نزیکن. بۆ مارکسیش خاوەنێتی بنەمای چەوساندنەوەیە و خێزانیش دەستگای خاوەنێتی پیاوە بۆ داگیرکردنی ژن و چەوساندنەوەی.



ئەفلاتون پێش مارکس ئاماژەی بۆ ڕۆڵی خاوەنێتی لە گەندەڵی ڕامیارییدا کردوە. ئەگەر خاوەنێتی سامان و خێزان بنەمای گەندەڵی بن و فەرمانڕەواکان بەرەو نادادوەری بەرن، پێویستە لەناو بچن. فەرمانڕەوایەکی دادوەر نابێت خاوەنی موڵک و سامان بێت و ژن و منداڵی هەبێت. کەسێک خاوەنی موڵک و سامان بێت ئارەزووی خاوەنێتی هەیە و دەستەڵاتیشی هەبێت هەوڵی زۆرکردنی موڵک و سامانەکەی دەدات و دەیەوێت دەوڵەمەندتر ببێت و گوێ بە بەرژەوەندی کەسانی دیکە نادات. هەروەها، ئەوەی ژن و منداڵی هەیە لە پێشدا بیر لە بەرژەوەندی خێزانەکەی خۆی و بەختەوەری ژن و منداڵەکەی دەکاتەوە. ئەمەش ئەو کەسە دەکات بە خۆویست و (تەماح)کەر. شیاوی ئەوە نیە لە کۆمارەکەی ئەفلاتوندا فەرمانڕەوایی بکات. فەرمانڕەوای دادوەر کەسێکە، کە خاوەنی هیچ شتێک نیە و بۆ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندی و بەختەوەری هەموو هاووڵاتییەک بکاتەوە ژن و منداڵیشی نیە چونکە ؛

فەرمانڕەواکان پێویستە لە خۆشی و ناخۆشیدا شارەکەیان خۆش بوێت. لەنێو ترس و زەحمەتکێشانیشدا بیر لە شارەکە بکەنەوە. ئەو فەرمانڕەوایەی ئەمانە نەکات دەبێ لاببرێت. ئەوەی، وەکو زێڕ لەنێو ئاگر و لەم ژیانە و لە مردنیشدا ڕەنگ ناگۆڕێت لەو جێگەیە دادەنرێت و ڕێزی لێدەگیرێت.(143)

(143) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی شەشەم، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، ل 213.

دەستەی فەرمانڕەواکان خاوەنی هیچ نین. ڕێگەیان پێنادرێت خاوەن سامان بن، تەنانەت هەموویان پێکەوە لەو خانوەدا بۆیان ئامادەکراوە دەژین. دەوڵەتیش بڕیاری جووتبوون و کاتی جووتبوونیان دەدات. هەرچ منداڵێکیش لە ئاکامی جووتبوونەکەدا پەیدابێت، دەوڵەت دەیبات و بەخێوی دەکات. لێرەدا ئەفلاتون ئەرکی بەخێوکردنی منداڵی لەسەر ئەستۆی ژن لابردووە و ڕۆڵێکی گەورەتری لەنێو کۆمەڵ و دەوڵەتەکەیدا داوەتێ. ئەمەش هەنگاونانێکە بۆ لەناوبردنی دابەشکردنی کار بەسەر ژن و پیاودا. باوک و دایکەکان منداڵی خۆیان نابێ بناسنەوە. لەبەر ئەمە دەبن بە دایک و باوکی هەموو منداڵەکان؛ هەڵبژاردنی کەسەکەی بەرانبەریش بۆ جووتبوونەکە لەژێر چاودێری دەوڵەتدایە تاکو یەکسانی لتەوانایی و پلەی هۆشەکی کەسەکاندا ڕەچاوبکرێت و دوو کەسەکە نایەکسان نەبن؛

تۆ یاساسازی شارەکە و ئەو ژنانەی سروشتی لێکچونیان لەگەڵ پیاواندا هەیە هەڵدەبژێرێن و لەگەڵ ئەو (جۆرە) پیاوانەدا دایاندەنێت. لەبەر ئەوە خانوی هاوبەشیان بۆ دروست دەکەیت و کەس ماڵی تایبەتی خۆی نابێت. هەموو پێکەوە دەژین و فێر دەبن. دڵنیام لەوەی حەز لە سێکسیش لەگەڵ یەکدی دەکەن.

لەو باوەڕەدانیت ئەمەش پێویست بێت؟

ڕاستە.

هەنگاوی دووەممان دانانی یاسایە بۆ هاوسەرییوون.



هاوسەرییوونی پیرۆزیش سودبەخشە.

بەتەواوی دروستە.(144)

هەروەها، ئەفلاتون دەڵێت؛

لەبەر ڕۆشنایی باسەکەی پێشودا. یەکەم، چاکترین پیاو دەبێت لەگەڵ چاکترین ژندا جووت بێت و سێکس بکات.

بەپێچەوانەشەوە، نزمترین پیاو لەگەڵ نزمترین ژندا جووت دەکەین. دووەم، ئەو منداڵەی لە چاکترین ژن و پیاو دەبنەوە، نەک منداڵی ژن و پیاوە نزمەکان، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا، کە دەبن بە پاسەوان لە بەڵاو ئاژاوە دووربن لە شوێنی نادیاردا لەژێر چاودێری فەرمانڕەواکان پەروەردە دەکرێن.(145)

دانانی یاسا بۆ دانانی جووتبوون و هەڵبژاردنی ژن و پیاو لەلایەن دەوڵەتەوە و دواجاریش هەڵگرتنەوەی منداڵەکان بەگوێرەی بۆچوونی ئەمڕۆ دژوارە. ڕێگە لە هەڵبژاردنی تاکەکان و حەز و پەیوەندی خۆشەویستییان دەگرێت. ئەفلاتون مافی تاکەکان و حەز و ئارەزوویانی کردووە بە قوربانی دەوڵەتە.

لەسەر ئەم خاڵەیە بیریارانی لیبراڵ، وەکو کارڵ پۆپەر، ئەفلاتون بە دوژمنی کۆمەڵگای کراوە دادەنێت. من جۆرە ناکۆکییەکی دیکەش لە بۆچوونی ئەفلاتوندا بە دی دەکەم. ئەگەر دەوڵەت منداڵان بەخێو بکات و دایک و باوکی خۆیان نەناسن، چۆن پەیوەندی سێکس

(144) هەمان سەرچاوە. ل 165 – 166.

(145) هەمان سەرچاوە. ل 167.

لەنێوان خوشک و براو منداڵەکان و دایک و باوکیاندا قەدەغە دەکرێت. ئەفلاتون لەهەمان بەشی کۆمارەکەدا دەڵێت؛

> پیاو نابێت لەگەڵ کچی، کچەزاکانی، دایکی، پشتی دایکی جووت بێت. ژنیش نابێت لەگەڵ کوڕی و کوڕەزاکانی، باوکی و پشتی باوکی جووت بێت. پاش دانانی ئەم یاسایە نابێت (لەم کەسانە)منداڵیان هەبێت. ئەگەر منداڵ پەیدا بێت دەبێ بزانن، کە بەخێو ناکرێت.(146)

ئەم یاسایە لەگەڵ جۆری بەخێوکردنی منداڵانەوە لەلایەن دەوڵەتەوە ناجۆر و ناکۆکە. لە بەرنامەی پەروەردەی ئەفلاتوندا لەنێو دوو چینی کۆمەڵدا (فەرمانڕەواکان و پاسەوانەکان) دەستگای خێزان لەناوچووە و کەس منداڵی خۆی ناناسێت. ئەمەش بەو خاڵەمان دەگەیەنێت، کە جووتبوون لەنێوان خوشک و براو منداڵان و دایک و باوکدا کارێکی نایاسایانە نیە چونکە ئەم تاکانە یەکتری ناناسن. دیارە مەبەستی ئەفلاتون قەدەغەکردنی جووتبوونە لە نێوان نەوەی نوێ و کۆندا، بۆیە لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ ئەم خاڵە دەکات؛

> ئەو منداڵانەی حەوت یان دە مانگ، پاش زەماوەندی پیاوێک لە دایک دەبن، هەموویان دەبن بە زادەی ئەو پیاوە؛ نێرینەکان بە کوڕی و مێینەکانیش بە کچی. منداڵەکانیش ئەو پیاوە بە باوکی خۆیان دادەنێن. هەموو ئەو پیاوانە نەوەی دوای

(146) هەمان سەرچاوە، ل 169.



> خۆیان بە منداڵ و منداڵی منداڵیان دادەنێن. منداڵەکانیش ژن و پیاوانی پێش خۆیان بە دایک و باوک و باپیرە و داپیرە دادەنێن. ئەوانەی لە یەک کاتدا لە دایک بوون خوشک و بران. بەم جۆرە هەریەکێک لەم دەستە مرۆڤانە دەزانن لەگەڵ کێدا جووت بن. بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی بەخت بازییەکەوە (ئەگەر خوشک و برا دەرچوون) هەروەها؟"پیتیا" ڕازی بێت، خوشک و برا دەتونن لەگەڵ یەکدا جووت بن.(147)

دەبینین پەیوەندی سێکس لای ئەفلاتون ئازاد نیە. جووتبوون لەنێوان دوو نەوەی کۆن و نوێ و کەسانی هاوتەمەن(ئەوانەی لە یەک کاتدا لە دایک بوون) قەدەغەیە. ئەمە سنور دانانە بۆ ئازادی سێکسی. لە سەرو ئەمەشەوە ئەوانەی سەرپێچی دەکەن و سنورەکە دەبەزێنن و لە ئەنجامی پەیوەندییە سێکسییەکەیاندا منداڵ پەیدا دەکەن، منداڵەکە لە چاوی یاسادا بە(زۆڵ) دادەنرێت و دەوڵەت بەخێوی ناکات. تەمەنیش بۆ جووتبوون لە پیاوە و بۆ ژن دەگۆڕێت. کاتی جووتبوونەکەش دەوڵەت دیاریدەکات و بڕیاری لەسەر دەدات؛

> ژن لە شارەکەماندا لە تەمەنی بیستەوە بۆ چل منداڵی دەبێت.
>
> پیاویش لەو ڕۆژەوە، کە دەبێت بە ڕاکەرێکی چاک تاکو تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵ بۆی هەیە منداڵ دروست بکات.

(147) هەمان سەرچاوە، ل 169.

بەهەر حاڵ، ئەوە باشترین کاتە بۆ لەش و مێشکی ئەوان.

ئەو پیاوەی لەژێر یان لەژوور ئەم تەمەنەوەیە و منداڵ بۆ شارەکەمان دروست بکات، دەبێت پێی بڵێین ئەو کارە دادوەرانە و بڕواکەرانە نیە. منداڵەکەی لەنێو تاریکییدا لەدایک دەبێت و کەمویست دەردەچێت. هیچ نوێژ و قوربانیدانێک بۆ جووتبوونەکەش لەلایەن مرۆڤە ئاینییەکانەوە ئامادە ناکرێت. ئێمە هەمیشە لەو باوەڕەداین نەوەی مرۆڤە چاکەکان، دەبێت چاکتر بن و زۆرتر سودبەخش بن.

ئەوە ڕاستە.

ئەم یاسایە بەسەر ئەو پیاوەشدا دەسەپێنرێت، کە بیەوێت بەبێ ڕەزامەندی فەرمانڕەواکان لەگەڵ ژندا جووت بێت و منداڵ دروست بکات. ئەو منداڵێکی زۆڵ و لە یاسابەدەر و ڕێگە پێنەدراو دەهێنێتەکایەوە.(148)

ئەفلاتون ڕێگەنادات پیاوێکی بە تەمەن گەورە، لەگەڵ ژنێکی بە تەمەن بچوک جووت بێت. ئەگەر ئەم کارە ڕوویدا و ژنەکە لەو پیاوە سکی هەبێت ئەوا دەبێت منداڵەکە لەبار ببرێت. هەروەها، جێگەی منداڵانی کەم ئەندام لە کۆمارەکەیدا ناکاتەوە و لەناویان دەبات.(149) لەناوبردنی منداڵە کەم ئەندامەکانیش وابەستە بە بۆچوونی

(148) هەمان سەرچاوە .ل 168

(149) هەمان سەرچاوە.



ئەفلاتونەوە لەسەر ئەرکی بەخێوکردنیان و بێ توانایی منداڵەکان لە بەشداری کردنیان بۆ سەقامگیرکردنی دادوەری و پێشخستنی دەوڵەتەکە، بێگومان ئەمەش، وەکو لایەنێکی نامرۆڤانە لەم بۆچوونەی ئەفلاتوندا دەبینرێت و لە ئاستی کێشەیەکی ڕەوشتیدا ڕامان دەگرێت.(150)

چینی دووەم لەژێر چینی فەرمانڕەواکانەوە نوێنەرایەتی (گیان)، بەشی دووەمی دەروون دەکات. ئازایەتیش چاکەی گیانە، کەوابوو چاکە بۆ ئەم چینە ئازایەتییە و ئەندامەکانی نێو ئەم چینە دەبێت ئازا و جەنگاوەربن. لەبەر ئەمە، ئەفلاتون ئەم چینە بە چینی پاسەوانەکان بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە دەوڵەتەکەی دادەنێت. پاسەوانەکانیش لە منداڵییەوە دەخرێنە بەر بەرنامەی فێربوون و خوێندن و وەرزش و مەشقی سەبازی و هونەری جەنگ و ماتماتیک و مۆسیقا دەخوێنن. وەکو فەرمانڕەوا فەیلەسوفەکانیش، بەبێ جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا دەخرێنە نێو ئەم بەرنامەیەوە؛

کەوابوو، ژنانی پاسەوان لە مەشق کردن و وەرزش کردندا دەبێت خۆیان ڕووت بکەنەوە چونکە ئەوان چاکەیان لەبەردایە نەک جلوبەرگ. بچنە جەنگەوە و کاری پاسەوانێتی بکەن بەڵام لەبەر لاوازی هەندێک بەشی لەشیان کاری ئاسانیان پێدەسپێرین. ئەو پیاوەی بەو ژنە ڕووتانەش پێدەکەنێت،

(150) ئەمە تەنیا بۆچوونی ئەفلاتون نیە، نازییەکانیش لەئەڵمانیا ژمارەیەکی زۆریان لە منداڵە کەم ئەندامەکان کوشت، تاکو نەبن بە ئەرک بەسەر ڕژێمەکەیانەوە.

خزمەتی شارەکە دەکەن، میوەی کاڵ دەخوات. نازانێت چی
دەکات و بە چی پێدەکەنێت. گوتەیەکی جوان هەیە، دەڵێت:
ئەوەی سودبەخشە جوانە و زیانبەخشە ناشرینە.(151)

ئەفلاتون جیاوازی نێوان ژن و پیاو بە سروشتی نابینێت. هەرچەندە لێرەدا ئاماژەی بۆ لاوازی هەندێک ئەندامی لەشی ژن کردوە، بەڵام بۆچوونەکەی بە یاسایەکی سروشتی دانانێت، کە دەرگا لەسەر سەربەستی ژن دابخات. لەو باوەڕەدایە جیاوازی هێز لەنێوان پیاوەکانیشدا هەیە.

لەپێشتر ئاماژەمان بۆ ئەرک و لێپرسینەوەی چینی پاسەوانەکان کرد. ئەمەش ئەفلاتون هاندەدات ئەندامانی ئەم چینە لە گەندەڵی بپارێزێت و چینێکی پاک و سودبەخشیان لێ پێکبهێنێت. بێجگە لەو بەرنامەیەی بۆ فێربوون و پەروەردەکردنیان دایڕشتوە، بەو ئاکامەش گەیشتوە، کە پاسەوانەکان، وەکو فەرمانڕەوا فەیلەسوفەکان خاوەنێتی و خێزانیان پینەدرێت. ئەو یاسایانەی بۆ فەیلەسوفەکان سەبارەت ژیانی هاوبەشی و جووتبوون باسمانکردن بەسەر ئەمانیشدا دەسەپێنرێن. هەروەها، پاسەوانەکان نابێت چاو ببڕنە موچەکەیان و دەستکەوت و خەڵاتکردن. پێویستە خۆبەخشانە هەوڵبدەن دادوەری سەقامگیر بکەن و وڵاتەکەیان بپارێزن. نابێت دژی هاووڵاتیان ڕاوەستن (خاکی یۆنان داگیرناکەن و ماڵی یۆنانی ناسوتێنن. هیچ

(151) هەمان سەرچاوە. ل 164.



هاووڵاتیەکی یۆنان: ژن، پیاو و منداڵ بە دوژمنی خۆیان دانانێن.)(152) جۆری ژیانی فەرمانڕەوا فەیلەسوفەکان و پاسەوانەکان وەکو یەکە. ئەندامانی ئەم دوو چینە بەبێ جیاوازی و خاوەنێتی و خێزان دەژین. ئەمەش ڕێگەچارەیە بۆ پاراستنی دەستەڵاتیان لە گەندەڵی. چینی سێیەم، کە لەسەر بنەمای (ئارەزوو) دادەمەزرێت بەرهەم هێنەرەکانی کۆمەڵ دەگرێتەوە. ئەفلاتون ئەوەندە باسی ئەم چینە ناکات و ژیانیان سنوردار ناکات. ئەمانە بەپێچەوانەی ئەندامانی دوو چینەکەی پێشوەوە، مافی خاوەنێتی و دروستکردنی خێزانیان هەیە. بەڵام مادام چاکەی ئارەزوو خۆڕاگرتنە ئەو چاکەیەش بۆ ئەم چینە ژیانێکی مامناوەندانەیە. من لەپێشتریش باسی ئەو خاڵەم کرد، کە فەلسەفەی ڕامیاری ئەفلاتون جۆرێک ناچارەکی بەخۆوە گرتووە و لە ئاستی ئاڵوگۆڕکردنی چینەکان لەلایەن تاکەکانەوە ڕێگرە. ئەم ناچارەکییەش لەسەر بیردۆزە سایکۆلۆجییەکەی ڕادەوەستێت.

لەبەشی هەشتەمی کۆماریشدا، ئەفلاتون پاش دامەزراندنی بنەما مێتافیزیکی و ئابوورییەکان بۆ ڕژێمەکەی و دانانی یاساکان باسی جۆرەکانی دیکەی فەرمانڕەوایی دەکات و بە گەندەڵ و نادادوەر ناوزەدیان دەکات. هۆکانیش بۆ گەندەڵبوونی ئەم ڕژێمانە باسدەکات. هەرچەندە بۆچوونەکانی بۆ ئەم ڕژێمانە، وەکو ئەریستۆکراسی، تیمۆکراسی، ئۆلیگارکی، دیموکراسی و دوا ڕژێمیش، کە گەندەڵترینە

(152) هەمان سەرچاوە، ل179.

(زۆرداری)، پەیوەندی بە بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتونەوە هەیە. دەشێ ئێمە لە هەندێک شوێندا بەتایبەتی لەسەر گۆڕانی ڕژێمێکی دیموکراسی بۆ زۆرداری لەگەڵیدا هاوڕا نەبین، بەڵام نابێت ئەوەشمان لە یادبچێت، کە ئەفلاتون ئەزمونی لەگەڵ ڕژێمی ئۆلیگارکی و دیموکراسییدا لە شارەکەی خۆی هەبووە: ئەو بینی چۆن ئەو دوو ڕژێمە ڕوویان لە گەندەڵی و نادادوەری کرد و نەیانتوانی هاوڵاتیان بەختەوەر بکەن. لەلایەکی دیکەوە، باسەکەی ئەفلاتون لەسەر ڕژێمی دیموکراسی گشتییە و نازانین باسی چ جۆرە دیموکراسییەتێک دەکات چونکە دیموکراسییەت فرەجۆرە.

بەهەر حاڵ، باسکردنی ئەم ڕژێمە نادادوەرانە جارێکی دیکە لە دایەلۆگی (یاساکان)دا سەرهەڵدەداتەوە. لێرەدا، ڕاڤەیەکی دیکە بۆ بنەمای نادادوەری ئەم ڕژێمانە کراوە. هەر یەکێک لەم ڕژێمانە سەر بە چینێکی کۆمەڵە و لە بەرژەوەندی ئەو چینە یاسا دروست دەکات و چینەکانی دیکەی پێدەچەوسێنێتەوە. دەوڵەت دەبێت بە دەستگای پارتە ڕامیارییە دەستەڵاتمەدارەکە نەک دەستگایەکی کۆمەڵگای شارستانی بۆ بەختەوەرکردنی هاوڵاتیان؛

> دەوڵەت بۆ دەستەو تاقمێکی کۆمەڵ کاردەکات و یاساکانیش هاوڵاتیان دایانانێن، بەڵکو سەرکردەکانی پارتە دەستەڵاتمەدارە کە دروستیان دەکەن.(153)

(153) Plato, “Laws”, Book 4,715a-c, in *Plato: Complete Works*, p.1402.



لەم بۆچوونەوە نابێت دەوڵەت بکرێت بە دەستگایەکی (حزبی)و پارتێک دەستەڵاتی بەسەردا بگری چونکە پارت نوێنەرایەتی چینێک یان دەستەو تاقمێکی کۆمەڵ دەکات و بۆ بەرژەوەندی ئەوان، نەک هەموو هاووڵاتییەک کاردەکات. دادوەری لەم جۆرە دەوڵەتانەدا یان کۆمەڵگای چینایەتیدا هەمیشە ناتەواوە و هەموو کەسێک ناگرێتەوە. ئایا مەبەستی ئەفلاتون لەم خاڵە چییە؟ ئایا ئەو دەیەوێت کۆمەڵگایەکی لە چین بەدەر دروست بکات؟ ئێمە لەپێشتر باسمانکرد، کە چینایەتی بۆ ئەفلاتون سروشتییە و دەبێتە هۆی پێشخستنی دەوڵەت. لەبەرئەم هۆیەش کۆمارەکەی جیاوازی چینایەتی لەناونابات، بەڵکو پێوەرێک بۆ لەناوبردنی چەوساندنەوەی چینایەتی دادەنێت. ئەو پێوەرەش سەقامگیرکردنی دادوەری و مسۆگەرکردنی بەختەوەرییە بۆ هەموو هاووڵاتیان لە ڕێگەی فەرمانڕەوایکردنی فەیلەسوفەکانەوە. لە دایەلۆگی یاساکاندا، کە دوا نوسراوی ئەم بیریارەیە، لەسەر کێشەی ڕژێم نادوێت، بەڵکو باسی یاسادانان دەکات. جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە نابێت یاسا لەلایەن پارتێکی ڕامیارییەوە یان چینێکەوە دابنرێت. پێویستە یاساسازان کەسانی بێ لایەن بن یان ئەوانە بن بیر لە بەرژەوەندی هەموو هاووڵاتییەک دەکەنەوە. هەروەها پێویستە یاساکەیان کاتی بێت و بەگوێرەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بگۆڕێت. بێگومان، ئەم کارەش، بە دیدی مارکس، کە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، مەحاڵە چونکە دەوڵەت هەمیشە دەستگایەکی

چینایەتییە و نوێنەری دەستەڵاتی چینێک دژی چینەکەی بەرانبەری دەکات. دەستگایەکە بۆ چەوساندنەوەی چینایەتی. تاکو ئەو ڕادەیەی چینەکانی کۆمەڵ هەن و جیاوازییان لەنێواندا دەمێنێتەوە دەوڵەتیش هەیە. ڕوخانی ئەم دەستگای چەوساندنەوەیە لەنێو کۆمەڵگایەکی لە چین بەدەردا ڕوودەدات. لەو کۆمەڵگایەدا، کە بەبێ جیاوازی چینایەتی تاکەکان بەختەوەرانە دەژین و هەموو پێویستییەکانی ژیانیان بۆ مسۆگەر دەکرێت. ئەمەش جیاوازییەکی بنەڕەتییە لەنێوان یۆتۆپیاکانی ئەفلاتون و مارکسدا. ئەفلاتون چینەکانی کۆمەڵ لەناو نابات، بەڵکو ڕژێمێک دادەمەزرێنێت تیایدا چینێک ئەوی دیکە نەچەوسێنێتەوە. بە دیدی من، ئەم یۆتۆپیایەی ئەفلاتون لە قۆناخی سۆشیالیستییەوە نزیکە چونکە لە سۆشیالیزمدا جیاوازی چینایەتی دەمێنێتەوە، بەڵام ڕێگە بە چینێک نادریت ئەوانی دیکە بچەوسێنێتەوە. لە ڕاڤەکردنی مارکس دا بۆ مێژوو سۆشیالیزم دوا قۆناخی پێشکەوتن نیە. گرنگ نیە ئەو کۆمەڵگایە بە چ ڕادەیەک دژایەتی نێوان چینەکانی کۆمەڵی سڕیبێتەوە، هێشتا جیاوازییەکان بەردەوامن و ناکۆکییەکان ماونەتەوە. ئەم ناکۆکییانەش کۆمەڵگاکە بە قۆناخێکی پێشکەوتووتر بە ناوی (کۆمۆنیست) دەگەیەنێت، کە جیاوازی نێوان چینەکان بەتەواوی تیایدا دەتوێتەوە و بەهەشتێکی سەرزەمین بۆ هەموو تاکەکانی نێو کۆمەڵ دەهێنێتەکایەوە.

ئەفلاتون بە درێژی لە دایەلۆگی (یاساکان)دا باسی نەخشەی شار و



خانوبەرە بۆ هاووڵاتیان و پلان دانان بۆ خێزان و ژمارەی دانیشتوانی شار و دووری شار لە دەریاوە دەکات. ئەنجومەنێکی 360 ئەندامی لە شارەکەدا دادەمەزرێنێت و ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە، کە لە ژن و پیاو پێک هاتوون و هاووڵاتیان هەڵیان دەبژێرن تەمەنیان لە پەنجا ساڵان کەمتر نیە. هەروەها، هاووڵاتیان سی و حەوت یاساساز، کە تەمەنی هەر یەکێکیان پەنجا ساڵە بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە و یاسادانان هەڵدەبژێرن. ئەم ئەندامانە تاکو تەمەنی هەفتا ساڵی لە سەر ئەم کارە دەمێننەوە.(154) لە ئەمرۆدا ئەم دەستەیە دەوری وەزیران دەبینن و لەناویاندا وەزیری پەروەردە لەهەموویان گرنگترە و بایەخیکی زۆری پێدەدرێت.(155) ئەنجومەنێک لە ژنانیش بۆ سەرپەرشتی کردنی هاوسەرییبوون و کێشەی خێزانی دروست دەبێت. ئەگەر ژن و مێردێک لە ماوەی دە ساڵدا منداڵیان نەبوو پێویستە جیاببنەوە. گرنگ نیە یەکدییان خۆش بوێت و پێکەوە بەختەوەریش بن. یاسا زۆریان لێدەکات پێکەوە نەژین. پیاو لە تەمەنی سی بۆ سی و پێنج ساڵی دەتوانێ لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری بکات و ژنیش لە تەمەنی شانزەوە بۆ بیست مافی هاوسەرییبوونی پێدراوە. ژن و پیاویش دەبێت لە تەمەنی هەژدا ساڵیدا سەربازی بکەن.(156)

(154) Plato, "Laws", Book 6, 754b-e, in *Plato:Complete Works*, pp. 1429- 30

(155) Plato, "Laws", Book 6, 765e, in *Plato: Complete Works*, pp. 144o.

(156) Plato, "Laws", Book 6, 783c, in *Plato:Complete Works*, p. 1456.

لەبەرنامەی خوێندنیشدا کوڕ و کچ تاکو تەمەنی شەش ساڵی پێکەوەن و دوای ئەم تەمەنە جیادەکرێنەوە، بەڵام یەک جۆر بەرنامەی فێربوونیان بۆ دادەنرێت و پێویستە ڕۆژانە بخوێنن و بچن بۆ فێرگەکانی دەوڵەت.

بێجگە لەمە، ئەفلاتون جەخت لەسەر (بڕواگەری) دەکات و ڕێگە بە کەسانی بێبڕوا و گومڕا یان ئەوانەی بەخراپە باسی خواکان دەکەن نادات لەنێو شارەکەیدا بژین. فەرمانی کوشتن بۆ بێبڕواکان دەردەکات. ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتون لەم قۆناخەی تەمەنییدا کتوپڕ و سەرسوڕهێنەر نیە. ئەو لە (کۆمار)یشدا باوەڕی بە سەربەستی دەربڕین نیە. جێگەی ئەو هونەرمەند و شاعیرانە ناکاتەوە پەیڕوی بەرنامەی فێرکردن و پەروەردەکەی ناکەن. ئێستاش لە (یاساکان)دا فەرمانی کوشتنی بێبڕوا یان ئەوانەی، وەکو ئەفلاتون باوەڕیان بە هێزێکی ئافەریدکەر نیە دەدات.(157) ئەمەش خۆبەڕاستزان و بە زۆر سەپاندنی جۆرێک لە بۆچوونی مێتافیزیکییانەیە بەسەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵدا و لە هەڵوێستی توندڕەوانەی هەندیک لە پیاوانی ئایینیەوە نزیکە، کە خەڵکی (تەکفیر)دەکەن و فەتوای کوشتنیان دەردەکەن.

(57) Plato, “Laws”, Book 10, 899d, in *Plato: Complete Works*, p. 15562.

ئەفلاتون سزای کوشتن بۆ بێبڕواو پێنج ساڵ زیندانی بۆ ئەو کەسە دادەنێت سوکایەتی بە خواکان دەکات. سزای کوشتنیش بۆ ئەو کەسانە دادەنێت ماڵ و سامانی دەوڵەت دەدزن و ئەو دادوەرانەی بێلایەنانە دادوەری ناکەن.



لە (یاساکان)دا جەخت لەسەر گرنگی خێزان و پەیوەندی نێوان ژن و پیاو و منداڵەکانیان کراوە. تەنانەت باسی ئەوە دەکرێت ئەگەر خاوەن کۆیلەیەکی پیاو لەگەڵ کۆیلەیەکی ژندا جووت بوو، ژنەکە منداڵی بوو، خاوەن کۆیلەکە دەبێت ئەو منداڵە بەخێو بکات و بە یاسا منداڵی ئەوە. هەروەها پێویستە وەزیری پەروەردە ژن و منداڵی هەبێت. دەبێت دەوڵەت دەستگای مارەبڕین دابنێت و ژمارەی بانگ کراوەکانیش بۆ زەماوەندەکە دیاری بکات. لە ڕاستیدا، ئەوەی دایەلۆگەکانی (کۆمار) و (یاساکان) دەخوێنێتەوە هەست دەکات زادەی بیری یەک فەیلەسوف نەبن و دوو بیریاری جیاواز نوسیبێتیان. ئەفلاتون، لە (یاساکان)دا لە زۆر بۆچوونی خۆی، کە لە (کۆمار)دا بانگەشەی بۆ کردون پەشیمان بۆتەوە. هەرچەندە پەشیمان بوونەوەکەی باسنەکردوە، بەڵام خوێندنەوەمان بۆ (یاساکان) ئەم لایەنەمان بۆ ڕووندەکاتەوە و پێویست ناکات ئەفلاتون بە دەنگێکی بەرز پێمان بڵێت.

# بەشی حەوتەم

## فەلسەفەی جوانی

پاش گەیشتن بەم قۆناخەی بیرکردنەوەی ئەفلاتون و بۆچوونە ڕامیارییەکانی لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی دادوەر و یاساسازکردن لەسەر بناخەیەکی مێتافیزیکی–سایکۆلۆجی؛ ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنانەی تاکەکانی کۆمەڵ تیایاندا ناچاردەکرێن و سەربەستییەکەیان داگیردەکرێت؛ جەختکردن لەسەر ئەوەی چاکە و دادوەری لە جیهانێکی بەرزدا پەیدادەکرێت، چۆن ئێمە مامەڵە لەگەڵ فەلسەفەی جوانی لای ئەفلاتون بکەین؟ ئایا ئەفلاتون جوانی ناسە؟ جوانی لای ئەو چ واتایەک دەبەخشێت؟ بۆچوونەکانی سەبارەت جوانی چ کاریگەرێتییەکیان بەسەر هونەرەوە هەیە؟ من لەم بەشەدا هەوڵدەدەم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە. بۆ ئەم مەبەستەش ئاوەڕ لە سێ دایەلۆگ (هیپپیاسی گەورە)، (سمپۆزییەم) و (کۆمار) دەدەمەوە و بۆچوونەکانی ئەفلاتون لەسەر جوانی لەم دایەلۆگانەدا شیدەکەمەوە. پێویستە ئەوش بزانین، کە باسەکامان لەسەر تێگەیشتن لە واتای جوانی و دواجاریش هونەر پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە سیستەمی فەلسەفی ئەفلاتونەوە هەیە. ئەم بیریارە هەوڵی دامەزراندنی سیستەمێکی داوە، هەموو تێڕوانینە کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و هونەرییەکانی تیادا کۆدەبنەوە. من لەپێشتر ئەم لایەنەم ڕوون



کردۆتەوە و باسم کردوە چۆن فەلسەفە ڕامیاری و بیردۆزە سایکۆلۆجییەکەی پەیوەندییان بە بۆچوونی مێتافیزیکیانەی ئەفلاتونەوە هەیە. لەم بەشەشدا ئاماژە بۆ هەمان پەیوەندی لە نێوان فەلسەفەی جوانی و مێتافیزیکی ئەم بیریارە دەکەم و لەبەر ڕۆشنایی سیستەمە سەرتاپاگرەکەیدا مامەڵە لەگەڵ فەلسەفەی جوانیدا دەکەم. لە مێتافیزیکی ئەفلاتوندا ئەم جیهانە هەستەکییەی ئێمە تیایدا دەژین ڕاستەقینە نیە. وەرگیراوی جیهانێکی بەرزە لەژوور ئێمە و بابەتە هەندەکی و هەستەکییەکانەوە. ئێمەش فڕێدراوینەتە ئێرە و لەم ئەشکەوتەدا دوور لە (ڕاستی) دەژین. هەرشتێک ئێمە دەیناسین و لەبارەی بوونیەوە دەزانین ساختەیە و زانینەکەشمان ناتەواوە و (بۆچوون)ە. ئەو بابەتەی من بە جوانی دادەنێم بابەتێکی وەرگیراوە یان ساختەیە و بەردەوام لە گۆڕاندایە. جوانییەکەشی، بەهەمان شێوە، ناتەواوە و دەگۆڕێت. دەشێ بۆ من جوان و بۆ کەسێکی دیکە ناشرین بێت؛ یان ئێستا بۆ من جوانە و پاش ئەوەی گۆڕانی بەسەردا دێت ناشرین دەبێت؛ لەم حاڵەتەدا جوانی ناتەواوە، لە گۆڕاندایە و ڕێژەییە. جوانییەک نیە، وەکو خۆی بمێنێتەوە. هەروەها ئێمە لەگەڵ ئاماژەکردنمان بۆ شتێکی جوان خەسڵەتی جوانی بەو شتەوە دەلکێنین و خودی ئەو شتە جوانی نیە و خودی جوانیش ئەو شتە نیە. بابەتەکە و جوانی دوو شتی جیاوازن. ئەمەش، وەکو پەیوەندی نێوان ڕەنگەکان و بابەتەکانی دەوروبەرمانە. ئێمە پەرتووکێکی بەرگ

سور، کراسێکی سور و ئۆتۆمۆبیلێکی سور دەدۆزینەوە، بەڵام بەرگی پەرتووکەکە، کراسەکە و ئۆتۆمۆبیلەکە ئەو ڕەنگە سورە نین و جیاوازن. ڕەنگی سور خەسڵەتێکی ئەو بابەتانەیە نەک خودی بابەتەکان. بابەتەکان خەسڵەتی دیکەشیان تێدا دەدۆزرێنەوە، بۆ نموونە، پەرتووکەکە گەورەیە یان بچوک. دیسانەوە گەورەیی و بچوکی خودی پەرتووکەکە نین و خەسڵەتەکانی ئەون. لێرەدا، لەم پرۆسەی بیرکردنەوەیەوە بەو ئاکامە دەگەین، کە خودی جوانی، وەکو خودی بابەتەکە هەیە چونکە جوانی و بابەتەکە دوو شتی جیاوازن و پێکەوە بەستراون یان خودی ڕەنگی سور هەیە و وەکو خەسڵەتێک خراوەتە سەر بەرگی پەرتووکەکە و کراس و ئۆتۆمۆبیلەکە. من نامەوێ ئەم کێشەیە بە درێژی باسبکەم. لە بەشی سێیەمی ئەم نوسراوەدا ڕوونمان کردۆتەوە چۆن ئەفلاتون بەو باوەڕە گەیشتوە، کە خودی ئەم خەسڵەتانە یان فۆرمانە لە بابەتە هەندەکییەکانەوە جیاوازن. ئەوەندە بەسە، کە بزانین ئەم بیریارە باوەڕی بە فۆرمی جوانی یان خودی جوانی بەبێ بەستنەوەی بە بابەتە هەندەکییەکانەوە هەیە. دروستە ئێمە بۆ ناسینی جوانی هەمیشە پەنجە بۆ شتێکی جوان ڕادەکێشین بەڵام ئەو شتەی ئێمە بە جوانی دادەنێین (جوانی) نیە و بەشێک لە جوانی خراوەتە سەر بوونی، یان سور نیە و ڕەنگی سوری لەسەر دانراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە خودی جوانی بەبێ شتە جوانەکان دەدۆزرێتەوە و هەیە. ئێمەش



هەرگیز ناتوانین خودی(جوانی) بناسین ئەگەر خۆمان بە شتە جوانەکانەوە ببەستینەوە و لەنێویاندا مەست بین و هەوڵ نەدەین خۆمان لە تەلیسمی ئەم جوانییە کەم و کورت نەفەسە ڕزگار بکەین. ئەوەی لەم جیهانەدا بە جوان دەبینرێت بەشیکی لە خودی جوانی پێدراوە و جوانییەکی نەگۆڕ و ڕەهای هەڵنەگرتوە.

ئەفلاتون بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کێشەیە لە دایەلۆگی(هیپپیاسی گەورە)دا دەڵێت؛

**سوکرات:** ئایا (دادوەری) شتە؟

**هیپپیاس:** نەخێر.

**سوکرات:** هەروەها، زانایی مرۆڤ زانا دەکات و چاکەش چاکی دەکات؟

**هیپپیاس:** دەبێ بەم جۆرە بێت، نەک بەپێچەوانەوە.

**سوکرات:** ... هەریەکێک لەمانەش بوونیان هەیە.

**هیپپیاس:** بەڵێ، هەیانە.

**سوکرات:** کەوابوو، هەموو شتە جوانەکان جوانن چونکە (جوانی)یان تێدایە. ئایا ئەمە وایە؟

**هیپپیاس:** بەڵی وایە. بۆچی نا؟

**سوکرات:** پێم بڵێ ئەو جوانییە چییە؟

**هیپپیاس:** ئەگەر کەسێک وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، مەبەستی دۆزینەوەی شتێکی جوان نیە؟

**سوکرات**: نا،هیپیاس، من لەو باوەڕەدانیم.

ئەو شتە جوانی نیە.

**هیپیاس**: جیاوازییان چییە؟

**سوکرات**: تۆ لەو باوەڕەدای جیاواز نەبن؟

**هیپیاس**: جیاواز نین.

**سوکرات**: باشە، تۆ تەماشاکە، پرسیارکردنەکە لەبارەی شتێکی جوانەوە نیە، بەڵکو خودی جوانییە.(158)

خوێندنەوەی ئەم دایەلۆگە و مشتومڕی نێوان سوکرات و هیپیاس جیاوازی نێوان ئەفلاتون و ئەریستۆم بیردەخاتەوە. هیپیاس لە سەرەتاوە جوانی بە شتە جوانەکان دادەنێت؛

یان ناتوانێت بیر لە بوونی جوانی بەبێ شتێکی جوان بکاتەوە. ئەمەش بۆچوونی ئەریستۆیە، کە پاش مردنی ئەفلاتون لە سیستەمە فەلسەفییەکەیدا بانگەشەی بۆ دەکات.

فۆرمە هەمەکییەکان و بابەتە هەندەکییەکان پێکەوە گرێدەدات و تەنیا لۆجیکمەندانە نەک ئۆنتۆلۆجییانە لە یەکدییان جیادەکاتەوە.

من لە پێشەکی پەرتووکی (کاتیگۆرییەکان)ی ئەریستۆدا باسی ئەو خاڵەم کردوە، کە ئەگەر ئەریستۆ ئەم پەرتووکەی ئەو کاتە نوسیبێت لە ئەکادیمیا لای ئەفلاتون خوێندوویەتی ئەوا ئەم بیرۆکەیە و جیاوازییەی لەگەڵ مامۆستاکەیدا لەو سەردەمەوە و پێش مردنی

(158) Plato, “Greater Hippias”, 287c-e, in *Plato:Complete Works*, p. 905.



ئەفلاتون سەریهەڵداوە. (159) ئەریستۆ هەمەکی و هەندەکی، وەکو فۆرم و ئەستو لە یەکدی دانابڕێت و فۆرمە هەندەکییەکان بەبێ هەبووە هەندەکییەکان دانانێت. ئێمە هەمیشە بۆ ناسینی جوانی بەدوای شتێکی جواندا دەگەڕێین و بۆ ناسینی ڕەنگی سوریش ئاماژە بۆ پەرتووکە بەرگ سورەکە، کراسە سورەکە یان ئۆتۆمۆبیێلە سورەکە دەکەین. خودی ڕەنگی سور بەبێ بابەتێکی هەندەکی یان تاکی سور نادۆزرێتەوە. ئەمەش جیاوازییەکی گەورەیە لەنێوان سیستەمی مێتافیزیکی ئەفلاتون و ئەریستۆدا.

لەم دیالۆگەدا، ئەفلاتون هەموو جوانییەکی نێو بابەتە هەندەکییەکان بە ڕێژەیی دادەنێت و دەیەوێت سیستەمە فەلسەفییەکەی لێ دووربخاتەوە. لە سەرەتای بیرکردنەوە فەلسەفییەکەیەوە و لەژێر کاریگەریێتی پارمەنیدسەوە لەو باوەڕەدایە سیستەمخوازی پێویستی بە بنەمایەکی نەگۆڕ و چەق وەستاوە و دەبێت تەواو کۆبێت. سیستەم لەسەر زەمینەیەکی گۆڕینۆک و ڕێژەگەری دانامەزرێت. فەلسەفەی جوانیش لەم بەستێنەوە مامەڵە لەگەڵ شتە جوانەکاندا ناکات چونکە شتە جوانەکان لە گۆڕاندان و جوانییەکەشیان ڕێژەییە.

دۆزینەوەی خودی جوانی یان ئەو فۆرمە نەگۆڕ و هەمیشەییەی

(159) بڕوانە: ئەریستۆ، کاتیگۆرییەکان، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2010. ل 6-7 . هەروەها ئەریستۆ لە پەرتووکی (میتافیزیک) بەشی (زیتا) هەوڵیداوە پەیوەندی نێوان فۆرمە هەمەکییەکان و بابەتە هەندەکییەکان بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەفلاتونەوە ڕوونبکاتەوە.

جوانی دەبێت بە کرۆکی توێژینەوەکەی. ئەو شتەی جوانە جوانترین نیە و لەو جوانتر هەیە. کەوابوو، ئێمە شتێک دەناسین بە ڕادەیەک جوانە یان جوانی تێدایە و ئەو شتەش خودی جوانی نیە.

دروستە، ئەفلاتون ڕەخنە لە جوانی ڕێژەیی دەگرێت و بە خەسڵەتێکی کەم و ناتەواوی دادەنێت، بەڵام ئەوەندە جوان پەرستە و عاشقی جوانییە، دەیەوێت جوانی تەواو و نەگۆڕ پەیدا بکات. جوانییەک، کە **یەکەم**، هەمیشە هەیە و پەیدانەبووە و لەناویش ناچێت، کەم و زۆر نابێت. **دووەم**، لە لایەکەوە جوان و لایەکی دیکەوە ناشرین نیە؛ لە کاتێکدا جوان و کاتێکی دیکە ناشرین نیە، لە پەیوەندییەکدا جوان و پەیوەندیەکی دیکەدا ناشرین نیە، لێرەدا جوان و لەوێدا ناشرین نیە.....)(160) شتە جوانە هەندەکییە کاتییەکان تینوێتی ئەفلاتون ناشکێنن. ئەو نایەوێت ئەوەی جوانە تەنیا بۆ ئەو، لەم کات و شوێنە و لایەن و پەیوەندییەوە جوان بێت و گۆڕانی ئەم بارودۆخانە جوانییەکەش لەناوبەرێت. ئەو دەزانێت هەموو بابەتە هەندەکییەکانی نێو جیهانی هەستەکی بە جوان و ناشرینەوە کاتین و لەژێر کاریگەرێتی گۆڕاندا ڕزگاریان نابێت. کەوابوو، ئەو جوانییەی ئەفلاتون بە دوایدا دەگەڕێت و عاشقێتی لەم جیهانەدا نیە. بەڵام ئەم جیهانە دەبێت بە بەستێنێک بۆ گەڕان بە دوایدا.

لێرەدا، دەتوانم بڵێم، ئەفلاتون میتۆدی (ئیندەکشن) بۆ دۆزینەوەی

Plato, “Symposium”, 211b, in *Plato: Complete Works*, p. 493. (160)



جوانی بەرز یان خودی جوانی بەکاردەهێنێت. لە شتە هەندەکییە جوانەکانەوە بەرەو جوانتر و جوانترین گەشتەکەی دەخاتە گەر و دەڵێت، (هەموو کەسێک بۆ دۆزینەوەی ئەم جوانییە ڕوو لە سەرەوە دەکات؛ لە شتەجوانەکانەوە دەست پێدەکات و وەکو ئەستێرەیگەشاوە بەکاریان دەهێنێت؛ لە تەنێکی جوانەوە بۆ دوو تەن دوایی بۆ هەموو تەنەکان و لەوێوە بۆ نەریتە جوانەکان دەڕوات. لە نەریتە جوانەکانەوە دەست دەداتە خوێندنی شتە جوانەکان و لەو خوێندنەوە دەگاتە ناسینی جوانی.)(161) بۆ ناسینی خودی جوانی پێویستە شتە جوانەکان بدۆزینەوە، هاوکات لە بیرمان نەچێت، کە جوانی لەنێو ئەو شتانەدا خودی جوانی نیە، بەڵکو بەشێکە لە جوانی. خودی جوانی فۆرمی جوانییە و لە جیهانی بەرزدایە. بۆ ناسینی دەبێت ڕێگەی فەلسەفە بگرینەبەر چونکە فەیلەسوف دەتوانێت بە جیهانی بەرز بگات و فۆرمە بەرزەکان ببینێت. کەسانی دیکە، ئەوانەی فەیلەسوف نین شتە جوانەکان دەناسن. بەڵام جوانی شتێکی جوان نیە و فۆرمێکی بەرزی هەمەکییە. سەرچاوەی هەموو جوانییەکە لەنێو ئەم جیهانەی ئێمەی تێدا دەژین.

لەم ڕوانگەیەوە، هەموو کەسێک دەتوانێت جوانی لە جیهانی هەستەکییدا بدۆزێتەوە و شتە جوانەکانی خۆش بوێت، بەڵام ئەو شتە جوانەی ئەو خۆشی دەوێت و بە جوانی دادەنێت ڕێژەییە و خودی

(161) هەمان سەرچاوە.

جوانی نیە. بۆ ئەوەی خودی جوانی بدۆزینەوە، پێویستە خۆمان بەودیو جیهانی هەستەکییەوە بگەیەنین و حەز لە فۆرمە بەرزەکەی جوانی بکەین، کە پڕو تەواوە و هەمیشە جوانە. ئەگەر گەیشتن بەو جیهانە بەرزەش لە تەواناى فەیلەسوفەکاندا بێت و هەموو کەسێک نەتوانێت ببێت بە فەیلەسوف، بەو ئاکامە دەگەین، کە هەموو کەسێک جوانی ناس نیەو ئەوەی ئەو بە جوانی دادەنێت وەرگیراوی جوانییە و ناتەواوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە شتێکی جوان لەم جیهانەدا نادۆزرێتەوە و ئەوەی هەیە ناشرینە. بێگومان، لە بەستێنی ڕێژەگەرییەوە دەگەینە ئەو خاڵەی، کە هەموو شتەکان جوانن و هەمان کات ناشرینن. لەم ڕووەوە، هیچ شتێکی جوان نادۆزینەوە و ئەوەی هەیە ناشرینە. بەڵام، ئەم هاوکێشەیە دیوێکی دیکەشی هەیە و دەتوانین بڵێین ئەوەی هەیە جوانە و هیچ شتێکی ناشرین نیە. ڕێژەگەری کێشەیەکی گەورە بۆ ئەفلاتون و هەموو ئەو بیریارانە پەیدا دەکات، کە بە دوای جوانی و ڕاستییە نەگۆڕەکاندا دەگەڕێن چونکە ڕێژەگەری جوانی و ڕاستی بە چەق وەستاو و نەگۆڕ دانانێت. ئەوەی هەیە لەهەمان کاتدا ڕاست و ناڕاستە، جوان و ناشرینە و پەیوەندی بە (بۆچوون) نەک (زانین)ەوە هەیە. ئەوەی ئێمە لەنێو جیهانی هەستەکییدا یان لەنێو ئەشکەوتەکەدا بە جوانی دادەنێین وابەستە بە (بۆچوون)ی ئێمەوە و هەستکردنمان بەرانبەر شتە جوانەکە. بۆ ئەفلاتون، بۆچوونیش هەستکردنە و بەگوێرەی تاکەکان دەگۆڕێت و



بابەتەکەشی هەستەکی و گۆڕینۆکە. شتێک بە بۆچوونی من جوانە و بە بۆچوونی کەسێکی دیکە ناشرینە. بەڵام (زانین) پەیوەندی بە فۆرمە بەرزەکانەوە هەیە و فەیلەسوف یان ئەو کەسەی خۆی لە دۆگمای نێو ئەشکەوت ڕزگاردەکات و بە جیهانی بەرز دەگات دەستی دەکەوێت. (زانین) لەگەڵ ناسینی فۆرمە نەگۆڕەکاندا، وەکو فۆرمی (جوانی) سەرهەڵدەدات. مادام ئێمە، بە دیدی ئەفلاتون، لەنێو ئەشکەوتدا دەژین، ئەو کاتەی حوکم بەسەر شتێکدا دەدەین و بە جوانی دادەنێین، باشترە بڵێیین بە (بۆچوونی من) ئەو شتە جوانە چونکە هەمان شت بۆ کەسێکی دیکە جوان نیە. ئێمە، تاکو لەنێو ئەشکەوتەکە دەرنەچین، ناتوانین خۆمان لە (بۆچوون) و ڕێژەگەری ڕزگار بکەین.

بەکورتییەکەی، ئەفلاتون جوانی و شتێکی جوان لە یەکدی جیادەکاتەوە و یەکەمیان دەکات بە سەرچاوەی جوانی لە دووەمدا؛ وەکو چۆن بەرگی پەرتووکێکی سور بەبێ ڕەنگی سور نیە، شتێکی جوانیش بەبێ جوانی نیە. ئەم جیاکردنەوەیەش، بەو شێوەیەی ڕوونمانکردەوە، لەسەر بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ئەفلاتون دامەزراوە و پەیوەندی بە بیردۆزەی فۆرمە بەرزە هەمەکییەکانەوە هەیە. کەوابوو، جوانی فۆرمێکی سەربەخۆیە، وەکو فۆرمی چاکە، دادوەری، ئازایەتی و...هتد، لە جیهانی بەرزدا دانراوە. ئێمە ناتوانین بڵێین جوانی دادوەرییە یان چاکەیە چونکە دادوەری و چاکە دوو فۆرمی جیاواز و

سەربەخۆن و نابن بە جوانی. بەڵام دادوەری جوان یان چاک دەبێت. ئەم تێهەڵکێشکردنەی دوو فۆرم یان زۆرتر لەنێو وەرگیراوەکانیاندا ڕوودەدات نەک لە جیهانی بەرزدا. کردەوەیەکی چاک دەشێ لەهەمان کاتدا دادوەرانە و جوان بێت؛ یان شتێکی جوان چاکیش بێت. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت جوانی چاکییە بەڵکو ئەو شتە جوانی و چاکەشی بە خۆوە گرتوە. ئەمەش وەکو ئەوە وایە بڵێین بەرگی پەرتووکەکە سور و ڕەشە بەڵام بەرگەکە سوری یان ڕەشی نیە. لەبەر ئەمە لە دایەلۆگی (هیپپیاسی گەورە) و (کۆمار)دا ئەفلاتون هەوڵیداوە بەم تێهەڵکێشکردنە واتای جوانیمان بۆ ڕوونبکاتەوە و جوانی بە سودبەخش دادەنێت.(162) ئەگەر شتێکی جوان ئەوە بێت سود بگەیەنێت، فۆرمی جوانیش لە جیهانی بەرزدا ئەوەیە، کە بە (تەواوی) سودبەخشە. بەڵام لە جیهانی بەرزدا، ئەگەر (سودبەخشی) هەبێت دەبێت فۆرمێکی سەربەخۆ بێت. ئێمە لەم جیهانەدا تێهەڵکێشکردنەکە دروست دەکەین و شتێکی جوان بە چاک و سودبەخش دادەنێین. هەر یەکێک لەم خەسڵەتانە لەنێو ئەم (شتە)دا سەرچاوەی خۆی هەیە؟ جوانی لە جوانییەوە و سودبەخش لە سودبەخشییەوە و چاکەش لە چاکییەوە هاتوە. جوانی چاکی و سودبەخشی نیە. هەروەها، پێناسەکەی ئەفلاتون ئەوەش ڕووندەکاتەوە، کە شتێکی ناشرین زیان

(162) Plato, "Greater Hippias", 295c, in *Plato:Complete Works*, p. 912

هەروەها بڕوانە: ئەفلاتون، کۆمار، بەشی شەشەم، وەرگێڕانی.د. محەمەد کەمال.ل.164



بەخشە. لەم حاڵەتەدا، (زیانبەخشی) دەبێت فۆرمێکی هەمەکی لە جیهانی بەرزدا هەبێت، ئەگینا لە کوێوە هاتۆتە نێو جیهانی هەستەکییەوە؟ ئەفلاتون وەڵامی ئەم پرسیارەمان ناداتەوە و جیهانی بەرز لە هەموو گەندەڵی و ناشرینی و خراپەیەک دووردەخاتەوە و ئەم فۆرمانەی لەنێودا دانانێت.

ئەو پرسیارەی یەخەمان دەگرێت و دەمانەوێت ئاڕاستەی ئەفلاتونی بکەین سەبارەت چۆنیەتی سودبەخشییە. ئایا (سودبەخشی) چ واتایەکی هەیە؟ ئێمە تاکو ڕادەیەک لەگەڵ ئەفلاتوندا لەسەر ئەوەی شتێکی جوان بە سودبەخش دابنێین هاوڕاین، کە بەدیدی من، ئەمەش هەموو کاتێک ڕاست نیە. بۆنموونە، نەشتەرگەری بۆ نەخۆشێک جوان نیە کەچی سودبەخشە. پێویستە بزانین (سودبەخشی) چ واتایەکی هەیە. بۆ دەستنیشان کردنی واتای (سودبەخشی) ئەفلاتون باسی چاکە و خراپە دەکات. لەو باوەڕەدایە شتێکی جوان سودبەخشە، چونکە چاکە. بەم شێوەیە جوانی سودبەخشی و چاکە تێهەڵکێش دەکات. شتێکیش ناشرینە چونکە زیان بەخشە و خراپە.

وەکو دەزانین، فۆرمی چاکە لە جیهانی بەرزدا هەیە، بەڵام ئەفلاتون ئامادە نیە فۆرمی خراپە لەو جیهانەدا دابنێ. لە دایەلۆگی (هیپپیاسی گەورە)دا پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە چێژو خۆشیش بە جوانییەوە دەبەستێتەوە. گوایە جوانی ئەوەیە خۆشی یان چێژ بە ئەندامەکانی هەستکردن دەگەیەنێت. گۆرانییەکی خۆش خۆشی بە گوێ

وتابلۆیەکی جوان خۆشی بەچاو دەگەیەنن. ئەم بۆچوونانە دروستن و دەتوانین مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین. بەڵام ئەم پێناسانە جوانی بە بنەمایەکی ڕەوشتییەوە دەبەستنەوە چونکە چاکە و خۆشی بەهای ڕەوشتین.

هەروەها، من ئەم پێناسانەی ئەفلاتون بە ناکۆک دانانێم. ئەو دەیەوێت لە ڕوانگەی کەسانی نێو ئەشکەوتەکەوە واتای جوانیمان بۆ باس بکات و دوایی واتای جوانیمان، وەکو (فەیلەسوف)بۆ ڕوون دەکاتەوە. ئەم هەوڵدانەش ئاماژە بۆ فرە لایەنی بۆچوونەکان دەکات. لەسەرو هەموویانەوە، ناسینی جوانی لای فەیلەسوف چاکترین و بەرزترینە. کەس لە فەیلەسوف زۆرتر جوان پەرست و جوانناس نیە. تەنانەت هونەرمەند و شاعیرەکانیش، وەکو فەیلەسوف جوانی ناناسن. پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە و تێگەیشتن لە واتای جوانی و بوونی ڕاستەقینەی فۆرمی جوانی لە جیهانی بەرزدا باسی کاریگەرێتی فەلسەفەی جوانی ئەفلاتون بەسەر هونەرەوە دەکەم. لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش، کە ئایا لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی جوانی ئەفلاتوندا هونەر یان بەرهەمی هونەری چییە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە جاریکی دیکە بۆ بیروباوەڕی مێتافیزیکی ئەم بیریارە دەگەڕێمەوە، کە بەبێ ئەو ئێمە نەمانتوانی لە فەلسەفەی جوانیش تێبگەین. هەڵبەتە ئەفلاتون نکۆڵی لە بوونی جوانی لەنێو جیهانی هەستەکییدا ناکات. ئەویش باسی جوانی شتەکان و بەرهەمە



هونەرییەکان دەکات. بەڵام، جوانی نێو جیهانی هەستەکی وەرگیراوە و ساختەیە؛ جوانییەکی ڕەسەن و تەواو نیە. هەر جوانییەک لەنێو جیهانی هەستەکییدا ببینین ئەو جوانییە لە فۆرمی جوانییەوە وەرگیراوە یان بەشێکی ئەو جوانییەی پێدراوە. خودی جوانی لێرە یان لە جیهانی هەستەکییدا نادۆزرێتەوە. کەوابوو، جوانی بەرهەمی هونەریش خودی جوانی و ڕەسەن نیە. هونەرمەند لاسایی جوانی دەکاتەوە و بەرهەمەکەشی لاسایی کردنەوەیە.

فۆرمی هەمەکی جوانی سەرچاوەی جوانییە لەنێو جیهانی هەستەکییدا. ئەمەش لەسەر ئەو بنەما مێتافیزیکییە ڕادەوستێت، کە جیهانی هەستەکی یان هەر شتێک لە جیهانی هەستەکییدا هەبێت وەرگیراوی فۆرمە هەمەکییەکانی جیهانی بەرزە. مرۆڤە تاکەکان، ئاژەڵ، درەخت، ئازایەتی، دادوەری تاکە کەسەکان و دەوڵەت، جوانی لەنێو بابەتەکاندا ڕاستەقینە نین و وەرگیراوەی فۆرمە بەرزەکانیانن. لەهەر شتێکدا جوانی ببینین ئەو جوانییە وەرگیراوە یان ساختەیە و خودی جوانی نیە. لەم بۆچوونەوە، ئێمە لەنێو جیهانی هەستەکییدا (ڕاستی) نادۆزینەوە. هەموو شتەکانی نێو ئەم جیهانە ساختەن، وەرگیراون و تەواوکۆ نین.(ڕاستی) لە جیهانی بەرزدا نەک لەنێو جیهانی هەستەکییدا هەیە. ئەم بۆچوونە کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی بەسەر تێگەیشتنمان لە هونەر و بەرهەمی هونەرییەوە هەیە. ئێمە هونەرمەند و شاعیر بە جوانناس دادەنێین و لەو باوەڕەداین ئەوان لە

ئێمە زۆرتر جوانی دەبینن و دەریدەبڕن. بەڵام ئەفلاتون بەپێچەوانەی ئێمەوە لەو باوەڕەدایە هونەرمەند (جوانی)ناس نیە. ئەوەی هونەرمەند بە جوانی دادەنێت ساختەیە یان وەرگیراوی جوانییە. جوانی ڕەسەن لە جیهانێکدا هەیە، کە تەنیا فەیلەسوفەکان دەتوانن بیگەنێ. ئەوەی هونەرمەند بە جوان ناوزەدی دەکات و لە بەرهەمەکانیدا دەریدەبڕێت، جوانییە لەنێو سێبەرەکانی سەردیواری ئەشکەوتەکە. ئەو نەیتوانیوە سەرچاوەی ئەو جوانییەمان پێبناسێنێت، کە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەدا هەیە.

ئێمە باسی ئەو خاڵەمان کرد، کە جوانی لە جیهانی هەستەکییدا ڕێژەیی و گۆڕینۆکە؛ وەرگیراوی فۆرمی هەمەکی جوانییە، کە هەمیشە هەیە و گۆڕان کاری تێناکات. لەم ڕووەوە، ئەوەی ئێمە بە جوانی دەبینین ڕاستی نیە و پلەیەک لە ڕاستییەوە دوورە. هونەرمەندی شێوەکاریش لە بەرهەمەکەیدا وێنەی ئەو شتە جوانەمان بۆ دەردەخات. بەرهەمەکەی شتە جوانەکە نیە، بەڵکو وەرگیراوی ئەو شتەیە و ڕاست نیە. کەوابوو، هونەرمەند دوو پلە لە ڕاستییەوە دوورە؛ بەرهەمەکەی وەرگیراوی وەرگیراوی فۆرمی جوانییە. بۆ نموونە، مۆنالیزای نێو تابلۆکەی لیۆناردۆ دافنشی وێنەیەکی وەرگیراوی جوانی مۆنالیزایە. جوانی مۆنالیزاش وەرگیراوی فۆرمی جوانییە، کە لە جیهانی بەرزدایە. بەم شێوەیە، لیۆناردۆ دافنشی لە بەرهەمە هونەرییەکەیدا لە (جوانی) دوورتر کەوتۆتەوە و لاسایی ئەو



جوانییەمان بۆ دەکات (مۆنالیزا)، کە لەنێو جیهانی هەستەکییدایە و وەرگیراوی جوانییە بەرزەکەیە؛

کەوابوو، بڕوانە ئەم نموونەیەش: ئایا هونەری شێوەکاری چی چی دەکات؟ ئایا ئەو شتەمان نیشاندەدات، کە وەکو خۆیەتی و یەک شتە یان ئەو شتەمان بەو شێوەیە پێدەناسێنێت، کە دەردەکەوێت وابێت؟ ئایا بەرهەمێکی هونەری ڕاستی ناسە، یان لاسایی ڕاستی دەکاتەوە؟

دیاردەکان نیشان دەدات.

لاسایی کردنەوە لە ڕاستییەوە دوورە، تەنیا لایەنەکان دەردەخات کە ئەوانیش وێنەی (شتە ڕاستەکەن)لەبەر ئەمەش دەتوانێت زۆر شت بکات. بۆ نموونە، هونەرمەندێک تابلۆی پینەچییەک، دارتاشێک یان شتێکی تر دەکات، بەبێ ئەوەی لەبارەی ئەم پیشانەوە زانیاری هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هونەرمەندێکی چاک بێت منداڵان و کەسانی گەمژە لە دوورەوە تابلۆکەی لەسەر دارتاشیک دەبینن، وادەزانن شتێکی ڕاستە (163)

بێگومان بۆچوونەکەی ئەفلاتون سەبارەت هونەری شێوەکاری بە ڕادەیەک دروستە. بەرهەمێکی هونەری لە داکەوتەوە کەرەسە و بابەتەکانی وەردەگرێت، بەڵام مەرج نیە هونەرمەندەکە کۆپی شتەکان

(163) ئەفلاتون، کۆمار، بەشی دەیەم، دەرگێڕانی د. محەمەد کەمال.ل 325.

بە تەواوی وەکو خۆیان بکاتەوە. ڕەخنەکەی ئەفلاتون بەسەر شێوازی ئەکادیمییدا لە هونەری شێوەکاری باشتر خۆی دەسەپێنێت، بەڵام لە شێوازەکانی دیکەدا بەبێ گرفت ڕزگاری نابێت. هەروەها، ئەفلاتون (زانین) لە بارەی ناوەڕۆکی بابەتە هونەرییەکانەوە بە مەرج دادەنێت. ئەگەر هونەرمەندێک لە تابلۆیەکدا پیشەی دارتاشی دەربخات، پێویستە دارتاشی بزانێت، ئەگینا ناتوانێت بە دروستی وێنەکەمان نیشاندات. بەبۆچوونی من ئەمە لە هونەری شێوەکارییدا ڕەوا نیە. پێویست ناکات هونەرمەند ئەو زانیارییەی هەبێت. ئەگینا داوا لە هونەرمەندان دەکەین، پێش ئەوەی تابلۆیەک لەسەر دارتاش دروست بکەن بچن دارتاشی فێربن. هەروەها ئەفلاتون لە بارەی دووری هونەر لە ڕاستییەوە دەڵێت؛

دەردەکەوێت لەسەر ئەو خاڵە هاوڕابین، کە لاسایی کەرەوە زانیارییەکی بەسودی لە بارەی ئەو شتەوە نیە لاسایی دەکاتەوە و هەمان کات لاسایی کردنەوە جۆرێکە لە یاریکردن و بە جیدی وەری ناگرین. هەموو شاعیرە تراجیدیاکانیش گرنگ نیە کەم یا زۆر بنوسن، لاسایی کەرەوەن.

ئایا ئەم لاسایی کردنەوەیە لە ڕاستییەوە سێ جار دوور نیە؟

بەڵێ، سێ جار دوورە.(164)

دووری لە ڕاستییەوە بوون بە پلەی نزمتر دەگەیەنێت. لەبەر ئەم

(164) هەمان سەرچاوەی پێشو، ل. 30- 329.



هۆیە هونەر بە هەموو جۆرەکانییەوە، بەتایبەتی هونەری شێوەکاری و شیعر، کە ئەفلاتون بە درێژی لە کۆمارەکەیدا باسیاندەکات، پلەی نزمی جوانی و زانینن؛

من دەمەوێت بەم خاڵە بگەین، کە گوتم هونەری شێوەکاری و لاسایی کردنەوە بەگشتی لە ڕاستییەوە دوورن. لاسایی کردنەوە پەیوەندی بە بەشێکی دەروونەوە هەیە. ئەو بەشە هۆش نیە. نزیکبوونەوەش لەم بەشە ئاکامێکی چاکی نیە.

ڕاستە.

کەوابوو، لاسایی کردنەوە شتێکی نزمە و لەگەڵ شتێکی نزمی دیکەدا جووت دەبێت. شتی نزمتر دەهێنێتە بەرهەم.(165)

هەڵوێستی نەرێی ئەفلاتون بەرانبەر شیعر لە هەڵوێستی بەرانبەر هونەری شێوەکاری باشتر نیە. شیعریش لەبەر چەند هۆیەک بە لاسایی کردنەوە و نزم دادەنێت. من هۆکان لەچوارخاڵدا ڕووندەکەمەوە.(166)

**خاڵی یەکەم** پەیوەندی بە سیستەمی میتافیزیکی ئەفلاتون و فەلسەفەی جوانی ئەفلاتونەوە هەیە، کە بە درێژی باسمان کرد. ڕەخنەکەی ئەفلاتونیش لەسەر هونەری شێوەکاری، وەکو لاسایی

(165) هەمان سەرچاوە. ل 331.

(166) من ئەم خاڵانەم لە نوسراوێکمدا بەناوی (شیعر و فەلسەفە)باسکردووە ولەپەڕتووکەکەمدا (نیهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە)بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە: د. محەمەد کەمال، نهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، دەستگای سەردەم، سلێمانی، 2005 .ل 90 – 93.

کردنەوە و دوورکەوتنەوە لە ڕاستی بەسەر هەموو جۆرەکانی هونەر و دواجاریش بەسەر شیعردا دەسەپێنرێت. شاعیر لە داهێنانی تابلۆیەکی شیعرییدا خۆی بە جیهانی هەستەکی یان شتەکانی نێو ئەشکەوتەکەوە ماندوو دەکات. شتەکانی نێو ئەشکەوتیش ساختە و وەرگیراون و لە ڕاستییەوە دوورن. شیعر باسی فۆرمە بەرزەکان یان ڕاستی دەرەوەی ئەشکەوتمان بۆ ناکات؛ مامەڵە لەگەڵ بابەت و ڕووداوەکانی نێو ئەشکەوت دەکات؛

کەوابوو، خۆمان بەو ئاکامە بگەیەنین، کە شاعیرە لاسایی کەرەوەکان لە هۆمیرۆسەوە (کۆپی) ڕاستی دەناسن و ئەوەی باسی دەکەن ڕاستی نیە؟ ئەمەش لەو خاڵە دەچێت لەپێشتر سەبارەت بە هونەرمەندی شێوەکاری باسمانکرد، کە بەبێ ئەوەی زانیاری لە بارەی پینەچێتییەوە هەبێت تابلۆی پینەچیمان بۆ دەکات.

ڕاستە.

شاعیر وشە و گوتە، وەکو ڕەنگ بۆ وێنە هونەرییەکەی بەکار دەهێنێت. ئەو بەبێ ئەوەی بزانێت ئەوانە چین بەکاریان دەهێنێت. کەسانی نەزان، وەکو خۆی، وادەزانن چاک باسی پینەچێتی و جەنگ، یان شتێکی دیکە دەکات. هەروەها شاعیر دەنگی مۆسیقی و هارمۆنی بە وشەکانی دەدات و ڕیزیاندەکات. ئەگەر هۆنراوەکەی لەمانە ڕووت بکەیتەوە،



دەزانیت چی بەسەر دێت.

دەزانم.

ئەمەش لە دەموچاوی ئەو لاوە دەچێت، کە بەرەو پیری دەڕوات نە چاکە و نە جوانیش.

بە تەواوی وایە.

ئێستا بیر لەم خاڵەش بکەوە، لاسایی کەرەوە هیچ لەبارەی بوونەوە نازانێت. تەنیا دیاردەی بوون دەناسێت. وایە؟ (167)

(بوون) لەم بەشەی دایەلۆگی (کۆمار)دا فۆرمە هەمەکییەکانی جیهانی بەرزە و لەو بۆچوونەوە، کە ئەم فۆرمانە لە ڕێگەی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەوە دەناسرێن، شاعیر ناتوانێت بیاندۆزێتەوە و بیانکات بە هەوێنی شیعرەکانی. کەوابوو، ئەوەی شاعیر باسیدەکات دیاردەی ئەو بوونەیە و خودی بوون نیە؛ دیاردەی جوانییە و خودی جوانی نیە.

**خاڵی دووەم** ئاماژە بۆ سەرچاوەی شیعر هۆنینەوە و ئیلهامی شیعری و کاریگەرێتی شیعر بەسەر بیسەران و خوێنەرانەوە دەکات. ئەفلاتون سۆز بە سەرچاوەی شیعر و دەربڕینی شاعیرانە دادەنێت. کاریگەرێتییەکەشی بەسەر سۆزی بیسەران و خوێنەرانەوە دەکەوێتە گەر. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، واتە لەلایەن شاعیر و بیسەرانیشەوە (هۆش)، کە سەرچاوەی زانینە و ڕاستی ناسە دەور نابینێت و خراوەتە پەراوێزەوە؛

(167) هەمان سەرچاوە، ل 28 – 327.

ئێستا ئەم بەشە هەڵچووە و ئۆقرە نەگرە زەمینە بۆ لاسایی کردنەوە خۆش دەکات. بەشە هۆشەکییە ئارامەکەش، کە وەکو خۆی دەمێنێتەوە لاسایی کردنەوەی ئاسان نیەو کەسانی دیکەش لێی تێناگەن. ئەوەی هۆش هەیەتی بۆ ئەوان شتێکی ئاسان نیە.

بە دڵنیاییەوە.

لێرەدا دەردەکەوێت شاعیر بە سروشت خۆی بە بەشی هۆشەکی دەروونەوە نابەستێتەوە. ئەگەر زیرەک بێت و بیەوێت جەماوەر بە لای خۆیدا ڕاکێشێت. نابێت خۆی لە هۆش نزیک بکاتەوە. بۆ ئەو بەشە هەڵچوە ڕەنگینەکە چاکترە چونکە لاسایی کردنەوەی ئاسانە.(168)

**خاڵی سێیەم** لەسەر پەیوەندی نێوان شیعر و زانین ڕادەوەستێت. مادامەکی هونەر بەگشتی خۆی بە جیهانی هەستەکییەوە گرێدەدات و مامەڵە لەگەڵ بابەت و جوانی نێو ئەشکەوتەکە دەکات، لەسەر و ئەمەشەوە پەنا بۆ سۆز دەبات، ئەوا نابێتە سەرچاوەی (زانین).

ئێمە لەپێشتر باسمانکرد، کە زانین بۆ ئەفلاتون لە پرۆسەی ژوورکێشی دیالێکتیکدا بە گەیشتن بە فۆرمە بەرزەکان سەرهەڵدەدات. هەر شتێک لە بارەی جیهانی هەستەکییەوە بزانین (بۆچوونە) و (زانین) نیە.

(168) هەمان سەرچاوە، ل 333.



**خاڵی چوارەم** پەیوەندی بە جۆری ئەو زانینەوە هەیە هونەرمەند یان شاعیر لە ڕێگەی بەرهەمەکەیەوە بە کەسانی دیکەی دەگەیەنێت. ئەو لە شێوازێکی دەربڕینی هونەرییدا دیاردەیەکمان بۆ دەردەخات. لایەنێکی جوانی بابەتە هەستەکییەکانی نێو ئەشکەوتەکە دەخاتە ڕوو. ئەو جوانییەی لە بەرهەمەکەیدایە ڕێژەییە و هەمیشە، وەکو خۆی نامێنێتەوە. لەژێر حوکمی گۆڕانکارییەکانی نێو کات و شوێن دەرباز نابێت. لەبەر ئەمە شاعیر ناتوانێت بەو زانینە کێشەیەکی هەمەکی و نەگۆڕمان بۆ دروست بکات چونکە ئەوەی شاعیر دەریدەبڕێت (بۆچوونی) خۆیەتی؛ ئەوەی لە چاوی شاعیردا جوانە لە چاوی کەسێکی دیکەدا ناشرینە. هونەر، بەپێچەوانەی ماتماتیکەوە، بۆ نموونە تەوانای دامەزراندنی زانینی هەمەکی و نەگۆڕی نیە.

لەسەرو ئەم هەڵوێستە نەرێیەوە بەرانبەر هونەر بەگشتی و شیعر بەتایبەتی، ئەفلاتون سانسۆر لەسەر بەرهەمی هونەری لە (کۆمار)ەکەیدا دادەنێت. سانسۆرکردنەکەش لەسەر بەرنامەی فێرکردن و پەروەردە ڕادەوەستێت، کە بۆ ڕژێمە یۆتۆپیاکەی دایمەزراندوە.(169) ڕێگە نادات ئەو هونەرمەند و شاعیرانەی بە دیدی ئەو، خزمەتی ڕژێمەکە ناکەن و لەگەڵ فەلسەفە و بەرنامە فێرکردنەکەدا ناجۆرن، لە کۆمارەکەدا بمێننەوە.

(169) هەمان سەرچاوە، ل 36 – 335.

# بەشی هەشتەم

## نەریتی فەلسەفی ئەفلاتونی (ئەفلاتونیزم)

پاش مردنی ئەفلاتون، بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم بیریارە نەک تەنیا جێگەی خۆی چەسپاند و فێرگەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنایە کایەوە هەمان کات زۆرتر گەشەی پێدراو گۆڕانیشی بەسەردا هات. لەپێشتر باسی ئەوەمان کرد، چۆن ئەم نەریتە فەلسەفییە لە سپیاسیپۆسەوە، یەکەم سەرۆکی ئەکادیمیا پاش ئەفلاتون، تاکو ئەو ڕۆژەی دەستەڵاتی ڕامیاری—ئایینی بە تاوانی گومڕایی و بێبڕوایی ئەکادیمییای داخست بەردەوام مایەوە و گۆڕانی تێدا دروست کرا. لەو سەردەمەدا، دەستەڵاتی ئایینی تەنیا دژی ئەفلاتون و نەریتە فەلسەفییەکەی ڕانەوەستا، بەڵکو دژایەتی لەگەڵ هەموو بیرکردنەوەیەکدا ، کە لەسەر بنەماکانی (بڕوا) یان ئایین دانەمەزرابوو دەکرد. دەستەڵاتی ئایینی ئەوەندە لە جیاوازی دەترسا ڕێگەی لە بوارەکان بۆ سەرهەڵدانی جیاوازییەکان و بیروباوەڕی فەلسەفی و زانستی دەبەست. ئەمەش سەردەمێکی تاریک و ژینگەیەکی خنکێنەری بۆ پێشخستنی شارستانیەت هێنایە کایەوە. بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست ڕژێمێکی ستەمکەری بە ناوی ئایین و پیرۆزی دەستگای ئایینەوە بەزۆر سەپاند بەسەر ڕۆژئاوادا. پیاوانی ئایینی بوون بە خاوەنی دەستەڵاتی ڕامیاری و هەموو دیاردە و ڕووداوەکانیان لەبەر ڕۆشنایی پەرتووکە



ئاینییەکەیاندا ڕاڤەدەکرد. ئەوەی نەخرایەتە بەر ڕۆشنایی ئایین ڕەتدەدرایەوە و بەتاوانی گومڕایی و بێبڕوایی لەناودەبرا. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون پەرتووکە ئاینییەکەیان لە کەموکورتی بەدەرە. دەتوانێت، وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە و چارەسەری هەموو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانیش بکات؛ زانینی ئایینی لە هەموو ڕوویەکەوە دروست و تەواوە و خاوەنی ڕاستی ڕەهایە و هەمیشە بە ڕاستی دەمێنێتەوە. ئەم هەڵوێستەی پیاوانی ئایینی لەو سەردەمەدا بوو بە ڕێگە خۆشکەر بۆ پەلاماردان و لەناوبردنی ئەوانەی خۆیان بە زانست و فەلسەفەوە ماندوودەکەن و دەیانەوێت لە دەلاقەیەکی دیکەوە تەماشای ڕاستی بکەن. بۆ نموونە، گیۆردانۆ برونۆ (1548 – 1600)فەیلەسوفێکی ئیتالی، لەو باوەڕەدابوو گەردوون لە کۆتایی بەدەرە و ئەگەری ژیانیش لەسەر ئەستێرەکانی دیکە هەیە. پیاوانی ئایینی برونۆیان بە گومرا لە قەڵەم داو سوتانیان. گالیلۆ گالیلی (1564 – 1642) زانایەکی فیزیا و ئەستیرەناس لەگەڵ کۆپرنێکۆسدا لەسەر بیردۆزەی (هیلیۆ سێنتریک)هاوڕابوو. لەو باوەڕەدابوو، پیاوانی ئایینی بە هەڵەداچوون و خۆر بە دەوری زەویدا ناسوڕێتەوە بەڵکو بەپێچەوانەیە؛ زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. گالیلۆ فەرمانی گرتنی دەرکراو ڕێگەی پێنەدرا بۆچوونەکانی بڵاوبکاتەوە. شایەنی باسە، کە پیاوانی ئایینی تەنیا دژی زاناو فەیلەسەفەکان نەدەوەستان. ئەو مرۆڤە خواپەرستانەشیان سەرکوت دەکرد، کە

ڕەخنەیان لە دەستەڵات دەگرت. شوێنکەوتوانی (پیتەر والدۆ) مەسیحی بوون و هەرچی سامانیان هەبوو بەسەر هەژاراندا بەخشیانەوە و خۆیان زاهیدانەو هەژارانە دەژیان. کاتێک ڕەخنەیان لە ژیانی پڕسامان و خۆشی پیاوانی ئایینی گرت لە ساڵی 1184 دران بە دادگای ئایینی (ڤیرۆنا) و تاوانی گومراییان خرایە پاڵ.(170)

بەهەر حاڵ، دادگاییکردنی زانا و فەیلەسوفەکان بە دەستی پیاوانی ئایینی بوو بە بەرنامەیەکی ڕامیاری ڕۆژانە و هەرکەسێک کەمێک لاری لە ئایین و بۆچوونی پیاوانی ئایین هەبوایە سزا دەدرا. لەژێر باری گرانی ئەم ستەمەدا چەند بیریارێک لەنێو بەستێنە ئایینییەکەوە، هەوڵیان دا فەلسەفە لە ئایین نزیک بکەنەوە و بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتون، کە ئەوەندە لەگەڵ بۆچوونی ئایینیدا ناکۆک نەبوو، بگونجێنن. لەم هەوڵدانەدا چەند بیریارێک لە ئەسکەندەرییە بوون بە پێشەنگی ئەم کاروانە. لەنێویاندا یەکەم بیریار فیلۆ (25 پێش زانین —50 زایین) فەلسەفەی ئەفلاتون و یەهودییەتی تێهەڵکێش کرد. کلیمنت (150–215) و ئۆریگن (185–254)، کە هەردووکیان فەلسەفەیان لای ئەمۆنێوس ساکاس (175–242) خوێندبوو، فەلسەفەی ئەفلاتونیان لە مەسیحایەتییەوە نزیک کردەوە. دواجاریش ئەفلوتین (204–270) گەشەی بەم نزیک بوونەوەیەدا و نەریتێکی ئەفلاتونی—مەسیحایەتی بە ناوی (ئەفلاتونییەتی نوێ) دامەزراند.

(170) Bertrand Russell, *History of Western Philosophy*, London: Routledge Taylor and Francis Group, 2002. P. 440.



ئەفلوتین فەیلەسوفێکی یۆنانی و ئەفلاتونی—مەسیحییە؛ بە زمانی یۆنانی نوسیویەتی. پاش مردنی یەکێک لە خوێندکارەکانی بە ناوی (پرۆفیری) نوسراوەکانی کۆکردەوە و بەسەر شەش بەشدا دابەشی کردن و لەهەر بەشە (نۆ) نوسراوی دانا. لەبەر ئەمە ناوی بەرهەمەکەی ئەفلوتین (ئینیادس)ە، کە لە زمانی یۆنانییدا واتای (نۆ) دەبەخشێت. بیرۆکەی چاکەی بەرز و دەرچوون لە ئەشکەوتەکە بەرەو ڕووناکی بوون بە هەوێنی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم بیریارە. ئەفلوتین لەو باوەڕەدایە، فۆرمی چاکەی بەرز ئەو بوونە تاکڕەوە و سادەیەیە، کە هەموو شتێکی لێوە دەرچووە و بووە بە سەرچاوەی هەموو هەبووەکان.

بەم جۆرە بە بیرۆکەی (ڕێژەن) گەیشت و و بوونی لە چەند نهۆمێکی بەرز و نزمدا دانا. لەسەر و هەموویانەوە (یەک)ە یان ئەو بوونەیە هەمیشە هەبووە و سەرچاوە و کانیاوی هەموو ئەو شتانەیە لە پاش خۆیەوە سەریان هەڵداوە. لەم بوونەوە ئاگامەندی هەمەکی دەرچووە و لەوێشەوە گیانی هەمەکی و ئەنجا ئەستو. دوا جاریش گیانی هەمەکی و ئەستو یەکیان گرتوە و زیندەوەرە هەندەکییەکان، کە خاوەنی گیان و لەشن سەریان هەڵداوە. ئەم دەرچوونەش تاکو بەردەوام بێت و ڕوو لە خوارەوە بکات بەرەو تاریکی و جیهانی ئەستویی دەڕوات و خراپە و ناشرینی پەیدا دەکات. (171)

(171) Plotinus, *The Six Enneads*, translated by Stephen Mck Kenna and B.S. Page, Chicago: Willian Benton, Publisher, 1952. Pp. 27-34.

بۆ ئەوەی مرۆڤ بە چاکی و پاکی بگات، پێویستە هەوڵبدات خۆی لە جیهانی ئەستویی و حەز و ئارەزووەکانی لەش دوور بخاتەوە و بەرەو سەرچاوە، کە نیشتمانی ڕەسەنی ئەوە بگەڕێتەوە. لەگەڵ (خوا)دا یەک بگرێتەوە. هەروەها، ئەفلوتین بانگەشەی ئەوەی کردووە، کە بەو پلەیە گەیشتوە و لەگەڵ خوادا بووە بە یەک.(172) بێگومان، ئەم بانگەشەیەش لەلای هەندێک سۆفی موسوڵمانیش، وەکو بیستامی، حەلاج و ڕومی...هتد دەبیستین و دوا پلەی ئەم جۆرە سۆفیگەرایەتییەیە.

پاش ئەفلوتین، ئۆگەستاین (345–430)، کەشیشی شاری هیپۆ ڕیگیۆس (ئێستا شاری ئەنەبایە لە جەزائیر) گەشەی بە نەریتی ئەفلاتون دا. ئۆگستاین لە دوو پەرتووکیدا بە ناوی (دانپێدانان) و (شاری خوا) بیروباوەڕە فەلسەفییەکانی خۆی ڕوونکردۆتەوە، کە بە ئاشکرا فەلسەفەی ئەفلاتون و مەسیحایەتی لە یەکداوە. لەو باوەڕەدایە بۆچوونەکانی ئەفلاتون سەبارەت بوونی خوا، وەکو سەرچاوەی بوون و ڕاستی و زانین لەگەڵ مەسیحایەتیدا هاوتەراز ڕادەوەستن و ناکۆک نین. بەڵام کێشەی گەورەی نێوان فەیلەسوفەکان و پیاوانی ئایینی لەگەڵ ئافەریدکردنی جیهان لە هیچەوە بەرجەستە دەبێت. بەگوێرەی تەورات، کە سەرچاوەی برواو زانینی ئایینییە،

(172) Plotinus, *The six Enneads*, P.V i.
پرۆفیری خوێنکاری ئەفلوتین باسیدەکات، کە مامۆستاکەی بە پلەی یەکگرتن لەگەڵ خوادا (چوارجار) گەیشتوە.



خوا جیهانی لە (هیچ) ەوە ئافەرید کردوە.بۆ ئەفلاتون و دواجاریش ئەریستۆ ئافەریدکردنی شتێک لە هیچەوە لۆجیکمەندانە نیە و ئەوەی لە هیچەوە پەیدا دەبێت هیچە. ئەمە لەبەردەم فەیلەسوفە موسوڵمانەکانیشدا بووە بە گرفتێکی گەورە چونکە قورئانیش پەیڕەوی هەمان بۆچوونی نێو تەورات دەکات و لە دواییدا باسی دەکەم.

لەم ڕووەوە، (خوا) بۆ ئەفلاتون ئافەریدکەری (فۆرم)ە و (ئەستو– ماتەر)ی نەهێناوەتە کایەوە. بۆ لەناوبردنی ئەم ناکۆکییەی نێوان فەلسەفەی ئەفلاتون و بۆچوونی نێو تەورات لەسەر ئافەریدکردنی جیهان، ئۆگەستاین بۆ ئایین گەڕاوەتەوە و پەیڕەوی (تەورات)ی کردووە.(173)

لێرەوە بەو ئاکامە گەیشتوە، کە مادام خوا بوونێکی هەمیشەیی هەیە و هیچ شتێک لە پێش ئەودا نەبووە و جیهانیشی ئافەریدکردوە، ئەوا (کات) لەگەڵ ئافەریدکردنی جیهاندا پەیدا دەبێت و جیهانیش کاتی و بڕاوەیە.

پەرتووکەکەی (شاری خوا)، کە پانزەساڵ خەریکی نوسینی بووە، کاریگەرێتی ئەفلاتون بەتایبەتی دایەلۆگی (کۆمار)ی پێوە دیارە. بەڵام، شاری خوا، بەپێچەوانەی کۆمارەکەی ئەفلاتونەوە، لەسەر دەستەڵاتی فەیلەسوفەکان دانامەزرێت و شاری دەستەڵاتی پیاوانی

(173) St. Augustin, *Confession*, translated with an intraduction by R.S. Pine-Coffin, London: Penguin Books, 1961. Book x, 22.

ئایینی مەسیحایەتییە و ئەو ڕژێمەیە لەسەر بنەماکانی ئایینی مەسیحایەتی دامەزراوە.(174)

فەلسەفەی ئەفلاتون کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی چەند زانایەکی موسوڵمان و ئەم نەریتە لەنێویاندا باو بووە. فەلسەفە لەنێو موسوڵماناندا لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسییەوە، کە پاش ڕوخانی دەوڵەتی ئەمەوی لە ساڵی750 تاکو داگیرکەدن و وێرانکردنی شاری بەغداد بە دەستی مۆنگۆلەکان لە ساڵی1258 دا بەرقەرار بووە. مەئمون کوڕی هارون ئەلرەشید لە ساڵی813 پاش کوشتنی (ئەمین)ی برای فەرمانڕەوایی گرتە دەست. مەئمون، کە لە دایکەوە فارس بووە، کەسێکی ڕووناکبیر بووە و هەوڵی فێربوونی داوە. بزوتنەوەی (موعتەزیلە)ش کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی و بووە بە یەکێک لەوان و لەبەر ڕۆشنایی بیرکردنەوەی هۆشەکییدا لە بڕوا و ئایین تێگەیشتوە. هەرچەندە سەردەمی مەئمون لە ئاژاوە بەدەر نەبووە، تەنانەت عەرەبەکانی عێراقیش بە سەرکردایەتی (نەسر کوڕی شەبەس) لەبەر ئەوەی مەئمون عەرەبێکی ڕەسەن نەبووە، دژی وەستاون و داوای ڕوخانی ڕژێمەکەیان کردوە. لە شاری بەسرە و وڵاتی میسریش بزوتنەوەی چەکدارانە دژی ڕژێم بەرپاکراوە. لە کوفە (ئیبن ئەلسرایا) شۆڕشی دژی بەغداد کردووە.

(174) St. Augstine, *City of God*, translated by Henry Bettenson, with a new introduction by G.R. Evans, London: Penguin Books, 2003. Book xi, 1, P. 429.



ئەحمەد کوڕی حەنبەل، کە دوایی بە دامەزرێنەری مەزهەبی حەنبەلی دانرا بەردەوام دژی مەئمون و موعتەزیلەکان ڕاوەستاوە و تەنانەت مەئمون زیندانیی کردوە. دوای مردنی مەئمون لە زیندان ئازادکراوە. بێگومان ئاژاوە و کوشتن و بڕین لە جیهانی ئیسلامیدا و لەو سەردەمەشدا نوێ نەبووە. پاش کوشتنی خەلیفە عوسمان کوڕی عەفان، لە ساڵی656 دا بە دەستی تاقمێک موسوڵمان، کە لەگەڵ سیاسەتی خەلیفەدا ناکۆک بوون، جیهانی ئیسلامی ئارامی بە خۆوە نەدی. جەنگی ناوخۆ و ئاشوب بە جەنگی (الجمل) لەنێوان خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عایشەی ژنی پێغەمبەر سەریهەڵدا. لە ساڵی 657 پاش جەنگی (سەفین) لەنێوان خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و موعاوییە کوڕی ئەبو سوفیان، فەرمانڕەوای شام، لە ئەنجامی تاوانبارکردنی خەلیفە عەلی لەلایەن لیژنەی حەکەمەوە، تاقمێک لە خەلیفە جیابوونەوە و بزوتنەوەی (خاریجە)یان دامەزراند. ئەم بزوتنەوەیەش چەند لقێکی لێ جیابووەوە و هەر یەکێک لەو لقانە کەوتنە (تکفیر)کردنی لایەنە موسوڵمانەکانی دیکە و کوشتن و تاڵانکردن.(175)

دواییش ئاگری ئەم جەنگە بە کوشتنی حوسەین کوڕی عەلی لەلایەن یەزیدی کوڕی موعاوییەوە لە ساڵی 680 دا زیاتر پەرەی سەند. ڕوخانی ئەمەوییەکان بە دەستی عەباسییەکان و سەرهەڵدانی ناڕەزایی

(175) بڕوانە: الامام آبی الحسن علی بن اسماعیل الاشعری، کتاب مقالات الاسلامیین و اختلاف المصلین،الطبعة الثانیة، دارنشر فرانز شتاینر، فیسبادن،1980. ص 86- 87.

دەربڕینی ئەو موسوڵمانانەی خۆیان بە شوێنکەوتوانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دادەنا و دوایی بە (شیعە) ناوزەدکران، شۆڕشی کۆیلە پێست ڕەشەکان لە خواروی عێراق و بزوتنەوەی قەرمەتییەکان و زۆری تریش، کە لەم بوارەدا جێگەی باسکردنیان نابێتەوە، جیهانی ئیسلامیان هەژاند. ئەم کەژە نالەبارە ڕامیارییە و جەنگە ناوخۆیە، تاکو سەردەمی مەئمون کوڕی هارون ئەلڕەشید بەردەوام مایەوە. مەئمون پاش کوشتنی (ئەمین)ی برای لە ساڵی813 بوو بە خەلیفە. لەبەرئ ەوەی بەپێچەوانەی (ئەمین)ە و دایکی مەئمون فارس بوو، هەندێک لە عەرەبەکانی عێراق بە سەرۆکایەتی (نەسر ئیبن شەبەس) دژی وەستان و بە عەرەبێکی ڕەسەنیان دانەدەنا. هەروەها بزوتنەوە دژی مەئمون لە بەسرە و چواردەوری کوفە بە سەرۆکایەتی (ئەبی ئەلسەرایا) و لە میسر سەریان هەڵدا. (176) لەگەڵ ئەمەشدا مەئمون توانی شاری بەغداد، کە ئەو سەردەمە پایتەختی عەباسییەکان بوو، بکات بە مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری بۆ گەشەپێدان بە بیرکردنەوەی زانستییانە و فەلسەفییانە. (177) بۆ ئەم مەبەستەش خوێندنگایەکی بە ناوی (بيت الحكمة – خانەی حیکمەت)لە ساڵی 832 دامەزراند.

(176) د. ابراهيم حسن، تآريخ الاسلام، الجزء الثانى، دارالاندلس، بيروت، 1964. ص 67- 70

(177) مەنسور خەلیفەی عەباسییەکان لە ساڵی 762 لەسەر ڕووباری دیجلە شاری بەغدای دروست کرد و ناوی (مدينة السلام)ی لێنا. لەو کاتەوە تاکو ڕوخانی عەباسییەکان و وێرانکردنی بەغداد بە دەستی مۆنگۆلەکان لە ساڵی 1258 دا ئەم شارە بنکەیەکی گرنگی فێربوون و زانین بوو لە جیهانی ئیسلامییدا. لە ساڵی 1921 بوو بە پایتەختی دەوڵەتی عێراق.



زانایانی ئایینی جولەکە و مەسیحی، کە شارەزاییان لە زانستەکان و فەلسەفەدا هەبوو لەخۆی کۆکردەوە و هانی دان پەرتووکە زانستی و فەلسەفییەکان لە زمانی سریانی و یۆنانییەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕن. مەئمون کەسێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوو. باوەڕی بە توێژینەوە لەبەر ڕۆشنایی (هۆش)دا هەبوو. بۆچوونی ئایینی دەستەی (موعتەزیلە)ی پەسەندکرد و بوو بە یەکێکیش لەو دەستەیە. بزوتنەوەی وەرگێڕانیش لە بەغداد لەژێر چاودێری زانایانی خانەی حیکمەت دەستی پێکرد. خەلیفە زانای مەسیحی، یەحیا کوڕی ماسەویەی بە یەکەم سەرۆکی خانەی حیکمەت دانا. پاش مردنی یەحیا زانایەکی دیکەی مەسیحی بە ناوی حونەین کوڕی ئیسحاق بوو بە سەرۆکی خانە. بێجگە لە یەحیا و حونەین ژمارەیەکی زۆر بەشدارییان لە بزوتنەوەی وەرگێڕاندا کرد و زۆرینەیان مەسیحی بوون. بۆ نموونە، یەحیا کوڕی بەتریق، عەبدول مەسیح کوڕی ناعمە ئەلحمسی، ئەبی بەشیر مەتتا قەنائی، یەحیا کوڕی عودەی، خێر کوڕی خەمار، سابت کوڕی قرە و هەندێکی تریش. (178)

لەنێویاندا زانایەکی جولەکەش بە ناوی (ماشائەڵا) بەشداری ئەم چالاکییەی کردوە. حونەین کوڕی ئیسحاق چەند دایەلۆگێکی ئەفلاتونی، وەکو پارمەنیدس، کراتیلۆس، سیاسەتمەدار، کۆمار و یاساکان بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕاوە. ئیسحاق کوڕی حونەین چەند

(178) Majid Fakhry, *A History of Islamic Philosophy*, New York: Columbia University Press, 1970. P. 7.

بەشێکی دایەلۆگی سەمپۆزییەمی کردوە بە عەرەبی.(179) هەروەها ژمارەیەک لە نوسراوەکانی ئەریستۆشیان وەرگێڕاوە، بەڵام من بۆ دامەزراندنی پەیوەندی بیریارانی موسوڵمان بە ئەفلاتونەوە، تەنیا باسی وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەفلاتون دەکەم. دەردەکەوێت دایەلۆگەکانی ئەفلاتون بەتەواوی بۆ زمانی عەرەبی وەرنەگێڕدرابن. تەنیا چەند بەشێکیان هەڵبژێدراون، ئەم بەشانەش لە بەرهەمە کۆکراوەکانی (گالن)ە وە وەرگیراون.(180)

ژمارەیەکیش لە زانایانی شاری حاران بەشداری بزوتنەوەی وەرگێڕانیان کردوە. دانیشتوانی ئەم شارە خاوەنی زانست و فەلسەفە بوون و بەتایبەتی لە ئەستێرەناسییندا شارەزا بوون، بەڵام سەر بە هیچ ئاینێکی ناوچەکە، وەکو یەهودییەت و مەسیحایەتی و ئیسلام نەبوون. خەلیفە مەئمون داوای لێکردن، بۆ ئەوەی بتوانێت بیانپارێزێت، ئاینێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن. ئەوانیش بوون بە (سابئی) و هێرمسیان بە پێغەمبەری خۆیان داناوە.

بێگومان (سابئییەکان) لەپێش ئەواندا هەبوون و شوێن یەحیا (یوحەنا) مەعمەدانی دەکەون. ئەم دەستەیە لای موسوڵمانەکان بە یەکێک لەخاوەن کتێب (آهل الکتاب) دادەنرێن و لە قورئاندا باسکراون.

(179) هەمان سەرچاوە. ل 13.

(180) گالن (129 – 200 زایین) پزیشک و فەیلەسوفێکی یۆنانی بووە و هەوڵیداوە زانستی لۆجیک و پزیشکی پێکەوە ببەستێتەوە. لە بەرهەمێکیدا پوختەی چەند بەشێکی لە دایەلۆگەکانی ئەفلاتون کۆکردۆتەوە و لە یەک بەرگدا بڵاویکردونەتەوە.



بەم جۆرە خۆیان لە فتوای کوشتن لەلایەن پیاوە ئایینیە توندڕەوەکانەوە پاراستوە.(181) دواجار ئەم شارە لەلایەن مۆنگۆلەکانەوە لە ساڵی 1269 وێران کرا. لە ئەفسانەی یۆناندا دوو (هێرمس)هەن.

**یەکەم،** هێرمس ئەو پاڵەوانەیە لە خواوە پەیام بە مرۆڤ دەگەیەنێت چونکە تێگەیشتنی مرۆڤ لە ئاستی پەیامی خوادا کەم دەستەڵاتە. (هێرمس) بە ڕاڤەکردنەوە پەیامەکە بە مرۆڤ دەدات. لەم ئەفسانەیەوە هونەری ڕاڤەکردن یان هیرمنیوتیکس هاتۆتە کایەوە. هێرمسی زانایانی حاران ئەم پاڵەوانە نیە.

**دووەم،** هێرمس کە مەبەستی باسەکەمانە کەسایەتییەکی نادیارە و هاوکات بە دامەزرێنەری زانستە سروشتییەکان و فەلسەفە دادەنرێت. ئەم پاڵەوانە بووە بە پێغەمبەری زانایانی حاران. زانا موسوڵمانەکانیش، وەکو گروپی (ئیخوان ئەلسەفا) و سوهرەوەردی نوسەیرییەکان و دروز؛ هەندێک لە سۆفییەکانیش وەکو زەلنون میسری، کە زانایەکی کیمیاش بووە، ئەبو سەعید ئەلخەزەر و حەلاج کوڕی مەنسور بایەخیان هێرمس داوە. سوهرەوەردی لە پەرتووکەکەیدا (حکمة الاشراق) هێرمس بە یەکەم فەیلەسوف و دامەزرێنەری (ئیشراقی) دادەنێت. لەو باوەڕەدایە بیرکردنەوەی فەلسەفی لەم زانایەوە سەریهەڵداوە و (تالیس) بە یەکەم فەیلەسوف

(181) قورئان لە سێ شوێندا باسی (سابئییەکان) دەکات. بڕوانە:سورەتی بەقەرە:62، مائدە: 69، حەج: 17.

له ڕۆژئاوادا دانانێت. هێرمس له شارستانییەتەکانی دیکەشدا باسکراوە.گوایە پاش لافاوی نوح و پاش نەمرود، هێرمس شاری بابلی ئاوەدان کردۆتەوە و کردوویەتی بە بنکەیەکی زانستی و فەلسەفی. میسرییە کۆنەکان لەو باوەڕەدان هێرمس ناوی (توت)بوە و لە (مەناف) نزیک شاری (فوستات) لە دایک بووە. ئەو شارەش پێش ئەسکەندەرییە بنکەیەکی زانستی بووە. لای جولەکەکانیش هێرمس (ئۆغ نوخ)ە و فارسەکانیش بە (هۆشنگ) ی دادەنێن.(182) هەندێک لە موسوڵمانەکانیش لەو باوەڕەدان هێرمس ناوی (ئیدریس)ە و یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی لە قورئاندا ناوی هێنراوە.(183) ئیبن ئەلنەدیم لە فەهرەستەکەیدا بیست و دوو پەرتووکی هێرمسی بە زمانی عەرەبی باسکردووە. سیانزە پەرتووکیان لەسەر کیمیا و چوار لەسەر جادوگەری و پێنجیان لەسەر ئەستێرەناسییە.(184)

بێجگە لە دایەلۆگەکانی ئەفلاتون پەرتووکی (ئینیادس)ی ئەفلوتینیش بە عەرەبی کەوتۆتە بەردەستی خوێنەری موسوڵمان. عەبدول مەسیح ئیبن ناعمە ئەلحمسی (835 مردووە) لەسەر داواکاری ئەلکەندی، یەکەم فەیلەسوفی موسوڵمان و عەرەب، ئەم پەرتووکەی وەرگێڕاوە.

(182) Seyyed Hossein Nasr, *Islamic Studies*, Beirut: Librairie du Liban, 1967. Pp. 64-65.

(183) بڕوانە: قورئان، سورەتی مریەم: 56.

(184) کتاب الفهرست، دارالکتاب العلمیة، بیروت، 1996، س،267، 312، 353.

Richard Walzer, *Greek into Arabic: Essays on Islamic Philosophy*, Oxford: Bruna Cassirer, 1962. Pp. 119-20.



بەڵام ئەلکەندی بەناوی (تیۆلۆجی ئەریستۆ) پەرتووکەکەی بڵاوکردەوە ناوی ئەفلوتین شاراوەتەوە.(185) بێگومان ئەمەش هەڵەیەکی گەورەبووە لەلایەن ئەم زانایەوە. فەلسەفەی ئەفلوتین، کە لەسەر بیردۆزەی ڕێژەن ڕادەوەستێت، بانگەشەی دەرچوونی جیهان لە بوونی خواوە دەکات، جێگەیەکی گرنگی لە بۆچوونی فەلسەفییانەی هەندێک لە فەیلەسوفە موسوڵمانەکان داگیرکردوە. ئەم شێوە میتافیزیکە، کە بە ئەفلاتونییەتی نوێ ناوزەدمان کرد، بووە بە بناغەی فەلسەفەی گروپی ئیخوان ئەلسەفا و فارابی، ئیبن سینا، سوهرەوەردی و مەلاسەدرا و شاوەلی و زۆری تریش. شوێنکەوتوانی ئیخوان ئەلسەفا یەکەم بیریار بوون بیردۆزەی (ڕێژەن)یان لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامییدا تێهەڵکێش کردوە. ئەم گروپە، کە تاکو ئەمڕۆ ئەندامەکانی نەناسراون، لەسەدەی دەیەمدا لەشاری بەسرە دامەزراوە. گۆڤارێکیان بۆ دەربڕینی بیروباوەڕیان بە ناوی (الرسائل) دەردەکردوە. گۆڤارەکە بەنهێنی دەرکراوە، نوسەری بابەتەکانی ناوی خۆیان نەنوسیوە.(186)

(185) Peter Adamson, *The Arabic Plotinus: A Philosophical Study of the Theology of Aristotle*, London: Duckworth 2002. P. 27

(186) تاکو ئێستا نازانین نوسەرەکانی (الرسائل) کێ بوون، کە 52 ژمارەیان دەرکردوە و لەسەر هەموو جۆرەکانی زانست و فەلسەفە نوسیویانە. گوایە جابر ئیبن ئەبو حەیانی تەوحیدی لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ وەزیر ئیبن سادان ناوی پێنج نوسەری هێناوە، کە ئەمانەن: زەید کوڕی ڕیفاعی، ئەبو سولەیمان ئەلبەستی (بە ئەلموقەدەسیش ناسراوە)، ئەبو حەسەن ئەلزەنجانی، ئەبو ئەحمەد ئەلنەهرەجوری و ئەلعەوفی ئەلبەسری. جابر آبوحیان التوحیدی، الامتاع و المآنسة، الجزء الثانی، القاهرة، 1942. س 4.

هەروەها: هنری کوربان، تاریخ الفلسفة الاسلامیة، عوایدات للنشر، بیروت، س 210.

ئەمەش پەیوەندی بە بۆچوونی گروپەکەوە هەبووە، کە لە دوو لاوە، لەلایەن موسوڵمانە سونییەکان و شیعەکانی سەر بە ئیمام موسا (ئیمامی حەوتەم) دژایەتییان لەگەڵدا کراوە. مێژوونوسان بە ڕادەیەک گەیشتونەتە ئەو باوەڕەی ئەم گروپە شیعەی ئیسماعیلی بوون. لەبەر ئەمەش، ئەو کاتەی دەوڵەتی فاتمی لە میسر لەلایەن شیعەی ئیسماعیلییەوە دامەزرا، بایەخێکی زۆر بە ئیخوان ئەلسەفا و بۆچوونە فەلسەفییەکانیان درا.(187)

نەریتی فەلسەفی ئەفلاتونی لەنێو بیروباوەڕەکانی فارابی و ئیبن سینادا ئاشکرا دەردەکەوێت. فارابی (879–950) سیستەمە مێتافیایکییەکەی پەیڕوی بیردۆزەی (ڕێژەن) دەکات. فەلسەفە ڕامیارییەکەشی تێهەڵکێشەی ئەم بیردۆزەیە و بۆچوونەکانی ئەفلاتونە. لەو باوەڕەشدایە بۆچوونە مێتافیزیکییەکانی ئەفلاتون و ئەریستۆ هێندە لە یەکدییەوە جیاواز نین و دەتوانرێت هاوتەراز بکرێن. بۆ ئەم کارەش پەرتووکێکی بە ناوی (الجمع بين آراء الحكيمين) نوسیوە. فارابی جیهان و هەموو بابەتە جیاوازەکان لەنێو جیهاندا بۆ سەرچاوەیەک دەگەڕێنێتەوە، ئەویش بوونی خوایە.

(187) دەوڵەتی فاتمی لە ساڵی 909 لە تونس سەعید کوڕی حوسەین، کە خۆی بە نەوەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و فاتمە دادەنا، دایمەزراند. دواجار قاهیرە بوو بە پایتەختی ئەم دەوڵەتە و هەر یەکێک لە خەلیفەکانی خۆی بە ئیمام و نەوەی عەلی دادەنا. لە ساڵی 972 مزگەوتی ئەزهەر و ساڵی 1125 مزگەوتی ئەحمەریان دروست کرد، کە لە ڕووی ئەندازیارییەوە شاکاربوون. هەروەها لە ساڵی 1005 خوێندنگایەکیان، وەکو خانەی حیکمەتی بەغدا بە ناوی (دارالحكمة) دامەزراند. ئەم دەوڵەتە لە ساڵی 1171 بە دەستی سەلاحەدینی ئەیوبی ڕوخا.



لەم بوونە هەموو شتەکانی دیکە لە پرۆسەی (ڕێژەن)دا لەوەوە دەرچوون تا دەگەنە دوورترین و تاریکترین کەنار. مرۆڤ دەتوانێت لەهەمان ڕێگەوە خۆی بە سەرچاوەکەی بگەیەنێت و لە تاریکی ڕزگاری ببێت. بۆ ئەم کارەش دەبێت کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی دادوەر دابمەزرێت. مەرجیش بۆ دامازراندنی ئەم دەوڵەتە، فەرمانڕەواییکردنە لەلایەن فەیلەسوف یان چەند فەیلەسوفێکەوە، کە ئەو بە (ئیمام) ناوزەدیان دەکات.(188) فارابی کۆمەڵێک خەسڵەتی داناوە، کە مەرجن بۆ بوونی ئەم فەرمانڕەوایە، بەڵام لەسەرو هەموویانەوە، کە من دەمەوێت ئاماژەی بۆ بکەم جۆری زانینە. ئەم خەسڵەتەش فەرمانڕەواکەی فارابی و ئەفلاتون لە (کۆمار)دا لە یەکدی نزیک دەکەنەوە. من لەپێشتر ڕوونم کردەوە، کە فەیلەسوفە فەرمانڕەواکەی ئەفلاتون ئەو مرۆڤەیە خۆی لە دۆگمای نێو ئەشکەوت ڕزگار دەکات و ڕاستی بوون یان (خۆر) دەبینێت، کە دواجار ئەفلاتون بە فۆرمی چاکەی بەرزی دادەنێت. لەم حاڵەتەدا فەیلەسوف بۆ ئەفلاتون ڕاستی ناسە یان بەرزترین جەوهەری بینیوە و لە ئاستی ئەو کەسانەدا دادەنرێت، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە سەرچاوەی بوون یان خواوە هەیە. بێگومان چەمکی (ئیمام)، کە لای ئەفلاتون لە جێگەی ئەم (فەیلەسوف) دانراوە، لە مەبەست بەدەر نیە و دەکرێت لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دابنرێت. لەلایەکەوە ئەم چەمکە لە زمانی عەرەبیدا واتای

(188) Al-Farabi, *Mabadi Ara Ahl al-Madina al-Fadila*, translated by Richard Walzer, with Arabic text, Oxford: Clarendon Press, 1985. P. 245.

ڕابەر و پێشەوا دەگرێتەوە و لە مزگەوتیشدا (ئیمام) ئەو کەسەیە پێش نوێژی دەکات. دەشێ فارابی ئەم چەمکەی بە واتای پێشەوا بەکارهێنابێت. بەڵام لەو بۆچوونەوە، کە ئەم پێشەوایە دەبێت زانینەکەی لەسەر ناسینی ڕاستی و پەیوەندی ئەو بە ڕاستی بەرزەوە دروست بوو بێت، ئەوا چەمکەکە بۆ مەبەستێکی زمانەوانی ڕووت بەکارنەهاتوە. گرنگە ئاماژە بەو خاڵە بدەین، کە فارابی موسوڵمانێکی شیعە بووە و (ئیمام)یش لە مەزهەبی شیعەکاندا بەرزترین دەستەڵاتی ئایینی و (مەرجەع)ە، کە بەبێ ئامادەبوونی ئەو دەوڵەتێکی ئیسلامی شیعە دانامەزرێت. فارابی جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە (ئیمام) یان فەرمانڕەوا فەیلەسوفەکە، لە ڕێگەی بەشێکی هۆشیەوە، کە بە (هۆشی چالاک) دەناسرێت، پەیوەندی بە بەرزترین ڕاستییەوە هەیە و لەوێوە ئیلهام وەردەگرێت.(189) ئیبن سینا (980–1037) فەیلەسوفێکی دیکەی موسوڵمانە، کە پەیڕەوی ئەفلاتون، ئەفلوتین و فارابی لە سیستەمە میتافیزیکییەکەیدا دەکات. ئەم بیریارەش لەو باوەڕەدایە جیهان لە هیچەوە ئافەرید نەکراوە و لە پرۆسەی ڕێژەندا لە بوونی خواوە دەرچووە. بوونی خوا سەرچاوە و بنەرەتی هەبووەکانە.

(189) هەمان سەرچاوە. لە سەردەمی فارابیدا دوو دەوڵەتی ئیسلامی شیعە؛ یەکێکیان دەوڵەتی حەمدانی لە حەڵەب و دووەمیان فاتمی لە میسر هەبوون. بەڵام بەگوێرەی پەرتووکەکەی، فارابی ئەم دوو دەوڵەتە بەو ڕژێمە ڕامیارییە دانانێت، کە باسی دەکات. ئەم بیریارە لە بەغدادەوە چوو بۆ حەڵەب و لای سەیف ئەلدەولە (لە ساڵی 944 تاکو 967 فەرمانڕەوایی کردوە) مایەوە. بەڵام فارابی، وەکو موتەنەبی شاعیر (968 مردووە) ستایشی بۆ نەکرد و بەو فەرمانڕەوایە لێهاتوەی دانەناوە، کە لە پەرتووکەکەیدا باسیدەکات.



هەبووەکان لەسەر بوونی خوا ڕادەوەستن و بەبێ ئەو نابن. بەڵام خوا لەسەر ئەوان ڕاناوەستێت. لەبەر ئەمە خوا بوونێکی پێویستە و هەبووەکانیش، کە جیهان و هەموو هەبووە فرە جۆرەکانی نێو جیهانە بوونیان ئەگەرە و پێویستیان بە بوونە پێویستەکەیە.(190) ئیبن سینا دوو کێشەی فەلسەفی لە سیستەمە مێتافیزیکییەکەیدا باسکردووە، کە بوونەتە هۆی ناڕازی ڕووگرژی پیاوانی ئایینی. دواجاریش ئیمام غەزالی دژی فارابی و ئیبن سینا پەرتووکێکی بە ناوی (تهافت الفلاسفة) نوسیوە و نەک تەنیا ئەم دووکێشەیە بەڵکو چەند کێشەیەکی دیکەشی تیایدا باسکردووە و ڕەخنەیان لێدەگرێت.(191) کێشەی یەکەمیان هەمیشە بوونی جیهان و دووەمیان زانینی خوایە سەبارەت بابەتە هەندەکییەکان. بۆ ئیبن سینا مادام خوا سەرچاوەی هەموو شتێکە و جیهان لەوەوە دەرچووە و هەمیشەییە، ئەوا هۆکردەکەشی یان جیهان دەبێت هەمیشەیی بێت. ئەمەش لەسەر پەیوەندی نێوان هۆ و هۆکردەکە ڕادەوەستێت.

(190) ئیبن سینا، کتاب النجاة فی الحكمة المنتقية و التبيعية والالهية، دار آفاق العربية، بیروت، 1982. س 260 – 264.

(191) بێجگە لەوەی ئیمام غەزالی لەگەڵ بۆچوونی ئەم فەیلەسوفانەدا نیە، هێرش کردنەکەشی پەیوەندی بە بارودۆخی ڕامیاری سەردەمەکەوە هەیە. ئیمام غەزالی لە بەغدا لەو خوێندنگایەدا، کە نیزام ئەلمولک وەزیری مەلیک شاه، سوڵتانی سەلجوقییەکان دایمەزراند مامۆستا بوو. سەلجوقییەکان (1038– 1092) بە ڕەگەز تورک بوون و دژی بزوتنەوەی شیعەکان لە عێراق و میسر هەموو توانایەکی خۆیان بەکارهێناوە. هاتنی تورکەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕۆڵێکی گرنگی بۆ کەمکردنەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفی و زانستی لە جیهانی ئیسلامدا هەبووە.

ئەگەر ئاگر هۆ بێت بۆ گەرمایی، ناتوانین بڵێین ئاگر هەیە و دوایی گەرما دروست دەکات. جیاوازی نێوان ئاگر و گەرما لە نێو کاتدا نیە. ئەو کاتەی ئاگر دەکەینەوە گەرماکەش لەو ئاگرەوە لەیەک کاتدا دەردەچێت. بەهەمان شێوەش، ئەگەر جیهان لە خواوە بەرێژەن پەیدا بوو بێت، پێویستە هەمیشەیی بێت چونکە (هۆ)کەی، کە خوایە هەمیشەییە. بێگومان، مەبەستی ئیبن سینا، بەو جۆرەی پیاوانی ئایینی لێکی دەدەنەوە، ئەوە نیە، کە جیهان لەگەڵ خوادا هەبووە یان ئەریستۆ گوتەنی خوا ئەستو (ماتەر)ی دروست نەکردوە و تەنیا فۆرمی بەبەردا کردوە. جیهان بەبێ خوا نابێت و نیە. شتێکی جیاوازیش لەخوا نیە و لەوەوە دەرچووە. پەیوەندی نێوانیان، وەکو پەیوەندی نێوان خۆر و تیشکی خۆرە. تیشکی خۆر بەبێ خۆر نابێت و لە خۆریش جیا نیە. ئەگەر خۆر بۆ ساتێکیش هەبێت بەبێ تیشکدانەوە نیە. هەروەها، ئەگەر بڵێین جیهان (کاتی)یە و خوا هەمیشەیی، ئەوە دەگەیەنێت، کە خوا لە کاتێکی دیاریکراودا نەک لە یەکەم ڕۆژی بوونیەوە جیهانی ئافەرید کردوە. ئەمەش واتە، کاتێک هەبووە، کە جیهانی تێدا نەبووە و خوا تەنیا خۆی بووە.ئەمەش ئەو کاتەیە، کە خوا ئافەریدکەر (خالق)نەبووە یان ناتوانین خەسڵەتی ئافەریدکەری بۆ دابنێین چونکە ئافەریدکەر بە کردەوەی ئافەریدکردنەوە بەستراوە و ئەم بۆچوونەش ناجۆرە و بۆ خوا نابێت. خوا هەمیشە ئافەریدکەرە چونکە ئافەریدکراوەکە (جیهان)



هەمیشەییە. کێشەی دووەم لەسەر زانینی خوا سەبارەت بابەتە هەندەکییەکان پەیوەندی بە چۆنیەتی بوونی خواوە، وەکو بوونێکی سادە و بێ لەش، هەیە. بابەتە هەندەکییەکان لە ڕێگەی زانینی هەستەکییەوە دەناسرێن. ئەم جۆرە زانینەش چەند خەسڵەتێکی هەیە: زانینێکە گۆڕانی بەسەردا دێت و بیرکردنەوەش دەگۆڕێت، بەڵام زانینی خوا نەگۆڕە چونکە پڕوتەواوە. زانینی هەستەکی پاش ئەزمونی هەستەکی دروست دەبێت. من تاکو هەنگوین نەخۆم نازانم تامی هەنگوین چۆنە؛ واتە پێش ئەزمونەکەم من هیچم لە بارەی تامی هەنگوینەوە نەدەزانی یان نەزان بووم. ئەمەش بۆ خوا نابێت. ناجۆرە خوا پێش ئەزموونەکەی نەزان بێت.

لەسەر و ئەمانەشەوە زانینی هەستەکی، کە بابەتە هەندەکییەکانمان پێدەناسێت، لەسەر بوونی لەش و ئەندامە هەستکەرەکانی، وەکو چاو، گوێ، زمان، لوت، دەست ڕادەوەستێت. ئەگەر خوا زانینی هەستەکی هەبێت، دەبێت خاوەنی لەش بێت. ئەمەش بوونی خوا، لە سادەوە بۆ لێکدراو دەگۆڕێ و لە پلەی هەمیشە بوون و یەکەم بوون و تەواوکوییی دایدەبەزێنێت. کات و شوێن و گۆڕانەکان سنورداری دەکەن. لەم شیکردنەوەیەوە ئیبن سینا بەو ئاکامە دەگات، کە مادام خوا لەشی نیە، سادەیە و زانینەکەش ڕەهاو تەواوکۆیە، ئەوا فۆرمە هەمەکییەکان نەک بابەتە هەندەکییەکان دەناسێت.(192) بۆ نموونە،

(192) هەمان سەرچاوە، ل 247.

خوا دەزانێت (درەخت) هەیە، بەڵام ئەو درەختە ناناسێت من لە پەنجەرەکەمەوە دەیبینم چونکە بابەتێلی هەندەکی و هەستەکییە. پاش هاتنی تورکەکان بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ڕوخانی عەباسییەکان و وێران کردنی شاری بەغداد بەدەستی مۆنگۆلەکان، بزوتنەوەی زانستی و فەلسەفی لەم ناوچەیەدا توشی نەهامەتی بوو. زۆرینەی مێژوونوسانی فەلسەفەی ئیسلامی لەوباوەڕەدان دوای ئیبن سینا بیرکردنەوەی فەلسەفی کۆیایی پێهات و جارێکی دیکە لە ئیسپانیا لەژێر سایەی دەوڵەتی ئەمەوییەوە بیریارانی وەکو ئیبن باجە، ئیبن توفەیل و ئیبن ڕوشد پەرەی سەنە. ئەم گێڕانەوەیە لە ڕاستییەوە دوورنیە، بەڵام مێژوونوسان ئەو خاڵەیان لەبیرچووە، کە بیرکردنەوەی فەلسەفی لە ئێران و جیهانی ئیسلامی شیعەدا بەردەوام پاش ئیبن سینا مایەوە و لە سەردەمی سەفەوییەکاندا گەشەی کرد.(193)

(193) دەوڵەتی سەفەوی (1501–1732)شا ئیسماعیل دایمەزراند. لەبنەڕەتدا سەفەوییەکان سەربە تەریقەی سۆفیگەری قادری بوون. کە شێخ سەفی ئەلدینی شێخێکی کوردی کوردستانی ڕۆژهەڵات ڕابەری دەکرد. لە سەردەمی شێخ جونەیدی کوڕەزای شێخ سەفی ئەلدین لە ساڵی 1447 دا ئەم تەریقەتە دژی تەیموورییەکانی سەر بە مەنگۆلەکان بوو بە بزوتنەوەیەکی ڕامیاری و دواجاریش لەگەڵ دانانی ئیسماعیل کوڕی حەیدەر، کە بە شا ئیسماعیل ناسراوە، بە ڕابەری بزوتنەوەکە بووە، شاری تەبرێز لەلایەن شوێنکەوتوانی شێخ سەفی ئەلدینەوە داگیرکراو. ئیسماعیل بانگەشەی دامازراندنی دەوڵەتێکی بە ناوی (سەفەوییەوە)کردوە. شا ئیسماعیل تەریقەتەکەشی لە سونییەوە بۆ شیعە گۆڕیوە و دەوڵەتەکەشی بووە بە دەوڵەتێکی ئیسلامی شیعە. شایەنی باسە، لە سەردەمی شا عەباس (1571– 1629)و پاش گواستنەوەی پایتەختی سەفەوی لە قەزوینەوە بۆ ئەسفەهان، ئەم شارە بووە بە لانکەی گەشەکردنی زانست و فەلسەفە و هونەر.



میرداماد فێرگەیەکی فەلسەفیشی لە ئەسفەهان پایتەختی سەفەوییەکان دامازراند. هنری کۆربان و سەید حوسەین نەسر ئەم فێرگەیە، کە (مەلا سەدرا)ش تیایدا فەلسەفەی خوێندوە، بە (فێرگەی ئەسفەهان) ناوزەد دەکەن.(194) لەم فێرگەیەدا بێجگە لە فەلسەفەی ئیبن سینا، کە بایەخی پێدەدرا بۆچوونە فەلسەفییەکانی شەهاب ئەلدین سوهرەوەردی، فەیلەسوفی ئیشراقی، جێگەی خۆیان کردەوە و نەریتێکی فەلسەفی زاڵیان پێکهێنا. فەلسەفەی ئیشراقیش سەر بە نەریتی ئەفلاتونییە. لە سەردەمی سەفەوییەکاندا و لەنێو فێرگەی ئەسفەهان، سوهرەوەردی بوو بە فەیلەسوفی دەوڵەت و کەلتورە ئیسلامییە باوەکەی ئەو سەردەمە. سوهرەوەردیش، وەکو مامۆستا سالح ئیبراهیمی (شەپۆل) باسیدەکات، کورد بووە و لە گوندی (سورەبەرد) لەنێوان زنجان و بیجار لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، لە دایک بووە و برازای مەلا عومەری سوهرەوەردی (سورەبەردی)یە، کە ئەمیش زانایەکی ماسولْمان بووە.(195) وەکو دەزانین، (سوهرەوەرد)

(194) Hamid Dabashi, “Mir Damad and the Foundation of the School of Isfahan,” in *A History of Islamic Philosophy*, vol. 2, (eds.) Seyyed Hossein Nasr and Oliver Leaman, London: Routledge, 1996. P. 623.
هەرەها من لە پەرتووکێکمدا بە زمانی ئینگلیزی بە درێژی باسی فێرگەی ئەسفەهانم کردوە. بڕوانە:

Muhammad Kamal, *Mulla Sadra’s Transcendent Philosophy*, London: Ashgate, 2006. Pp. 24 – 41.

(195) بڕوانە ئەم نەسراوەی مامۆستا سالح ئیبراهیمی، ژیانەوەی زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامی، لە ساڵی 1974 لە تاران لە چاپدراوە.

لە زمانی فارسییدا واتای نیە و لە (سورەبەرد) ەوە گەلێک نزیکە. لەسەرو ئەمەشەوە، گەشتەکەی سوهرەوەردی بەرەو شاری حەلەب، کە ئەو سەردەمە بە دەست کوردەکانەوە بووە و (مەلیک زاهیر) کوڕی سەلاحەدین فەرمانڕەوای بووە، ئەوە ساخدەکاتەوە، کە سوهرەوەردی بە هۆی کورد بوونییەوە ڕووی لەوێ کردووە و بووە بە هاوڕێیەکی نزیکی مەلیک زاهیر.

پیاوانی ئایینی شاری حەڵەب هەستیان بە مەترسی لەنێوان هاوڕێیەتی ئەم فەیلەسوفە و فەرمانڕەواکەیەدا کردوە. نامە بۆ سەلاحەدین دەنوسن و ئاگاداری دەکەنەوە و داوای لێدەکەن سزای ئەم فەیلەسوفە بدات. سوهرەوەردی بە فەرمانی سەلاحەدی زیندانی دەکرێ و لە ساڵی 1191 دا لە زیندان دەکوژرێت.(196)

فەلسەفەی سوهرەوەردی، کە بە فەلسەفەی ئیشراق ناسراوە و لەسەر بنەڕەتگەری جەوهەر دامەزراوە، بەردەوامییە بە فەلسەفەی ئەفلاتون. ئێمە تەنیا لە بەراوردکردنی بیروباوەڕی فەلسەفی ئەفلاتون سوهرەوەردییەوە ئەم ڕاستییەمان دەست ناکەوێت، سوهرەوەردی لە پەرتوکەکەیدا (حکمة الاشراق) باسی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەفلاتوندا دەکات و دەڵێت، "هەموو ئەوانەی سەبارەت زانستی ڕووناکییەوە

(196) لە ڕاستیدا ساڵی جیاواز بۆ لەدایک بوونی سوهرەوەردی دانراون. بۆ نموونە حوسەین نەسر لەنوسراوێکییدا دەڵێت، سوهرەوەردی لەساڵی 1153 لەدایک بووە و لە نوسراوێکی دیکەدا لەوباوەڕەدایە، کە لەساڵی 1171 لەدایک بووە. بەڵام باسی ئەوەناکات، کە کورد بووە. ئەگەر ساڵی 1171 دروست بێت، ئەوا سوهرەوەردی لە تەمەنی بیست ساڵاندا کوژراوە، کە ئەمەش ناجۆرە.



باسمکردوە و ئەوانەی پەیوەندیشیان لەگەڵیدا نیە، بە هۆی یارمەتی ئەو کەسانەوە بووە، کە لەسەر ڕێگەی گەیشتن بە خوان. ئەم زانستە تێڕامانی ئەفلاتونی ڕووناک و هاندەرە، کە مامۆستا و ڕابەری فەلسەفەیە، هەروەها هێرمس (باوکی فەلسەفە) و شاسوارانی دیکەی، وەکو ئیمپادۆکلیس و پیتاگۆراس و گەلێکی دیکەش، کە پێش ئەفلاتون ژیاون". (197)

بە دیدی سوهرەوەردی، فەلسەفەی ئیشراق لە (هێرمس)ەوە دەست پێدەکات تاکو دەگاتە ئەفلاتون، بەڵام لەگەڵ ئەریستۆدا ئەم نەریتە فەلسەفییە ڕادەوەستێت. دواجاریش لە ئێران لەسەردەستی بیریارە ئێرانییە زەردەشتییە کۆنەکان، وەکو جامئەسپ، فراشۆستەر و بوزورگمیر، گەشە دەکات و لە جیهانی ئیسلامیدا بیریارانی وەکو ذەلنون ئەلمیسری، بیستامی، حەلاج و دواجار خودی سوهرەوەردی بەردەوامییان بەم نەریتە بەخشیوە.(198)

سوهرەوەردی پەرتووکێکی بە ناوی (قصة الغربة الغربية) لەسەر شێوازی مێتافۆری ئەشکەوتەکەی ئەفلاتون نەسیوە، کە تیایدا زیندانییەک لەنێو بیرێکی تاریکەوە سەرهەڵدەدات و خۆی ڕزگار دەکات و بەرەو وڵاتی خۆر ڕێدەکات.

(197) Shahad al-Din Suhrawardi, *Hikmat al-Ishraq*, translated by John Walbridge and Hossein Ziai, Porov, Utah: Brigham Young University Press, 2000. P. 2.

(198) هەمان سەرچاوە.

لە فەلسەفەی سوهرەوەردییدا دوو چەمک نوێنەرایەتی ڕاستی دەکەن؛ ڕووناکی و جەوهەر. لەبەر ئەم هۆیەیە فەلسەفەی ئەم بیریارە بە ڕووناکگەری (ئیشراق) و جەوهەرگەری دادەنرێت. ئەم دوو چەمکەش پەیوەندییەکی بنەڕەتی و ڕاستەوخۆیان بە فەلسەفەی ئەفلاتونەوە هەیە. لە لایەکەوە بۆ سوهرەوەردی، ڕاستی ڕووناکییە و هەر شتێکیش ڕاستی نەبێت یان بەشێک لەو ڕاستییە نەبێت تاریکییە. لەسەرو هەموو شتێکیشەوە ئەو ڕوناکییە هەیە، کە سەرچاوەی هەبووەکانە و ڕووناکی ڕووناکییەکانە (نور الآنوار)؛ بوونێکی پێویستی هەیە چونکە هیچ ڕووناکییەکی دیکە بەبێ ئەو نابێت.(199)

ڕووناکی ڕووناکییەکان بنەڕەت و سەرچاوەی ئۆنتۆلۆجییە؛ فۆرمی چاکەی بەرز مێتافیزیکی ئەفلاتون یان (خۆر)ی دەرەوەی ئەشکەوتەکەیە. سوهرەوەردی لە نوسراوێکی دیکەیدا، کە بە زمانی فارسی نوسیویەتی ڕووناکی ڕووناکییەکان بە (پەیکەری ڕووناکی— هیکل النور) ناوزەد دەکات.(200)

ئێمە لەم نوسراوەدا لەسەر مێتافیزیکی ئەفلاتون باسی بیردۆزەی فۆرمە بەرزە هەمەکییەکانمان کرد. ئەوەشمان ڕوونکردەوە، کە ئەم فۆرمانە جەوهەری هەموو شتێکن و هەمان کات ڕاستی بوونن. لەم ڕوانگەیەوە فۆرمە بەرزەکان نەک بوون، یان جەوهەر، بنەڕەتی هەموو شتێکن و ڕاستییەکی لەپێشترن.

(199) هەکان سەرچاوە. ل 123.

(200) ناوی ئەم پەرتووکەی سەهرەوەردی (هیکل النور)ە.



لەم بۆچوونەوە ئەفلاتون بانگەشەی ڕارەوی جەوهەرگەری دەکات. سوهرەوەردیش لەسەر هەمان پێگەی فەلسەفی ڕادەوەستێت و (جەوهەر) نەک (بوون) بە بنەڕەتی هەموو شتێک دادەنێت. بەڵگەش بۆ ئەم بیروباوەڕە دادەنێت و هەوڵدەدات بیسەلمێنێت، کە (بوون) چەمکێکی بێ ناوەڕۆکە و نوێنەرایەتی هیچ ڕاستییەک لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا ناکات. ئەوەی لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا هەیە و دەبێت بە بنەڕەتی شتەکان (جەوهەر) یان چییەتی شتەکانە.(201)

حەزدەکەم ئاماژە بەو خاڵە بدەم، کە سەدر ئەلدین شیرازی (مەلاسەدرا) ڕەخنە لە جەوهەرگەرێتی سوهرەوەردی دەگرێت و ڕەتی دەداتەوە. ئەم بیریارە، کە لەژێر دەستی میرداماد لە ئەسفەهان فەلسەفەی خوێندوە، یەکێک بووە لە شوێنکەوتوانی فەلسەفەی سوهرەوەردی و باوەڕی بە جەوهەرگەری هەبووە. لە پەرتووکی (المشاعر)دا باسی ئەوە دەکات چۆن وازی لەم فەلسەفەیە هێناوە و بەو ڕاستییە گەیشتوە، کە بنەڕەتی هەموو شتێک (بوون)ە نەک (جەوهەر).(202) مەلا سەدرا ئەم کێشەیەی لە پەرتووکە گەورەکەیدا، کە لە (نۆ) بەرگدا لە چاپدراوە (الحکمة المتعالیة فی الاسفار العقلیة الآربعة) بە درێژی باسکردووە و سیستەمێکی فەلسەفی لەسەر بنەڕەتێتی بوون یان بوونگەرایەتی دامەزراندوە.

(201) Suhrawardi, *Hikmat al–Ishraq*, p. 46.

(202) Mulla Sadra, *Al–Masha'ir*, traslated by Parviz Morewedge, New York: SSIOS, 1992. P. 43.

من ئەم هەڵوێستەی مەلا سەدرام بە (وەرگەڕان) ناوزەدکردووە و لەگەڵ فەلسەفەی مارتن هایدگەردا بەراوردم کردووە و دژی ئەفلاتون دامناوە.(203) سوهرەوەردی دوا بیریاری نەریتی ئەفلاتونی نیە. هەموو ئەوانەی پەیڕەوی ڕاڕەوی (ڕێژەن) دەکەن شوێن ئەم نەریتە دەکەون. یەکێک لەو بیریارانەی پاش سوهرەوەردی بانگەشەی (ڕێژەن) دەکات و لەو باوەڕەدایە جیهان لە بوونی خواوە دەرچووە، شاوەلی ئوڵای دەهەلەوییە. شاوەلی لە ساڵی 1731 بۆ خوێندن لە دەلهی پایتەختی مەغۆلەکانەوە ڕوو لە شاری (مەدینە) دەکات. لەژێر دەستی زانایەکی گەورەی کورد شێج تاهیری کوردی (1733 مردوە) حەدیس و شەریعەت دەخوێنێت. شاوەلی باسی کاریگەرێتی ئەم مامۆستایە بەسەر بیرکردنەوەیەوە دەکات. شێج تاهیر کوڕی شێج ئیبراهیم کوردییە (1690 مردووە)، کە ئەمیش زانایەکی ئایینی گەرە بووە و لەگەڵ باوکی شاوەلییدا لەلای شێج جەلال ئەلدینی دەوانی خوێندوویەتی.(204)

(203) Muhammad Kamal, *From Essence to Being:The Philosophy of Mulla Sadra and Martin Heidegger*, London: ICAS Press, 2010. Pp. 51 – 81.

(204) مامۆستا محەمەد غزالی لە پەرتووکەکەیدا لەسەر شاوەلی باسی ئەم مامۆستا کوردانەی شاوەلی دەکات. بڕوانە:
Muhammad al – Ghazali, *The Socio- Political Thought of Shah Wali Allah*, Islamabad: Islamic Research Institule Press 2001. Pp. 30 – 31.



شاوەلی لە ساڵی 1733 بۆ وڵاتی هیند دەگەڕێتەوە و خۆی بە نوسین و فێرکردنەوە خەریک دەکات. ئەمڕۆ بە یەکێک لە ڕابەرانی بزوتنەوەی پاکسازی دادەنرێت. باوەڕی بە بەکارهێنانی (هۆش) و (ئیجتیهاد) هەبووە، هەوڵیداوە ڕاڕەوی یەکانەگیی بوونی ئیبن عەرەبی و یەکانەگیی بینینی شێخ ئەحمەدی سەرهەندی لەیەک بدات. لە تەسەوفیشدا یەکێک بووە لە شوێنکەوتوانی تەریقەتی نەقشبەندی موجەددیدی.(205)

(205) حەزدەکەم ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەم، کە کوڕەکەی شاوەلی بە ناوی شا عەبدول عەزیزی دەهلەوی، شێخێکی گەورەی تەریقەتی نەقشبەندی و هاوڕێی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە. گوایە مەولانا خالید لەگەڵ ئەو ماوەیەک خوێندویەتی و لەلای ماوەتەوە.
بڕوانە: Albert Hourani, *The Emergence of The Modern Middle East*, London: Polgrare Macmillan, 1981. Pp. 82 – 83.

# بەشی نۆیەم

## خوێندنەوەی هایدیگەر بۆ ئەفلاتون

بڕوا ناکەم هیچ بیریارێکی سەردەمی نوێ، هێندەی هایدیگەر خۆی بە فەلسەفەی ئەفلاتونەوە ماندوو کردبێت. لەگەڵ ئەمەشدا بێجگە لە بەرهەمێکی بە ناوی (ڕاڕەوی ڕاستی لای ئەفلاتون)، کە لە ساڵی 1942 دا بۆ یەکەمجار بڵاوکرایەوە، هایدیگەر لەسەر ئەفلاتونی نەنوسیوە. ئەوەی لە بارەی خوێندنەوەی هایدیگەر بۆ ئەفلاتون لەبەردەستدایە کۆمەڵێک ڕەشنوسی وانەکانێتی، کە لە کۆتایی ساڵەکانی 1920 و سەرەتای 1930 لە زانکۆکانی ماربۆرگ و فرایبۆرگ پێشکەشی کردن و خراونەتە سەر سەرجەمی بڵاوکراوەکانی و لە چاپدراون. وانەکانی لەسەر دایەلۆگی سۆفست (1924– 1925)، لە بەرگی 19و لەسەر کۆمار (1931– 1932) لەبەرگی 34 دا و لەسەر تیاتیتۆس لەبەرگی (36 بەشی دووەم)ی سەرجەمی بڵاوکراوەکانی هایدیگەر بە زمانی ئەڵمانی لە چاپدراون. زنجیرەیەک لە وانەکانی بە ناوی (ناوەڕۆکی ڕاستی)، کە هایدیگەر تیایدا مامەڵە لەگەڵ میتافۆری ئەشکەوتەکەی ئەفلاتوندا دەکات لە ساڵی 1980 بە زمانی ئەڵمانی بڵاوکرایەوە و دواجاریش تێدسادلەر بۆ زمانی ئینگلیزی وەرگێڕا و لە 2002 دا لە چاپدرا. هایدیگەر لە وانەکانیدا لەسەر نیتشەش بۆ ئەفلاتون گەراوەتەوە و بۆچوونەکانی ئەم دوو بیریارەی پێکەوە



گرێداوە. هەروەها لە پەرتووکیکیدا بەناوی ( *Contribution to Philosophy*) جارێکی دیکە لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتوندا مامەڵەی کردوە.

ئەو پرسیارەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت ئەوەیە، بۆچی هایدیگەر بایەخی بە ئەفلاتون داوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت ئاوەڕ لە خوێندنەوەی هایدیگەر بۆ ئەفلاتون بدەینەوە و بزانین ئەم بیریارە چۆن بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەفلاتون شیدەکاتەوە.

خوێندنەوەی هایدیگەر بۆ ئەفلاتون، پەیوەندی بە دوو کێشەی سەرەکییەوە هەیە، من هەوڵدەدەم ڕوونیان بکەمەوە:

**یەکەم،** هەڵوەشاندنەوەی مێژووی ئۆنتۆلۆجی و دامەزراندنی ئۆنتۆلۆجییەکی نوێ، کە لەسەر بناخەی ڕاستی (بوون) ڕادەوەستێت.

**دووەم،** ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی تازەگەری.

هایدیگەر لەو باوەڕەدایە، فەلسەفەی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە ڕاستی (بوون)ی لەبیرکردووە و خۆی بەو هەبووانەوە خەریک کردوە، کە نابن بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ هەموو شتێک.

ئەم باوەڕەش لای فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا لەسەر ئەو بۆچوونانە ڕادەوەستن، کە (بوون) بە چەمکێکی هەمەکی بەڵگەنەویست و لە پێناسەبەدەر دادەنێن. (206)

(206) Martin Heidegger, *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blockwell, 1997. P.22.

با بزانین لە چ ڕوویەکەوە (بوون) پێناسەی بۆ دانانرێت و ناتوانین لە واتاکەی تێبگەین، چونکە ئەم بۆچوونەیە بووە بە هاندەرێک بۆ ئەم بیریارانە تاکو ڕاستی بوون لەبیر بکەن و خۆیانی لەگەڵدا خەریک نەکەن.

هەر شتێک پێناس نەکرێت، زانینیش لە بارەیەوە پەیدا ناکرێت. پێناسەنەکردنی بوون لەلایەن ئەم بیریارانەوە پەیوەندی بە دوو خاڵەوە هەیە؛ یەکەم، دانانی بوونە بە هەمەکیترین چەمک، کە لەسەرو ئەوەوە چەمکێکی هەمەکی دیکە نادۆزرێتەوە. دووەم، لەسەر جۆری (پێناسەکردن)ە. جۆری پێناسەکردنەکە، لە لۆجیکی ئەریستۆوە سەریهەڵداوە و بە پێناسەکردنی شیکەرەوە یان بەستنەوەی (جۆر) بە (جیاوازی)یەوە دادەنرێت.

ئەگەر بمانەوێت پێناسەی (مرۆڤ) بکەین. بەگوێرەی ئەم جۆرەی پێناسەکردن، کە تیایدا (جۆر و جیاوازی) دەردەخەین، پێویستیمان بە جۆری مرۆڤ و جیاوازی مرۆڤیش لەگەڵ هەبووەکانی دیکەی نێو هەمان جۆردا دەبێ بدۆزینەوە. بۆ نموونە (مرۆڤ) جۆرێکی بچوکە لەنێو جۆرێکی لەخۆی گەورەتر، کە بە جۆری (ئاژەڵەکان) ناوزەدی دەکەین. مرۆڤ، کەوابوو جۆرێکە لە ئاژەڵ. بەڵام لەنێو جۆری مرۆڤ لە نێو ئاژەڵدا تەنیا نیە، ئەگینا مرۆڤ بۆ ئاژەڵ نابێت بە جۆری بچوک. چەندەها جۆری بچوکی دیکەش لەنێو جۆری ئاژەڵەدا هەن، بۆ نموونە ئەسپ، سەگ، پشیلە و...هتد، کە هەموو ئاژەڵن. لێرەدا



پیناسەکەمان (مرۆڤ ئاژەڵە) ناتەواوە. واتایەکی تەواوی چەمکی مرۆڤمان پێنابەخشێت. بۆ تەواوکردنی پێناسەکە دەبێت (جیاوازی) نێوان مرۆڤ و ئاژەڵەکان لە پێناسەکەدا دابنێین. هیشتا دانانی هەموو جۆرە جیاوازییەکیش پێناسەیەکی تەواومان بۆ دروست ناکات. ئێمە دەتوانین بڵێین (مرۆڤ ئاژەڵێکی دوو پایە) ئەمە پێناسەیە و پەیڕەوەی ئەو یاسایەشی کردووە، کە بۆ پێناسە دانراوە، بەڵام (دووپا) جیاوازییەکی بنەڕەتی نیە. ئاژەڵی دیکەش لەنێو جۆرە گەورەکەدا، وەکو مەیمون یان شەمپانزی، هەن کە دوو پایان هەیە. ئەو جیاوازییە بنەڕەتییەی لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە بیرکردنەوە یان هۆشە. کەوابوو، پێناسەکەمان لەوێدا واتایەکی تەواو بۆ چەمکەکە ڕووندەکاتەوە، کە بڵێین، (مرۆڤ ئاژەڵێکی هۆشمەندە.) سەپاندنی ئەم جۆرە پێناسەکردنە بۆ چەمکی بوون توشی گرفتمان دەکات. لەلایەکەوە (بوون) جۆرێکی بچوک لەنێو جۆرێکی گەورەتردا نیە و لەلاکەی دیکەشەوە (جیاوازی)یەکەی هەرگیز نادۆزرێتەوە. لەبەر ئەمە، (بوون) پێناس ناکرێت و هیچ شتێک لەبارەیەوە نازانین. بەڵام، ئایا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمە هەوڵ نەدەین لە واتای بوون تێبگەین؟ لە ڕاستیدا، بە دیدی هایدیگەر، بەپێچەوانەوەیە، مادام ئێمە لە واتای بوون تێنەگەیشتوین، دەبێت هەوڵی زۆرتر بۆ تێگەیشتن لە واتاکەی بدەین. کاتێک پزیشکەکان هیچ دەرمانێکیان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی شێرپەنجە لەبەردەستدا نەبێت، ئەوە ناگەیەنێت واز لەگەڕان

بەدوای چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە و دۆزینەوەی دەرماندا بهێنن. ئێمە هەمیشە لە نەزانینەوە، (نەزانینی سادەوە نەک نەزانینی ئاوێتە)، توێژینەوە دەخەینە گەڕ و هەوڵی پەیداکردنی زانین دەدەین. (207)

ئەم جۆرە پێناسەکردنە، کە ئەریستۆ دایمەزراندووە بۆهەبووەکان دەگونجێت، بەڵام بەسەر (بوون)دا ساخنابێتەوە. ئەمەش نابێت ڕێگە لە ئێمە بگرێت و لە واتای بوون نەکۆڵینەوە چونکە ئەم پێناسەکردنە تەنیا ڕێگە و دوا ڕێگەش بۆ ناسینی بوون نیە.

ئەمە هەڵوێستی بیریارانی ڕۆژئاوا بوو سەبارەت واتای بوون. ئەم هەڵوێستەش پەیوەندی بە بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ئەفلاتونەوە هەیە. ئەفلاتون یەکەم بیریارە (بوون) بخاتە پەراوێزەوە و بنەڕەتی هەموو شتیک بۆ (ئایدیا) فۆرمە بەرزەکان بگەڕێنێتەوە. ئەم بیرکردنەوەیە و هەڵوێستە لە ئاستی (بوون) دا، بە دیدی هایدیگەر، سەرەتای ئەو سەردەمە تاریکەیە، کە ڕاستی بوون تیایدا لەبیردەچێتەوە. لەبەر ئەوەی (ئایدیا) یان فۆرمە بەرزەکانیش لە

(207) ئەم دوو چەمکە بەکارم هێناون (نەزانینی سادە) و (نەزانینی ئاوێتە) لە نەسیر ئەلدین توسی فەیلەسوفی موسوڵمانەوە وەرمگرتون. توسی (1274 مردووە) لەو باوەڕەدایە دوو جۆر نەزانین هەیە: نەزانینی سادە (جهل بسیط)، کە ئەوەیە مرۆڤ شتێک نازانێت. ئەم نەزانینە هەموو کەسێک هەیەتی و چارەکردنەکەشی فێر بوونە. دووەمیش نەزانینی ئاوێتە (جهل مرکب)ە و ئەوەیە، کە کەسێک نەزانێت نازانێت. بە دیدی توسی چارەسەرکردنی ئەم جۆرە نەزانینە سەختە. شیاوی باسە، کە توسی واتای ئەم جۆرە نەزانینەی لە سوکراتەوە وەرگرتووە، بەڵام سوکرات چەمکی نەزانینی ئاوێتەی بەکارنەهێناوە. بڕوانە:

Plato, “Apology,” 21 b – 22 e, in *Plato: Complete Works*.



جیهان دابڕاون و لەژوور جیهانەوە دانراون، ئەوا بیرکردنەوەی ئەفلاتون دەبێت بە سەرەتای بیرکردنەوەی مێتافیزیکیانە. هەروەها، ئەفلاتون جیهان بە (بەرهەم)ی دەستەڵاتێکی بەرز دادەنێت. ئەمەش دەبێت بە بنەمای فەلسەفەی تازەگەری و سەردەمی تەکنەلۆجی.

لەم ڕووەوە، ئەفلاتون ڕابەری ئەو بیریارانەیە ڕاستی بوونیان لەبیرکردوە و دامەزرێنەری مێتافیزیک و فەلسەفەی تازەگەریشە. ئەم نەریتە فەلسەفییە بە درێژایی مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوا تاکو سەردەمی نیتشە بەردەوام ماوەتەوە. نیتشە دوا بیریاری تازەگەری و ئەم نەریتەیە، کە ڕاستی بوونی لەبیرکردوە. وەکو ئەفلاتون، بوونی بە (ئایدیا) داناوە و دواجار ئایدیای بۆ (بەها) گۆڕیوە. جیاوازی نێوان ئەفلاتون و نیتشە لەوەدایە، کە ئەم بیریارە (بەها)ی لە جیهانێکی بەرزەوە بۆ سەر زەوی دابەزاندوە. لەسەرو ئەمەشەوە، میتافیزیکی ئەفلاتون جۆرێکە لە هیچگەرایەتی.

ئایا بوون چییە؟ ئەفلاتون و شوێنکەوتوانی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێن، بوون (هیچ)ە چونکە ئەوان (ئایدیا) نەک بوون بە بناخە و بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی دادەنێن. (208) لەم ڕووەوە، مێتافیزیکی ئەفلاتون و لەبیرچوونی بوون و هیچگەرایەتی و تازەگەری

(208) Martin Heidegger, *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralf Mauheim, NewYork: New York State University Press, 1987. P.38.

هەروەها من لە پەڕتووکەکەمدا (هایدیگەرو شۆڕشێکی فەلسەفی)ساڵی 2007 بەدرێژی باسی ئەم کێشەیەم کردوە.

یەک دەگرنەوە. لەم پێگەیەوە بەو خاڵەدەگەین، ئەگەر ئەفلاتون دامەزرێنەری بیرکردنەوەی مێتافیزیکی بێت، کە هیچگەرایەتی لێوە پەیدابووە، ئەوا لە هەمان کاتدا ئەم بیریارە دەبێت بە دامەزرێنەری فەلسەفەی تازەگەریش. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە هایدگەر دوو بەڵگەی باسکردوە؛

یەکەمیان، لە فەلسەفەی تازەگەریدا ئاوەڕ لە (بوون) نەدراوەتەوە و بە (هیچ) دانراوە. بیریارانی تازەگەری شتێکی دیکە، بێجگە لە (بوون) بە (ڕاستی) دادەنێن.

دووەمیش، بوون بە (سروشت) یان سەرچاوەیەکی وەبەرهێنان دانراوە، کە هێزێک ئافەریدیکردووە. هایدیگەر ئەم هەڵوێستەی بە میتافیزیکی بەرهەمهێنەر ناوزەد کردوە.

ئەفلاتون لە دایەلۆگی (کۆمار)دا بە ئاشکرا باسی ئافەریدکردنی جیهانی نەکردوە. بەڵام لە دایەلۆگی (تیمایۆس)دا ئەم خاڵەی باشتر ڕوونکردۆتەوە. لەو باوەڕەدایە هەموو شتیک (بەرهەم)ە و لەسەرو هەموویانەوە سروشت بەرهەمی دەسەڵاتێکی (هۆشەکی)یە، کە یاساکانی سروشتیشی بۆ داناوە.(209) هایدەگەر ئەم بیرکردنەوەیە یان دانانی (بوون) بە (سروشت) و ئەو سروشتەش بە (بەرهەم) بەسەرەتای بیرکردنەوەی تازەگەری دەبینێت.

بێجگە لەم دوو بەڵگەیە بۆ بەستنەوەی ئەفلاتون بە فەلسەفەی تازەگەرییەوە، بە دیدی من، بەڵگەیەکی دیکەش لەبەر دەستدایە، کە

(209) Plato, “Timaeus,” 28 a – 39c, in *Plato: Complete Works*.



هایدیەگەر باسی نەکردووە. ئەویش دامەزراندنی سیستەم یان مێتاگوتارە. وەکو دەزانین، دامەزراندنی سیستەم و میتاگوتار یان پشتبەستن بە بیردۆزەیەک، کە هەموو ڕووداو و هەبووە فرە جۆرەکانی لەژێر ڕۆشناییەکەیدا ڕوون بکرێتەوە، مەبەست و ئامانجی سەرەکی تازەگەرییە. بیریارانی تازەگەری لە دێکارتەوە بۆ هیگڵ و مارکس هەوڵی دامەزراندنی سیستەمێکی سەرتاپاگیریان بۆ جیهان داوە. هیگڵ و مارکس، بۆ نموونە هەموو ڕووداوە جیاوازەکانی نێو سروشت و مێژوویان خستە نێو سیستەمی دیالێکتیکەوە. بەو سیستەمە لە واتای ڕووداوەکانیان کۆڵیوەتەوە و ڕاستییان پێواوە. ئاوەڕدانەوەشمان لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە ئەفلاتون یەکەم بیریارە سیستەمێکی فەلسەفی سەرتاپاگیری بۆ دامەزراندووین. من بەدرێژایی ئەم نوسراوە لە چەند شوێنێکدا ئاماژەم بۆ کردووە.

هەڵوەشاندنەوەی مێژووی ئۆنتۆلۆجی بۆ هایدیگەر پەیوەندی بە خوێندنەوەی هایدیگەر بۆ ئەم مێژووە و ئەفلاتونەوە هەیە. ئەو دەیەوێت ئۆنتۆلۆجییەک لەسەر ڕاستی (بوون) دابمەزرێنێت و فەلسەفەش خۆی بە دوورترین ڕاستی، کە ڕاستی بوونە بگەیەنێت. خۆی بە دژوارترین پرسیارەوە، کە پرسیارە سەبارەت واتای بوون، ماندوو بکات. ئەم کارەش بە ڕەتدانەوەی نەریتی فەلسەفی ئەفلاتون بە ئاکام دەگات چونکە ئەم نەریتە (بوون)ی لەبیرکردوە و

سیستەمێکی فەلسەفی لەسەر بناخەی (هیچ) بۆ دامەزراندووین، یان خۆی بە هەبوویەکەوە بەستۆتەوە، کە ناتوانێت ببێت بە دوا بنەڕەت، یان بنەڕەتێکی لەبنەڕەت بەدەر بۆ هەموو شتێک.

لەسەرو ئەمەشەوە، فەلسەفەی ئەفلاتون، کە سەرەتای ئەو کۆتاییەیە ئێمە تیایدا دەژین، سەردەمی تازەگەری و تەکنەلۆجی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەکایەوە. ئەم سەردەمە (بوون) بە کەرەسەیەکی خاو بۆ وەبەرهێنان دادەنێت و نەریتی تەکنەلۆجیش بەسەر ژیانی مرۆڤدا زاڵ دەکات. (210) تەکنەلۆجیا لای یۆنانییەکانیش زاراوەیەک بووە بۆ بەرهەمهێنانی پیشەسازی و دەستی دانراوە. تەنانەت بەرهەمی هونەریشی گرتۆتەوە. لە هەمان کاتدا (تەکنە) بە واتای (ئەپستمە)ش هاتووە، کە شێوازێکی دەرخستنی ڕاستی بوونە. بەڵام ئەمڕۆ ئەم واتایەی (تەکنە) شاراوەتەوە. تەکنەلۆجی زیاتر بەداردەستێک بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی زانست بەسەر سروشت و مرۆڤدا دادەنرێت. لە فەلسەفی تازەگەرییدا سروشت لایەنێکی دەرەکی (ئەوی دی) یە، کە (هۆش) دەبێت داگیری بکات. هۆش و سروشت، وەکو دوولایەنی جیاواز و دژ وەستاو دادەنرێن.

فەلسەفەی تازەگەری باوەڕی بە جیاوازی نیە چونکە هەموو جیهان دەخاتە بەر ڕۆشنایی یەک جۆر سیستەم و داگیری دەکات. جیاوازی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی و دژوەستان. پێویستە (هۆش)

(210) Martin Heidegger, "The Question Concerning Technology," in *Basic Writings*, (ed.,) David Farrell Krell, London: Routledge, 1996. P.318.



هەوڵی لەناوبردنی بدات و سیستەمێک دابمەزرێنێت، کە جیاوازی لە نێویدا بتوێتەوە و ناکۆکی و دژوەستان ڕوونەدەن. بۆ ئەم مەبەستە هۆشی تازەگەری دەبێت بە دەستەڵاتێکی خۆ بە حەق زان و داگیر کەر.

تەکنەلۆجیا ناوەڕۆکێکی زانستانەی ڕووتی نیە. لە زەمینەی مێتافیزیکی بەرهەمهێنەری ئەفلاتون و تازەگەرییەوە سەریهەڵداوە. تەکنەلۆجیا زادەی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی تازەگەرییە، کە لە ئەفلاتونەوە دەست پێدەکات. ئەمەش ئەو سیستەمی بیرکردنەوە فەلسەفییەیە، کە (بوون) تیایدا لەبیرچۆتەوە یان بە (هیچ) دانراوە. جیهانی دەرەوەی (هۆش)یش بۆ مەبەستی وەبەرهێنان بەکارهاتوە. بۆ تەکنەلۆجیا جیهان زەخیرە و سامانی وەبەرهێنانە. (211)

مەترسی گەورەتریش لەم هەڵوێستەی هۆش و تەکنەلۆجیا لەوەدایە، کە نەک تەنیا جیهانی دەرەوە بەڵکو بوونی مرۆڤیش دەخاتە نێو هەمان کەوانەوە. بۆ مەبەستی وەبەرهێنان بەکاری دەهێنێت. (212) لەگەڵ وازهێنان لە ڕاستی بوون و دانانی بوون بە هیچ یان زەخیرەیەک بۆ وەبەرهێنان و نامۆکردنی بوونی مرۆڤیش سەردەمێکی تاریک دێتە کایەوە، کە پرسیارکردن تیایدا دەکوژرێت. (213)

(211) هەمان سەرچاوە، ل 324.

(212) هەمان سەرچاوە

(213) Martin Heidegger, *Coutributions to Philosophy (form Enowning)*, translated by Parviz Emad and Kenneth Maly, Bloomington and Indiauapolis: Indiana University Press, 1999. P. 77.

بێجگە لە سەردەمی تاریک و کوشتنی پرسیارکردن، هایدیگەر چەند خەسڵەتێکی دیکەشی سەردەمی تەکنەلۆجی باسکردوە. بۆ نموونە لەو باوەڕەدایە، کە تەکنەلۆجیا ژینگەی وێران کردوە، مرۆڤی نارەسەن کردوە و کەسانی پلە مامناوەندی لە ڕووی بیرکردنەوەوە و تێگەیشتنەوە زۆرکردوە.(214)

لە سەردەمی تازەگەرییدا مرۆڤ توشی دوو جۆر نەهامەتی بووە: لە لایەکەوە وێرانکردنی ژینگە و لە لاکەی دیکەوە، نامۆبوونی لە ڕاستیی بوونی خۆی. وێرانکردنی ژینگە، ئاکامی هەڵوێستی تازەگەریانەیە بەرانبەر جیهانی دەرەوە و ڕاڤەکردنی پەیوەندی نێوان هۆش و جیهانە لەسەر زەمینەی جیاوازی و ناکۆکی. لەم هەڵوێستەدا کە لە سیستەمی دیالیکتیکی هیگڵ و مارکسدا بەئاشکرا باسکراوە، هۆش بێجگە لە بوونی خۆی و بەرژەوەندی خۆی گوێ بە چی دیکە نادات. لەوباوەڕەدایە ئەو تەنیا دەستەڵاتە و هەرچییەک لەجیهانی دەرەوەدا هەیە بۆ ئەو دانراون و ئەویش مافی داگیرکردن و بەکارهێنانی هەیە.

نەهامەتی دووەم، وابەستە بە نامۆ بوونی مرۆڤەوە، کە مرۆڤ ڕاستیی بوونی خۆی دادەبڕێت و دەکرێت بە کەلوپەل و ڕێگەی پرسیارکردن و داهێنانی لێدەبەسترێت. مرۆڤی نامۆ دەبێت بەکەلوپەل و کەلوپەلیش بیرناکاتەوە. ڕێگەچارەی ئەم نەهامەتییانە لەگەڵ تێپەڕکردن و ڕەتدانەوەی تازەگەرییدایە. ، لەگەڵ تەواوبوونی تازەگەرییدا کۆتاییش

Martin Heidegger, “Letters on Humanism,” in *Basic Writings*, (114) p. 54



بە مێژووی مێتافیزیکی ڕۆژئاوا دێت. ئەو مێژووەی بە ئاشکرا و شاراوەیی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ڕایگرتوە. دەتوانین بڵێین، کە کۆتاییهێنان بە مێتافیزیک سەرەتای تەواوبوونی تازەگەری دیاریدەکات. مەبەست لە تەواوبوون کاریگەرێتی تەواوی دەستەڵاتە بەسەر سەردەمەوەیە. تەواوبوون، لەم ڕووەوە نە ئاماژە کردنە بۆ دۆزینەوەی سەردەمیکی ونبو، نە کۆتایی هێنانیشە بە شتە زانراوەکان.

بەڵکو تەواوبوون مژدەی هەڵوەشاندنەوە و شێواندنی شتەکانی نێو سەردەمە بەبێ لەناوچوون و زەمینەیەکی دیکە بۆ دەستەڵاتدابمەزرێت.(215) ڕێگەچارەکە یان تەواوبوونی نەهامەتییەکان لەگەڵ داهێنانی شێوازێکی فەلسەفییانەی نا— مێتافیزیکییانە دایە، کە(بوون) و ڕاستیی بوونی مرۆڤیش تیایدا ناسراوەتەوە و جیهانی دەرەوەش بە بێگانە و هەڕەشەکەر دانانێت. بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە بۆچوونی فەلسەفی سەردەمەکەماندا دروست بکەین، پێویستە مێتافیزیکی ئەفلاتون، کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ماوەتەوە و بووە بە جێگەزاری تازەگەری ڕەتبکەین.

Martin Heidegger, *Mindfulness*, translated by Parviz Emael (215) and Thomas Kalary, London:Continuum, 2006. P.19.

من بەشیکی ئەم نوسراوەی هایدیگەرم بە ناوی(تەواوبوونی تازەگەری) لە پەرتووکێکمدا بۆ زمانی کوردی وەرگێڕاوە و لەپاشکۆکەیدا دامناوە. بڕوانە: محەمەد کەمال، هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی.

# بەشی دەیەم

## سەرەنجامەکان

گرنگی توێژینەوەکەمان لەسەر فەلسەفەی ئەفلاتون لە کۆتایی گەشتەکەماندا دەردەکەوێت. وەکو دەبینین، ئەفلاتون جێگەیەکی دیاریکراوی لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفییدا بۆ خۆی داگیرکردوە و ناکرێت ئاوەڕی لێنەدرێتەوەە. لەگەڵ ئەفلاتوندا بیرکردنەوەی فەلسەفی شێوازێکی جیاوازی وەرگرتوە، کە لەم چەند خاڵانەدا ڕوونیان دەکەمەوە.

**یەکەم**، ئەفلاتون دامەزرێنەری بیرکردنەوەی نوسینی دایەلۆگییە، کە ئەمڕۆ لە پەیوەندی نێوان بۆچوونە جیاوازەکان و ئایینەکان و شارستانییەتەکاندا بەکاردێت. بێگومان، من ناڵێم، کە لەپێش ئەفلاتوندا بیرکردنەوەی دایەلۆگی نەبووە. ئێمە دەزانین سوکرات ئەم میتۆدەی بەکارهێناوە و منیش شێوازی دایەلۆگیی ئەفلاتونم بۆ سوکرات گەڕاندۆتەوە، بەڵام، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەفلاتون بە یەکەم نوسەری دایەلۆگی مێژووی فەلسەفە دادەنرێت چونکە سوکرات هیچ نوسراوێکی جێنەهێشتوە و دڵنیا نین لەوەی نوسیبێتی.

**دووەم**، ئەگەر مێتافیزیک بە ئۆنتۆ—تیۆلۆجی ناوزەدبکەین بەو بۆچوونەی دابنیین، کە هۆیەکی بەرز بۆ هەموو هەبووەکان دادەنێت



ئەوا ئەفلاتون یەکەم بیریاری مێتافیزیکە و ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەوەوە دەکەوێتە گەڕ.

**سێیەم**، لەبیرچوونی (بوون) و جەختکردن لەسەر بنەڕەتێکی جیاوازتر لە (بوون) و دانانی بوون بە (هیچ)، هایدیگەر گوتەنی، لە ئەفلاتونەوە دەستپێدەکات. لەم خوێندنەوەیەی هایدیگەرەوە ئەفلاتون بە دامەزرێنەری (هیچگەرایەتی) دادەنرێت.

**چوارەم**، تێگەیشتنی ئەفلاتون لە پەیوەندی نێوان هۆیە بەرزەکە و هەبووەکاندا بۆتە بنەمای سەرهەڵدانی تێڕوانینی تازەگەریانە بەرانبەر بوون.

**پێنجەم**، ئەفلاتون یەکەم بیریارە هەوڵی دامەزراندنی سیستەمێکی فەلسەفی سەرتاپاگیری داوە. بە ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە، گرنگ نیە ئێمە لەگەڵ ئەفلاتوندا هاوڕابین یان نا،هێشتا دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە پێویستە بە (جیدی) ئاوەڕ لەم بیریارە بدەینەوە و بە قوڵی مامەڵە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی بکەین.

لەسەرو ئەم خاڵانەشەوە، نکۆڵی لە کاریگەرێتی ئەفلاتون بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی پاش خۆی و ئایینەکانەوە ناکرێت، کە لە بەشی هەشتەمی ئەم نوسراوەدا باسم کردوە.

بیرکردنەوەی مێتافیزیکییانە بە بیردۆزەی فۆرمە هەمەکییەکانی دەستپێدەکات. هەروەها، ڕوونمانکردەوە چۆن ئەم فۆرمە هەمەکییانە بە میتۆدی (ئیندەکشن) دۆزراونەتەوە. لەگەڵ دۆزینەوەی فۆرمەکاندا

دوو جیهانی جیاواز و له یەکدی دابڕاو سەریان هەڵداوە؛ جیهانی بەرز و جیهانی هەستەکی. یەکەمیان جیهانێکی له ئەستو بەدەره و پڕ و تەواوە و فۆرمه هەمەکییەکانی تێدا دانراوه. هەموو ئەو فۆرمانەی لەم جیهانەدا هەن هەمان خەسڵەتیان هەیە؛ هەموویان هەمەکی و پڕ و تەواون و فۆرمێکی ڕووتکراوەن و خاوەنی ئەستو (ماتەر) نین. لەبەر ئەمە، گۆڕانیان بەسەردا نایەت. گۆڕان له سروشتی هەبوویەکدایە، که ناتەواوە و سەر به ئەستو (ماتەر)ە . لێرەدا، دوو جۆر هەبوومان بۆ ئاشکرا دەبێت؛ وەستاو و گۆڕینۆک. جیهانی هەستەکیش له هەبووە هەندەکییەکان پێک هاتوه و جیهانی فۆرم و ئەستۆ؛ جیهانێکه ئاوێتەکراو، یان تێهەڵکێشراو. هەرشتێکیش ئاوێتە یان تێهەڵکێشراو بێت، ناتوانێت ببێت به بنەڕەتێکی لەپێشتر چونکه لەپێش ئەودا ئەو توخمانه هەبوون، که ئەویان پێکهێناوە. لەبەر ئەم هۆیەشە، فۆرمه هەمەکییەکانی جیهانی بەرز به سادە و ڕووت دادەنرێن تاکو ببن به بنەڕەتی لەپێشتر بۆ هەبووەکان. له لایەکی دیکەوە، پەیوەندی هۆکاری نێوان فۆرمەکان و هەبووە هەندەکییەکان دەیسەلمێنن، که هەبووە هەندەکییەکان بۆ بوونیان پێویستییان به فۆرمەکانە. ئەم پەیوەندییە بەپێچەوانەوە نادروستە. فۆرمەکان پێویستیان به هەبووە هەندەکییەکان نیە. بوونی شتێکی سور دەکەوێتە سەر فۆرمی سور له جیهانه بەرزەکەدا، بەڵام فۆرمی سور پشت به شتە سورەکان بۆ بوونی نابەستێت و سەربەخۆیە. بێجگه لەم پەیوەندییە هۆکارییەی



نێوان فۆرمەکان و هەبووە هەندەکییەکان، پەیوەندی لێکچونیش له نێوانیاندا دەدۆزینەوە. جۆره لێکچونێک لەنێوان فۆرمی سور و شتێکی سوردا هەیە چونکه شتە سورەکە (وەرگیراو)ی فۆرمە سورەکەیە. لەم ڕوانگەیەوە، بەو ئاکامه دەگەین، که هەبووە هەندەکییەکانی نێو جیهانی هەستەکی بێجگه لەوەی گۆڕینۆک و ناتەواون، له فۆرم و ئەستو پێکهاتوون، له هەمان کاتدا له ڕاستییەوە دوورن چونکه وەرگیراوی فۆرمه هەمەکییەکانن. ئەگەر ئێمه بمانەوێت (ڕاستی) بدۆزینەوە، ئەوا دەبێت خۆمان به فۆرمەکان بگەیەنین. لەم بۆچوونە مێتافیزیکییەوە ئەفلاتون دەرگای توێژینەوەکانی لەسەر واتای ڕاستی و زانین و جوانی و فەلسەفه ڕامیارییەکەی دەکاتەوە. هەموویان به بیردۆزە مێتافیزیکییەکەیەوە گرێدەدات.

ڕاستی و زانین و جوانی لەنێو جیهانی هەستەکییدا نین و بەستراون به جیهانی بەرزەوە. هەبوویەکی ناتەواو یان گۆڕینۆک نابێت به بناخەی ڕاستی و زانین. ئەم خاڵه له میتافۆری ئەشکەوتدا باسکراوە و به ئاشکرا نکۆڵی لەوە کراوە، که هەستکردن بتوانێت ڕاستی بناسێ و (زانین) دروستبکات. ئەوەی له هەستکردندا دەردەکەوێت هەبوویەکی هەندەکی وەرگیراوە. زانینەکەشمان له بارەیەوە (بۆچوونە) چونکه ئەو هەبووە بەردەوام له گۆڕاندایە. شتێکی جوان له تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە، له کات و شوێنێکەوە بۆ کات و شوێنێکی دیکه گۆڕانی بەسەردا دێت و وەکو خۆی نامێنێتەوە. کەوابوو، بەو شێوەی تاکێک

ئەو شتە جوانە دەبینێت و باسی دەکات (زانین) نیە و (بۆچوون)ی ئەوە. بابەتی بۆچوون هەستەکییە و هەمیشە لە گۆڕاندایە. زانینیش پێویستی بە بابەتێکی نەگۆڕ هەیە. ئەو بابەتەش لە جیهانی هەستەکییدا نادۆزرێتەوە. بۆ پەیداکردنی زانین پێویستە مرۆڤ خۆی بە جیهانی بەرز و فۆرمە هەمەکییەکان بگەیەنێت. لێرەدا، ئەفلاتون لە مێتافۆری ئەشکەوتەکەیدا، باسی ئەو مرۆڤەمان بۆ دەکات زنجیری دۆگمای نێو ئەشکەوت و (بۆچوون) دەشکێنێت و خۆی بە جیهانی ڕووناکی دەرەوەی ئەشکەوتەکە دەگەیەنێت. خۆڕزگارکردنی ئەو مرۆڤە لە پیناوی گەیشتن بە ڕاستی و زانیندایە، ئەو تەنیا مرۆڤێکە بتوانێت ڕاستی بناسێت. ئەم مرۆڤە ڕاستی ناسە و خاوەن زانینە. دەبێت بە قارەمانێکی مێژوویی و ئەو فەیلەسوفەی شیاوی فەرمانڕەوایی و سەرکردایەتی لە کۆمارەکەی ئەفلاتوندا هەیە. دامەزراندنی دەوڵەتێک، کە هاوڵاتیان تیایدا بەختەوەربن و دادوەری سەقامگیر بێت دەکەوێتە سەر دەستەڵاتی ڕامیاری ئەم فەیلەسوفە. بەم شێوەیە، مێتافیزیکی ئەفلاتون دەبێت بە بنەمایەکی ڕامیاری و لەوێوە فەلسەفەیەکی ڕامیاری دێتەکایەوە. ئێمە بەدرێژی لە بەشی شەشەمی ئەم نوسراوەدا باسی فەلسەفەی ڕامیاری ئەفلاتونمان کردووە و ڕوونمان کردۆتەوە، چۆن دەوڵەتێک لەسەر بنچینەی دادوەری دادەمەزرێت. ئەفلاتون فەرمانڕەوایی فەیلەسوفەکان بە پێش مەرج بۆ بوونی ئەم دەوڵەتە دادەنێت. ئێمە ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵەش کرد، کە لە کۆماردا



جیاوازی نێوان ژن و پیاو لە ناودەچێت. بە دیدی ئەفلاتون، جیاوازی نێوان ژن و پیاو کەلتوورییە نەک سروشتی. لەبەر ئەمە فەیلەسوفەکان، یان فەرمانڕەواکانی کۆمارەکە لە ژن و پیاو پێکهاتوون و یەک جۆر بەرنامەی پەروەردە و فێربوونیان بۆ دانراوە. لە هەمان کاتدا، بۆ لەناوبردن یان ڕێگرتن لە گەندەڵی دەستگای خێزان و خاوەنێتی تایبەتی هەڵدەوەشێتەوە و جۆرە ژیانێکی هاوبەشی (کۆمۆنیستانە) بۆ فەرمانڕەواکان دیاریدەکرێت. بێگومان فەلسەفەی ڕامیاری ئەفلاتون لە کەموکورتی بێبەش نیە. دەبینین بە ڕادەیەک ئازادی بیروباوەڕ لەناودەبات و سانسۆر دەخاتە سەر ئەدەب و هونەر. لەلایەکی دیکەشەوە، زەمینە مێتافیزیکییەکەی بۆ تێگەیشتن لە بوونی مرۆڤ و دابەشکردنی دەروون بەسەر هۆش و گیان و ئارەزوودا و بەستنەوەی چینەکانی کۆمەڵ بە بەشەکانی دەروونەوە جۆرێک ناچارەکی دەهێنێتە کایەوە. ڕێگە بە تاکەکانی کۆمەڵ نادات چین گۆڕکێ بکەن.

لە هەمان زەمینەی مێتافیزیکییەوە، ئەفلاتون مامەڵە لەگەڵ کێشەی جوانی و بیردۆزە هونەرییەکەتدا دەکات. لەو باوەڕەدایە خودی جوانی لەنێو جیهانی هەستەکییدا نیە؛ ئەوەی لێرە هەیە شتێکی جوانە نەک فۆرمی جوانی. کەوابوو، ئەو شتە جوانە ناتەواوە و بەردەوام لە گۆڕاندایە. هەروەها پەیوەندی بە هەستکردنەوە هەیە. شتێکە لە چاوی تاکێکدا یان لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا جوانە و دەشێ لە

چاوی تاکێکی دیکه و کات و شوێنێکی دیکەدا ناشرین بێت. کەوابوو، هەموو حوکمدانەکانمان لەسەر جوانی و ناشرینی بابەتێک (بۆچوونە)؛ واتە لە بۆچوونی مندا ئەو بابەتە جوانە یان ناشرینە. هونەرمەندیش لە بەرهەمێکی هونەرییدا تەنیا لاسایی ئەو بابەتە هەستەکییانە دەکاتەوە، کە وەرگیراوی فۆرمە هەندەکییە بەرزەکانن. لەبەر ئەمە بەرهەمی هونەری لە ڕاستییەوە دوورە و وەرگیراوی وەرگیراوەی فۆرمە هەمەکییەکەیە.

بەم شێوەیە ئەفلاتون سیستەمێکی فەلسەفی و مێتافیزیکی دامەزراندووە، کە تیایدا مامەڵەی لەگەڵ هەموو هەبووەکاندا کردووە. ئەمەش بە دیدی من، یەکێکە لەو هۆیانەی لەگەڵ هایدیگەردا بڵێین، کە ئەفلاتون سەرەتای تازەگەرییە. من بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە هەوڵمداوە ڕۆشنایی بخەمە سەر ئەم لایەنە و بیسەلمێنم، کە ئەفلاتون بۆ یەکەم جار لە مێژووی فەلسەفەدا گشتگرانە بیردەکاتەوە و دەتوانین لە ڕیزی هیگڵ و مارکس دایبنێین. سیستەم لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا دەیەوێت سەرتاپای دیاردە و ڕووداوەکانی نێو سروشت و مێژوو لە ئامێز بگرێت و ڕووناکییان بخاتە سەر. لەم گۆشە نیگایەوە، سیستەم ڕاڤەی بوونی دیاردەکان و ڕووداوەکان ناکات، بەڵکو واتایان بەسەردا دەسەپێنێت.



## سەرچاوە کوردییەکان


- نالی، دیوانی نالی، لێکدانەوەی مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976.
- د. محەمەد کەمال ، فەلسەفەی سارتەر و خوێندنەوەیەکی نوێ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2003.
- د. محەمەد کەمال ، نیتشە و پاش تازەگەری، دەزگای چاپ و پەخسی سەردەم، سلێمانی 2006.


## سەرچاوە عەرەبییەکان


ئیبن سینا، کتاب النجاة فی الحکمة المنتقیة و التبیعیة والالهیة، دار آفاق العربیة، بیروت،1982.

جابر آبوحیان التوحیدی، الامتاع و المآنسة، الجزء الثانی، القاهرة، 1942.

د. ابراهیم حسن، تآریخ الاسلام، الجزء الثانی، دارالاندلس، بیروت، 1964.

الامام آبی الحسن علی بن اسماعیل الاشعری، کتاب مقالات الاسلامیین و اختلاف المصلین،الطبعة الثانیة، دارنشر فرانز شتایز، فیسبادن، 1980.

کتاب الفهرست، دارالکتاب العلمیة، بیروت،1996.

هنری کوربان، تاریخ الفلسفة الاسلامیة، عوایدات للنشر، بیروت، 1970.

Shahad al-Din Suhrawardi, *Hikmat al-Ishraq*, translated by John Walbridge and Hossein Ziai, Porov, Utah: Brigham Young University Press, 2000.

Al-Farabi, *Mabadi Ara Ahl al-Madina al-Fadila*, translated by Richard Walzer, with Arabic text, Oxford: Clarendon Press, 1985.

## سەرچاوە ئینگلیزییەکان

Adamson, Peter, *The Arabic Plotinus: A Philosophical Study of the Theology of Aristotle*, London: Duckworth, 2002.

Al-Farabi, Abu Nasr, *Mabadi' Ara Ahl-al-Madina al-Fadila*, translated by Richard Walzer, with Arabic text, Oxford: Clarendon Press, 1985.

Al-Ghazali, Muhammad, *The Socio-Political Thought of Shah Wali Allah*, Islamabad: Islamic Research Institute Press, 2001.

Aristotle, "De Anima", in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 2, Princeton: Princeton University Press, 1984.

Aristotle, "Metaphysics", in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 2, Princeton: Princeton University Press, 1984.

Aristotle, "Politics", in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 2, Princeton: Princeton University Press, 1984.

Aristotle, "Rhetoric", in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 2, Princeton: Princeton University Press, 1984.



Bluck, R. S. *Plato's Life and Thought*, with the translation of the Seventh letter, London: Routledge and Kegan Paul, 1949.

Copleston, Frederick, *A History of Philosophy*, vol.1, New York: Image Books, 1993.

Crombie, I. M., *An Examination of Plato's Doctrines*, London: Routledge and Kegan Paul, 1963.

Dahbashi, Hamid, "Mir Damad and the Foundation of the School of Isfahan", in *A History of Islamic Philosophy*, vol.2, (eds.) Seyyed Hossein Nasr and Oliver Leaman, London: Routledge, 1996.

Descartes, Réne, "Meditations on First Philosophy", in *The Philosophical Writings of Descartes*, vol.2, translated by John Cottingham, Robert Stoothff and Duglas Murdoch, Cambridge: Cambridge University Press, 1999.

Diogenes Laertius, *Lives of Eminent Philosophers*, with and English translation by R. D. Hicks, two volumes, London: William Heinemann, 1959.

Fakhry, Majid, *A History of Islamic Philosophy*, New York: Columbia University Press, 1970.

Foster, M. B., "A Mistake of Plato's in the Republic", in *Mind*, NSXLVI, 1937.

Guthrie, W.K.C. , *A History of Greek Philosophy*, vols. 1-4, Cambridge: Cambridge University Press, 2005.

Heidegger, Martin, "Letters on Humanism", in *Basic Writings*, (ed.) David Farrell Krell, London: Routledge, 1996.

Kamal, Muhammad, *From Essence to Being: The Philosophy of Mulla Sadra and Martin Heidegger*, London: ICAS Press, 2010.

Kamal, Muhammad, *Mulla Sadra's Transcendent Philosophy*, London: Ashgate, 2006.

Mabbot, J. D., "Is Plato's Republic Utilitarian?" in *Mind*, NSXL, 1937.

Marx, Karl, *Capital*, vol.1, Moscow: Progress Publisher, 1986.

Marx, Karl, *Economic and Philosophical Manuscripts of 1844*, Moscow: Foreign Language Publishing House, 1956.

Mulla Sadra, *al-Masha'ir*, translated by Parviz Morewedge, New York: SSIPS, 1992.

Nails, Debera, "The Early Middle Late Consensus: Deep? How Broad?" in *Plato's Critical Assessment*, vol.1, (ed.) Nicolas D. Smith, London: Routledge, 1998.

Nasr, Seyyed Hossein, *Islamic Studies*, Beirut: Librairie du Liban, 1967.

Pappas, Nicolas, *Plato and the Republic*, second edition, London: Routledge, 2003.

Patrick, G. T. W., *Heraclitus of Ephesus*, with an introduction and selected biography by Lewis A. Richard, Chicago: Argonant Inc., 1969.

Plato, "Apology", in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.



Heidegger, Martin, "The Question Concerning technology", in *Basic Writings*, (ed.) David Farrell Krell, London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin, *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralf Manheim, New Work: New York State University Press, 1987.

Heidegger, Martin, *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blackwell, 1997.

Heidegger, Martin, *Contributions to Philosophy (Enowning)*, translated by Perviz Emad and Kenneth Maly, Bloomington: Indiana University Press, 1999.

Heidegger, Martin, *Identity and Difference*, translated by Joan Stambaough, Chicago: Chicago University Press, 2002.

Heidegger, Martin, *Mindfulness*, translated by Parviz Emad and Thomas Kalary, London: Continuum, 2006.

Henn, Martin J., *Parmenides of Elea*, A verse translation with interpretative essays and commentary to the text, London: Praeger, 2003.

Hourani, Albert, *The Emergence of the Modern Middle East*, London: Palgrave Macmillan, 1981.

Kamal, Muhammad, "The Self and the Other in Sufi Thought", published in the Journal of *Religion East & West*, No. 6, October, 2006, Institute of World Religions, Berkeley, California.

Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Phaedrus”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Republic”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Statesman”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Symposium”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Theaetetus”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Timaeus”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Republic”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.



Plato, “Greater Hippias”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Laws”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Letter VII”, In Plato: Complete Works, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Letter XIII”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Meno”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Parmenides”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Phaedo”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson, Indianapolis/Cambridge: Hackett Publishing Company, 1997.
Plato, “Phaedo”, in *Plato: Complete Works*, (eds.) John M. Cooper and D. S. Hutchinson,

Plotinus, *The Six Enneads*, translated by Stephen MacKenna and B. S. Page, Chicago: William Benton publisher, 1952.

Popper, Karl, R., *The Open Society and its Enemies*, vol.1, London: Routledge and Kegan Paul, 1977.

Rosen, Stanly, *Plato's Republic: A Study*, New Haven and London: Yale University Press, 2005.

Russell, Bertrand, *History of Western Philosophy*, London: Routledge and Taylor Francis Group, 2002.

Sachs, David, "A Fallacy in Plato's Republic", in *Plato: Critical Assessment*, (ed.) Nicholas D. Smith, vol.3, London: Routledge, 1998.

St. Augustine, *City of God*, translated by Henry Bettenson with a new introduction by G. R. Evans, London: Penguin Books, 2003.

St. Augustine, *Confessions*, translated with an introduction by R. S. Pine-Coffin, London: Penguin Books, 1961.

Suhrawardi, Shahab al-Din, *Hikmat al-Ishraq*, translated by John Walbridge and Hossein Ziai, Porvo, Utah: Brigham Young University Press, 1999.

Taylor, A. E. , *Plato: The Man and His Work*, London: Methuen, 1960.

Walzer, Richard, *Greek into Arabic: Essays on Islamic Philosophy*, Oxford: Bruno Cassirer, 1962.

Zeller, Eduard , *Plato and the Old Academy*, translated by Sarah F. Alleyne and Alfred Goodwin, London: Longmans, Grees and Co., 1876.




# ئیندئیندکس